## پێرست

# پێشەکی

**حەمەکەریم عارف**

((١))

دکتۆر عەلی شەریعەتی هزرڤانێکی ئێرانی شیعە مەزەبی بەنێوبانگە، ناوی (عەلی محەمەد تەقی شەریعەتی)یە. لە ساڵی ١٩٣٣ لە گوندی مازینانی نزیکی شاری مەشهەد هاتووەتە دنیا. لە ساڵی ١٩٥٥دا کۆلیجی ئەدەبیاتی لە مەشهەد تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٥٩دا، بە زەماڵە بۆ تەواو کردنی خوێندن بۆ فەرەنسا نێردراوە، دکتۆرای یەکەمی لە مێژووی ئیسلام و هی دووەمی لە سوسیولۆجیای ئاینی لە زانستگەی سۆربۆن تەواو کردووە، ئەوسا بۆ ئێران گەڕاوەتەوەو لە زانستگەی خۆراسان و پاشان لە زانستگەی تاران مژولی دەرس گوتنەوە بووە. شەریعەتی پتر لە سەدو بیست دانراوی لە پاش بە جێماوە، کتێبەکانی بریتیین لەو وانەو کۆڕە زارەکیانەی کە چوار پێنج سەعاتیان دەخایاند، پاشان خوێندکارە دڵسۆزەکانی کۆیان دەکردنەوەو چاپیان دەکردن.. هەفتانە لە حوسەینیەی ئیرشاد، لە تاران دەرسێکی دەگوتەوە کە نزیکەی شەش هەزار کوڕو کیژی خوێندکارو دەرچووانی زانکۆ ئامادەی دەبوون. حوسەینیەی ئیرشاد لە ساڵی ١٩٦٩دا هاتە دامەزراندن، شەریعەتی پێنج لیژنەی بەمەبەستی سەرپەرشتی چالاکیە هەمە جۆرەکان، تیا دروست کرد کە بریتی بوو لە: لیژنەی مێژووی ئیسلام، لیژنەی شرۆڤەی قورئان، لیژنەی ئەدەبیات و هونەر، لیژنەی زمانی عەرەبی، لیژنەی راستکردنەوەی سەرچاوەکانی کەلەپوری شیعی، لیژنەی زمانی ئینگلیزی بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی جیهانیی ئیسلام.

هەڵبەتە شەریعەتی هەڵگری هزرێکی ئیسلامی خەباتکاریی کراوە بووە، بانگەوازی ئەو بانگەوازێکی پێشکەوتوخوازانەو شۆڕشگێڕانە بووەو دژی هەر جۆرە دۆگمایەك بوو، بۆیە هات لە رێگەی شێوازێکی روون و رەوان و مەفهومەوە دۆزەکانی ئیسلامی کرد بە دۆزێن رۆژانە. ئەمەش بەلای دەسەڵاتەوە کارێکی مەترسیدار بوو، بۆیە بە هەموو شێوەیەك کەوتنە تەنگ پێ هەڵچنین و گوشار خستنە سەرو راوەدوونانی... لە گەنجی دا پەیوەندی بە بزووتنەوەی مسەدەقەوە کردووەو لە بواری دەرس گوتنەوەو مامۆستایەتی دا کاری کردووەو دوو جار گیراوە، جارێك پێش چوونی بۆ فەرەنساو جارێکیش پاش گەڕانەوەی لە فەرەنسا، کاتێ لە ساڵی ١٩٦٩دا حوسەینیەی ئیرشادی بۆ پەروەردەی لاوان کردەوەو،

له ساڵی ١٩٧٣دا دایان خست خۆی و بابیان بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك گرت. ئەوجا رۆیی بۆ لەندەن و له ساڵی ١٩٧٧دا، بەر له شۆڕشی ئێران به دوو ساڵ، له تەمەنی چل و سێ ساڵی دا تیرۆر کراو، وا باوه که به دەستی دەزگای هەواڵگری شا (ساواك) کوژراوه.

((٢))

شەریعەتی وەکو هزرڤانێکی شۆڕشگێڕی بواری پسپۆڕیی خۆی دژی هەر دوگمایەك بوو، بۆیه له میانەی خەبات و تێکۆشانی هزری خۆیەوه دژی کۆمەڵێك باوەڕانی ئاینی ستۆك و گەندەڵ بووەو پێی وابووه دەبنه مایەی ئەوەی کۆمەڵگه له حاڵی ملکەچی و سەر شۆڕیو بێ باشاری دا قەتیس بمێنێ و دژمن به هەزارو یەك ناوەوه به رۆژی نیوەڕۆو به عالەمی ئاشکرا سەروەت و سامانی بدزێ و تالان بکات، و بیکات به بازاڕی بەرهەم و هزری خۆی، بۆیه دکتۆر شەریعەتی کاری بۆ ئەوه کردووه که ئینسان له هیچ هەلومەرجێکا دەستبەرداری ئینسانیەتی خۆی نەبێت و به کەمتر له شەریکایەتی، بەشداری هیچ پرۆسەو هاوکێشەیەکی دیکه نەکات، چونکه به کەمتر له شەریکایەتی، به کەمتر له هاوتایی، شتێك دروست نابێ نێوی پەیوەندی مرۆڤانی بێ، هاوکێشەکه دەگۆڕێ، پەیوەندییەکه شەقڵی مرۆڤانی خۆی له دەست دەدات، دەبێ به پەیوەندی ئاغاو خولام، بت و بت پەرست، شێخ و مورید، شوان و مێگەل، چەوساوەو چەوسێنەر... جا نه بت به ئاسانیو خوایشتی خۆی دەستبەرداری پایەی بتایەتی دەبێت و نه بت پەرستیش دەبێ به خودانی هزرو ئاوەزێکی تەحلیلی که مرۆڤانی خۆی بکرێتەوەو سازش لەسەر زەرورەتی شەریکایەتی و هاوتایی خۆی نەکات.. هەر لەم پێودانگەوەیه که دکتۆر شەریعەتی شۆڕشی هزری بەسەرچاوەی هەموو شۆڕشەکانی دی دەزانێ، چونکه که کۆمەڵگه کەوته سەر راسته رێی بیرکردنەوه ئیدی به ئاسانی دەستەمۆ ناکرێ و له خشته نابرێتو ئینسانیەتی لێ زەوت ناکرێ.. یەکێك له تایبەتمەندییەکانی شەریعەتی که له میانەی نووسراوو دانراوه هەمه جۆرەکانییەوه دەبینرێ ئەوەیه که سوودێکی زۆری له هزرو بیری مامۆستا ئەوروپاییەکانی وەرگرتووه، بەلام له هەمان کاتدا زۆر بابەتیانەش رەخنەی له بیروبۆچوونیانی گرتووەو تاوتوێی کردووەو له سەرەندو بێژنگی داوەو سەر بێژنگی وەرگرتووەو بن بێژنگی فڕێ داوەو شتێکی ناوازەی بەرهەم هێناوەو نەفەسی خۆی پێ بەخشیوه، هەڵبەته ئەمه خەسڵەتی هەر هەڵکەوتوو و بلیمەتێکه که تەنیا له سنووری دڵبەندیدا ناوەستن و دەیبەزێنن و دەچنه قۆناغی بژارو تەتەڵەوەو توێکڵ و دان لێکدی جیا دەکەنەوه، بلیمەتان پێشوازی له هزرو بیروبۆچوونان دەکەن، سوودی لێ وەردەگرن، شی دەکەنەوه، بەراوردی دەکەن، تاوتوێی دەکەن، لێوەی هەڵدەهێنجنو ئەنجامگیری خۆیان دەکەن و هەرگیز قەبوڵ ناکەن ببن به مشەخۆری بیری خەڵکی، چونکه

بیری وەرگیراو ئەگەر نەبێتە مایەی دەوڵەمەند کردن و چالاکاندنی بیری خۆت، لە مێشکی تۆدا دەمێنێتەوەو دووچاری ئینتەلای هزریت دەکات و بەرەبەرە ستۆك دەبێت وەکو دەرهاویشتەیەکی ژەهراوی دێتە دەرێ. هزر لەلای شەریعەتی پێویستی بە ئەقڵیەتی هۆشن، و دوو چاوی تیژو بینایە کە بشێت و بتوانێت راستی و حەقیقەکان بدینێ و هەنگاوی یەکەمیش بۆ وەدەست هێنانی هزر ئەوەیە کە بەڕاستی و بە وردی شارەزای مێژوو و کەلتووری خودی بێ...

((٣))

هەڵبەتە شەریعەتی داوا دەکات ئەو ئاینەی خەڵکی باوەریان پێیەتی لە سەلبیاتەکانی بتەکێنرێو چالاكو ئەکتیف بکرێ، بگۆڕدرێت بۆ رەگەزێکی چالاكو رۆحئەنگێز، نەك بە ئامرازی گەوجاندنو خەساندنو کەراندنو دەسەلاَتداران بە قزانجی خۆیان بەکاری بێنن.قورئان کتێبێکە بەناوی خوا دەست پێدەکاتو بەناوی خەڵکی کۆتایی دێت، کتێبێکی ئاسمانیە– زیاتر جەخت لسەر تەبیعەتو ژیانو هۆشمەندیو سەرفرازیوهێزو پێشکەوتنو پەرەسەندنو پوختە بوونو جیهادو تێکۆشان دەکات،و ناوی زۆربەی سوورەتەکانی لە دۆزە ئینسانیەکانو مادیەکانەوە وەرگیراوە...وفەلسەفەی میعادو پەسلاَنوزندووبوونەوەو ئەو دنیا، بریتی نیە لە رەفزکردن و تەرك کردنی ژیان و گوزەران و ئەم دنیا، هەرگیز بەهەشتی ئەو دنیا لە ئیسلامی راستیدا، فشە هیوایەك نییە بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئازارو ئەشکەنجەی دۆزەخی ئەم دنیا، واتە دەبێ هەوڵبدرێ ژیان بە قازانجی تیرەی بەشەر بکرێ بە بەهەشتو بە ئومێدی بەهەشتی ئەو دنیا بە دۆزەخی ئەم دنیا قاییل نەبین، خۆیایە پەیامو ئامانجی ئاینی کوفر، پاکانەکردنە بۆ ئەو وەزع و حاڵەی هەیە، ئەویش لە رێگەی کەڕاندنی خەڵکەوە بەمەی کە ئەم وەزعە نالەبارو پڕ شەرمەزاریو حەیابەرەیەی کە هەیە، چارەنووسەو خواست و ویستی خودایە. لە کاتێکا زانایانی مەیدانی کۆمەڵناسی، ئەمڕۆکە لە خودی موسوڵمانان زیاتر باوەڕیان بەوەیە کە ئیسلام ئاینێکی کۆمەلاَیەتی واقیعییەو باوەڕی بە تەبیعەتو ئابووری و کۆمەڵگە هەیەو بگرە ئاینێکی سیاسیە...و رێبەرایەتی خەڵك و رەعەمەل هێنانی خاك درەنگ یان زوو دەکەوێتە دەستی هەژاران و چەوساوەو دادپەروەران کە لە ریزی پێغەمبەراندا دادەنرێن، بۆیە شەریعەتی زۆر بە زەقی دکتاتۆریەت دەبوغزێنێو پێی وایە دکتاتۆر هەر هەموو کەسایەتییەکان لە بۆتەی یەك کەسایەتی دا قالْ دەکاتەوەو هەنگێ کۆمەڵگە دەبێت بە ملێونان کەسایەتی مەسڵەحەتچی و لە قاڵبی یەك کەسایەتی راستەقینەدا، کە کەسایەتی خودی دکتاتۆرە دەتوێنەوە، ئەوەش سەرەتای کۆتایی هەر کۆمەڵگەیەکە... بۆیە شەریعەتی شۆڕشی هزری رەسەن بە سەرچاوەی هەر هەموو شۆڕشەکانی دیکە دەزانێتو

جۆری بیرکردنەوەی هەر کەسێك رەفتارو باوەڕو مەیل و ئارەزووەکانی دیاری دەکات و هەر نەتەوەیەك بە یەك جۆر بیر بکاتەوە، نەتەوەیەکی مردووە... و بیرکردنەوەی یەکهاوی هاوتای بیرنەکردنەوەیە، کە هەم زەمینە بۆ داگیرکاری دەرەکی، و هەم کەراندنی ناوخۆ خۆش دەکات. کەواتە ئەرکی راستەقینەی هزرڤان ئەوەیە ئەم بیروبۆچوونە پاشڤەرۆو مردووانە ریشەکێش بکات و بیرو بۆچوونی زیندوو پەیوەست بە ژیانەوە ریشاژۆ بکات و دۆزەکانی ئیسلام بکات بە دۆزی رۆژانەو کۆمەڵگە لە گومرایی دەرباز بکات و بیگێڕێتەوە سەر راستە رێگایان...

((٤))

خێزەرەی لاوان، یەك نەسلی تەواو لە لاوان لە دەوری حوسەینیەی ئیرشاد نەدەپساوە، شەریعەتی هەر هەموو کۆمەڵگەی کردبوو بە زانستگەو دەرس و وانەی خۆی تیا دەگوتەوە، توانی بە شێوازێکی روون و رەوان و مەفهوم، دۆزەکانی ئیسلام بکات بە دۆزێن ژیانی رۆژانە.. بە هەر حاڵ لە کۆمەڵگەیەکی ئاوس و بارگاوی بە توندی و توندڕەوی لە ئیسلام، لە مێژووی شیعەگەرایی دەدواو رووبەرووی سیانەی دەسەڵات و دارایی و ئایینداری رواڵەتی دەوەستا، ئا هەموویان (شاو حەوزەی قوم) لێی هاتنە دەست، حەپس کرا، ئازار درا، دەربەدەر کرا، هەزارو یەك بوختانیان بۆ هەڵبەست "وەهابییە، شیوعییە، توندڕەوە"... وەختێ کە چووە حەجی ماڵی خوا، رێیان نەدا لە کۆنگرەی ئیسلامی دا وتەکەی بخوێنێتەوە چونکە "شیعەیەکی توندڕەوە". ئا بەو جۆرە شەریعەتی بە تاقی تەنیا بوو بە سوپایەك و بەگژ غەربزەدەگی و دۆگماو وەعزادەرانی سوڵتانان و دەسەڵاتی فیرعەونانا دەچوو... هەنگێ دەسەڵات ناچار لە ساڵی ١٩٧٣دا حوسەینیەی ئیرشادی داخست و پشتی ساڵ و نیوێك زیندانی، دوای ئەوەی بەرپرسانی جەزایر، کە چاکە و هەڵوێستی مەردانەی ئەویان لە کاتی شۆڕشی جەزایردا دژ بە فەرەنسا لە بەرچاو بوو،بۆی تێکەوتن ئەوجا ئازاد بوو. ئیدی لە ساڵی ١٩٧٧دا رووی کردە لەندەن و دوای گەیشتنی بە مانگێك جەنازەکەی دۆزرایەوەو رژێم رایگەیاند کە بە سەکتەی دڵ مردووە. ئیدی رێگە نەدرا جەنازەکەی لە ئێران بنێژرێ و برا بۆ دیمەشق و لە حەرەمی زەینەبی نێژرا... لە یەکێك لە نامەکانیا گوتویەتی: "چەند ناخۆشە مرۆڤ لە ماڵی خۆیدا بۆ نموونە بە سك چوون بمرێ، من ئاواتە خوازم کە شەهیدبم و لە پاڵ گۆڕی ئەو خانمە قارەمانەدا بنێژرێم"و ئاواتەکەی هاتەدی.

((٥))

شەریعەتی پیاوێکی یەجگار ساغ و مەبدەئی بوو، لە هەموو شتێك یاخی بوو تەنیا لە مەبدەئیەت نەبێ، هەڵبەتە دەبێ لەمەشدا کاریگەریی خەڵکانێکی بەسەرەوە بووبێ، کە کەسایەتی هەرە دیاری ئەم مەیدانە، پیاوێك بوو لە قوڵایی مێژووەوە هێنابووی و کردی بە

هاوڕێی گیانی بە گیانی سەدەی بیستەمی ژیانی خۆی، ئەویش ئەبو زەڕی غیفاری بوو، یەکەمین کەسایەتی بوو کە شەریعەتی لە ژیانی فیکری خۆیدا پێی ئاشنا بوو، و ئیدی لە زەین و ویژدانیدا هەر مایەوە، تا لە تاراوگەدا لەگەڵیا مرد.

شەریعەتی بە هاندان و پشت گەرمی بابی یەکەم کاری ئەدەبی خۆی لە ساڵی ١٩٥٥دا ئەنجامدا کە بریتی بوو لە وەرگێڕانی کتێبی (ئەبو زەڕ) لە نووسینی جوده السحار، کە ئەم کتێبە بڵاو بووەوە روحی وەرگێڕی گەیاندە جەماوەری خەڵکی و یەکەمین خۆشەویستی و دڵبەندی خۆی راگەیاند، لە بانیژەی ئەبو زەرەوە دەیروانیە ئیسلام و مێژوو و بە درێژایی ژیانی ئەم بانیژەیەی بەرنەداوگۆڕی. بە هەر حاڵ ئەبو زەڕی کردبوو بەسەر مەشقی خۆی و بە هەمان لۆژیکی ئەو بیری دەکردەوەو ئەوی بە پارچەیەك لە باوەڕو غەزەب و جیهاد دەزانی... و بە شێوازێکی زۆر ناسك و دڵگیر و سەرنجڕاکێش، گوزارشتی لە هزرو بیرو خولیاو کەڵکەڵەو ئارەزووەکانی دەکرد. بابایەك بوو پڕاو پڕ لە شیعر، شاعیرێك بوو سەرریژ لە هونەر، هونەرمەندێك بوو تەژی لە ئەدەب، ئەدیبێك بوو لێوان لێو لە ئەفسوون و جادوو، بە شێوازە سادەکەی دڵانی فەتح دەکردو ناچاری دەکردیت بە خاکەساری گوێی لیٚ بگریت.

هەڵبەتە شەریعەتی لە دەروازەی مێژوو و زانستی کۆمەڵناسییەوە بۆ ئیسلام و تیٚ گەیشتن لە ئیسلام دەچوو. دکتۆر عەبدولکەریمی سروش دەڵێت: "خوا لیٚ خۆش بوو شەریعەتی بە پلەی یەکەم مێژوونووس بوو، مێژوو دەروازەی سەرەکیی بوو بۆ ئیسلام، هەڵبەتە زێدەباری پەنجەرەی سوسیولوجیاش کە لێیەوە وێنەکانی ئەبو زەڕی لە زەین دا چڕ بووەوە".

هەڵبەتە دەکرێت شێوازی شەریعەتی لەم خاڵانەدا چڕ بکەینەوە:

– لەبەر ئەوەی پسپۆڕی بواری سوسیولۆجیای ئاینی بوو، هەر دەبوایە بایەخی زیاتر بە بیرۆکەی نەخت و پوخت و چڕ بداتو بە زمانێکی سادەی رەوانی نزیك لە شیعر، بنووسێت، وەکو لە هەموو بەرهەمەکانیا ئەمەی کردووە.

– لە ریٚگەی بەکارهێنانی دروست و وردو پەسندی حیکایەت و ئەفسانەو بیٚوگرافی گەلانەوە، خەڵکی بە کەلەپورەوە دەبەستەوە.

– شارەزاییەکی فرەی لە بیرو هزرو فەلسەفە هاوچەرخەکاندا هەبوو و دەگەڵ تێزە ئیسلامیەکاندا بەراوردی دەکرد.

– هێندە لە ژێر کاریگەریی ئەبو زەڕدا بوو، کە هەرگیز بە نیمچە چارەسەرانی نیوەچڵ و سەرڤە سەرڤە قاییل نەدەبوو، وەکو ئەبو زەر خودانی میتۆدێکی شۆڕشگێڕانە بوو.. تا سەر مۆخ باوەڕی بەوە بوو کە "ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بأنفسهم".

هەڵبەتە دکتۆر شەریعەتی وەکو پسپۆڕێکی بواری سوسیولوجیا، نەیتوانیوە لە هیچ نووسینێکیدا ئەم لایە فەرامۆش بکات، راستەوخۆ یان نا راستەوخۆ لە بەرهەمەکانیا بە تراوی یان خەستی رەنگی داوەتەوە.. ئیدی ئەمە شێوازی شەریعەتیە، شێوازی گوتیاری هەمە شت زانە، کە لەم شێوازەدا کەسایەتی و شێوازی نووسەر زاڵە...

*　　*　　*

خوێنەری هێژا، ئەم کتێبە (ئەبو زەڕی غیفاری) یەکەم بەرهەمی شەریعەتییە، بەندە لە چاپی چواردەمینییەوە (١٣٨٨) کردوومە بە کوردی، هیوادارم بەشدارییەکی بچووکم لە ناساندنی جیهانی هزرو هزرینی دینیو دنیایی ئەم هزرڤانە رۆژهەڵاتییە، بە خوێنەرانی کوردی زمان کردبێ، جا شەریعەتی وەکو پسپۆڕێکی بواری سوسیولوجیای ئاینی، لەم بەرهەمەشیدا دەسبەرداری شیعەگەرێتی خۆی و لایەنی سوسیولوجی ئاین نەبووەو بە زەقی رەنگی داوەتەوە، ئەمەش زادەی شێوازە تایبەتیەکەی خۆیەتی، کە شێوازی گوتیاری هەمووشت زانە، لەم شێوازەدا کەسایەتی و سەبك و خودی نووسەری زاڵ دەبێت، بەڵام گومان لە راستگۆیی و دڵسۆزی و بوێری ئەم هزرڤانە ناکرێت، ئومێدەوارم خوێنەرانی کوردی زمان بە هەمان راستگۆیی و بوێری شەهید شەریعەتییەوە مامەڵە لە تەك ئەم بەرهەمەدا بکەن و مەحەك و پێوانەی رەفزو قبوڵیان راستگۆیی و بوێری بێ و بەس.

__تێبینی__:

*١- دەقی ئایەتەکانم، لە قورئانی پیرۆز، وەرگێردراوی مامۆستای نەمرو هەژی هەژاری موکریانی، گۆڕەکەی پڕ لە نوور بێ، وەرگرتووە.*

*٢- بۆ نووسینی ئەم پێشەکییە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە.*

*٣- حسن العلوی، عمر والتشیع، پنائیە القگیعە والمشارکە. دار الزوراو لندن، ٢٠٠٧*

*٤- وتاری: اگلالە علی افکار علی شریعتی، علی حسین فرج الفکیکی کە برای نووسەرو وەرگێڕ کاکە بەرزانی مەلا تەها بۆی پەیدا کردم، زۆری سوپاس دەکەم.*

**سەرفراز بن**
**حەمەکەریم عارف**
**سلێمانی**

**٢٠٠٩/٩/١٥**

## * کۆ بەرهەمی
## برای شەهید دکتۆر عەلی شەریعەتی

مەبەست لە بڵاوکردەنەوەی ئەم کۆ بەرهەمە –بە پشتیوانی خوداو پێ داگرتنی مەردانەی (تاقمێکی کەم)– کۆکردنەوەو ڕێکخستن و چاپکردنی تێکڕای نووسین و گوتارە بڵاوکراوەو بڵاونەکراوەکانی برای شەهید دکتۆر شەریعەتی بەمیتۆدێکی ورد، و بەرەچاوکردنی هەموو ئەو ڕاستکردنەوەو پێداچوونەوانەی کە خۆی لە بەرهەمەکانیا کردوویەتی و بە خۆپاراستن لە هەر جۆرە دەستوەردانێك لە بەرهەمەکانی، لەبەر ئەمە تێکڕای ئەو نووسین و گوتارانەی کە لە ژێر چاودێری و بەسەرپەرشتی ئەو برایە بە چاپ نەگەییون، بۆ ڕێگرتن لە هەر بەدحاڵی بوونێکی بێ مەبەست و بێ غەرەزانەو دەست نیشان کردنی غەرەزدارییەکان وهەر هەرایەکی (دەستووری) جارێکی تر، دەگەڵ ئەسڵی نووسینەکان یان کاسێتەکاندا، بە وردی بەراورد دەکرێن.
هەوڵدەدرێ کە هەموو ئەو نووسینانەی دەربارەی یەك مەبەستن –کە ئێستا لە نامیلکەی بچووك و ناوەنجیدا پەراگەندەن– لە یەك یان چەند بەرگێك دا چاپ و بڵاوبکرێنەوە. ئەم کارە لە ڕاستیدا بریتییە لە جێبەجێکردنی خواستی برای شەهیدمان (بڕوانە وەسێتنامەکەی لە کۆ بەرهەمەکانیا، زنجیرە ١).
لە پاشکۆی هەر یەکێك لە بەرگەکانی ئەم زنجیرە کۆ بەرهەمەدا جگە لە پێرستی ئەعلامو.... پێرستێکی تا ڕادەیەك تێرو تەسەلیش دەربارەی چەمك و زاراوەو گوزارشت و دەستەواژان دەخرێتە بەردەست. هەوڵ و کۆششی برای شەهیدمان لە بەکارهێنانی چەمك و گوزارشتەکانی کەلتورو مەعریفەی ئیسلامیدا یەکێکە لە (میراتە چاکەکان)ی ئەو، و بایەخ دان بەم بەشە لە بنەڕەتدا بە مەبەستی سوود وەرگرتنی زیاترو باشترە لەم کەلەپوورو میراتەو فێر بوون و درێژەپێدانی ئەم هەوڵەیە.
جێی خۆیەتی ئەوە بگوترێ کە بەشی پاشکۆ و بەندەکان لەلایەن وەشانکاری ئەم کۆ بەرهەمەوە ئامادە دەکرێت و لەبەر ئەمە ( نووسینگە) لە هەموو شەپڕێوی‌وعەیبێکیان بەرپرسە. بە هەر حاڵ ئومێدەوارین کە شاگردان و یارانی ئەو برایە، لەم کۆ بەرهەمەدا ڕەسەنترین و پڕ متمانەترین لایەنی بەرهەمەکانی بدۆزنەوەو لەو ڕێگەیەوە بتوانن بەرهەمەکانی لە شەڕی شێواندن بپارێزن. بەو هیوایە.
خوا ڕێنوێنی ڕێگەی ڕاستە.

نووسینگەی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی کۆ بەرهەمی
برای شەهید دکتۆر عەلی شەریعەتی
لە ئەوروپا.

## وتەی وەشانکار

*"* یەکێك لە سیفەتە باشەکانی کوڕەکەی من مکوڕی بوو لە سەر بیروباوەڕی خۆی. من وەکو شایەدێ: لە پۆلی پێنجەمی خانەی مامۆستایان بوو کە کتێبی ئەبوزەڕی پاچڤە کرد... لەو زەمانەوە تا ئەو کاتەی کە لە دنیا دەرچوو، ڕێگەی ئەو ڕێگەی ئەبو زەڕ بوو."*

**مامۆستا شەریعەتی**

ئەم کتێبە، لە دوو دەفتەراندا، سێ نووسین و گوتاری لە خۆ گرتووە، **دەفتەری یەکەم**: (ئەبو زەڕی غیفاری)یە کە یەکەمجار لە ساڵی ١٣٣٤دا (١٩٥١) بڵاوبووەتەوە لەوە بە دواوە بەردەوام چاپ کراوەو چاپکراوەتەوە.. ئەم کتێبە لەلایەن برای شەهیدمانەوە پێداچوونەوەی بۆ کراوە ئەم چاپەی ئێستا هەموو ئەو پێداچوونەوەو راستکردنەوانەی لەخۆ گرتووە.

**دەفتەری دووەم**: لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەم لە راستیا پێشەکییەکە بۆ شانۆنامەی (جارێکی دی ئەبو زەڕ) کە لە مورداد مانگی ١٣٥١ (١٩٧٢ ) لە حوسەینیەی ئیرشاد نمایش کرا، بەشی دووەمی بریتییە لە وتارێك کە بەر لە دەست پێکردنی نمایشەکە لە حوسەینیەی ناوبراو، خوێنراوەتەوە، قەرار بوو برای شەهیدمان چەند قسەیەك بکاتو شانۆنامەکە دەست پێ بکات، لێ خەبەری گەیشتێ کە لەگینە (سانسۆرچیان) بۆمبایەکیان لە ژێر شانۆکەدا دانابێ تا لە کاتی نمایشەکە، ئەوانەی سەر شانۆکە ئاسیو بدینن، لەبەر ئەمە بڕیاریدا درێژە بە قسەکانی بدات تا ئەگەر شتێك بقەومێ، خۆی بەر بکەوێ نەك ئەوانی دی. بۆیە ئەم وتەیە شەقڵ و مۆرکی ئەو فیداکارییەشی پێوەیە.

وەکو لە کتێبەکانی پێشووشدا گوتوومانە، لە دەرهێنانو گواستنەوەی بابەتی سەر کاسێتەکاندا هەوڵ دەدەین کە نەك هەر هەموو بابەت و نێوەرۆکەکان، بەڵکو لە سنووری تواناداا جۆری وتنی بابەتەکان و رستە پرسیار ئامێزەکانیش -کە لە تۆنی قسەکانەوە هەڵدەهێنجرێ- بەهۆی خاڵ بەندییەوە نیشان بدەین و بەمجۆرە ڕێگە لەو بەدحاڵی بوونانە بگرین کە فەرموودەی حەکیم نینو بنج و بناوانی غەیرەز حەسادەت و غەرزداری و گوێڕایەڵی دەستوریان هەیە،و زیاتر بەرەنجام و زادەی کەم حەوسەڵەیی و لەگینە کەچفامی ئەو ناوەڕۆك و بابەتانەبن کە بە وردی لە کاسێتەکانەوە هەڵنەهێنجراون، ئەم کارە بووەتە بایسی ئەوەی کە تەنانەت گەلێك لەو رستانەش کە دووبارە بوونەتەوە (تا ئەو شوێنەی کە ئاسیوی فرەیان بە بونیادی رستەکانو دەستەواژەکان نەداوە) وەك خۆی دابنەینەوە. لە سنوری تواناداا خۆمان لە دەستوەردانو دەستکاری دەق دوورگرتووەو ئەگەر لە حاڵێکا بۆ تەواو کردنی رستەیەك پێوست بەزیاد کردنی وشەیەك بوو بێ، ئەو وشەیەمان لە نێو ئەم چەشنە کەوانەیە [ ] داناوە، بەڵام شوێنی ئەو وشانەمان کە بەر گوێ نەکەوتوون و نەهاتوونەتە بیستن، بە مەزەندە پڕنەکردووەتەوە، بەڵکو لە پەراوێزدا روونمان کردووەتەوە.

هـەموو ئـەو روونكردنەوانانـەی كـە لـە دەھمـەنی بەرپەڕەكانـدا ھـاتوون و بـە نیشـانەی یـەك ئەسـتێرە(*) و دوو ئەسـتێرە(**)…. دیـاری كـراون، لـە بـنج و بناوانـەوە ھـی بـرای شـەھیدمان خۆیـەتی. ئـەو روونكردنـەوەو سەرچـاوانەی كـە لـە پـەراوێزی لاپەرەكانـدا ئێمـە دامـان نـاون بـە پیتی(ن) یان (نووسینگە) دەست نیشان كراون. لە بەشی پاشكۆو پاشبەندەكاندا، ھەندێ وتەو روونكردنەوەی دی زیاد كراون و بە مەبەستی روونكردنەوەی ھەندێ خاڵی دەقەكەیە. ژمارەكانی ١و ٢ و ٣…ھتـد كـە لـە دەقەكـەدا ھەیـە(لـەپاڵ وشـەكانا یـان لـە كـەناری لاپـەرەكان) سـەر بـەو روونكردنەوانەیە.. ئامادەكارو رێكخەری ئەم وتـەو روونكردانەوانە –جگە لـەو شوێنانەی كە بـە ئاشكرا دیارە– وەشانكارە.

*　　　*　　　*

رۆژی بیست و شەشەمی ئوردی بەھەشتی ساڵی بوری برایەكـەمان سـەفەری خـۆی كـە مـوجیزەی خـوا بـوو دەسـت پێكـرد، ئێمـە خۆشـحاڵین كـە ھاوكـات دەگـەڵ سـاڵوەگەڕی ئـەو رۆژەو بـەیادی ئـەوەوە نووسـین و گوتارەكـانی دەربـارەی ئـەبو زەڕی ئـازیزی، خـۆی گوتـەنی(( پێشـكەش بـە رۆشنبیران و ئازادانی ئێران)) دەكەین.

***رەحمەت و بەرەكەتی خوای لی بێ وخوا رێنوێنی رێگەی راستە.***

***ئوردی بەھەشت ١٣٥٧ (١٩٧٨)***

***نووسینگەی ئامادە كردن رێكخستن و بڵاوكردنەوەی كۆبەرھەمی***

***برای شەھید دكتۆری عەلی شەریعەتی.***

## دەفتەری یەکەم

## ئەبو زەڕی غیفاری
## خوا پەرستی سوسیالیست
نووسینی عبدالحمید جوده السحار
وەرگێڕان و نووسینی : دکتۆر عەلی شەریعەتی

## وتەیەك*(بۆ چاپی سێیەم)

ژیانی ئەبو زەڕ لە مێژووی ئیسلامدا تاریکە، بە تایبەتی دەربارەی سەرەتاکانی ژیانی، جگە لە هەندێ سەربهوردی ئەفسانە ئامێز، چ شتێکی دی لە دەستدا نییە. پاش ئەوەی لە تەڤگەرو بزوتنەوەی ئیسلامیدا پایەو شکۆیەك پەیدا دەکات، ئەگەرچی مێژوو بایەخێکی فرەی دەداتێ، بەلآم ئەوەندەی باسی گەورەیی دەکات، ئەوەندە گوێ بە پاراستن و باسی وردە کارییەکانی ژیانی نادات، بۆیە جیاوازیەکی فرە لەو سەربهودانەی کە ئەمڕۆکە دەربارەی رووداوەکانی ژیانی ئەبو زەڕ لەبەر دەستماندان هەیە. کە دەست نیشان کردنی دروستیو نادروستی هەر یەکێك لەو سەربهوردانە بۆ مێژوونووس زەحمەتو هەندێ جار مەحاڵ دێتە بەرچاو. دەقی ئەم کتێبە، لەلایەن (عبدالحمید جودە السحار)، نووسەری هاوچەرخی میسریەوە نووسراوە، بەلآم من لە وەرگێڕانیا لە ئەسڵی دەقەکە دەرچووم، لەو رووەوە کە گۆڕانکاریانم لە دیمەنەکاندا کردووەو هەروەها کۆمەڵێك گێرانەوەی مێژوویی دیکەم لە سەرچاوەێن جیاوازەوە کۆکردوەتەوە، ئەم کتێبە جیاوازییەکی هەندێ فرەی دەگەڵ نووسینەکەی جودە السحاردا پەیدا کردووە کە لە ڕادەیەکدایە پێویستە بە (وەرگێڕانو نووسین) بێتە ژماردن.

**هەوڵو تەقەلای من ئەمە بووە کە مێژوو لە هەر جێیەك باسێکی ئەبو زەڕی کردبێ، لەم کتێبەدا باسی بکەمو ئەمەش بووەتە بایسی ئەوە کە لە چەند شوێنێکدا سەربورو گێڕانەوەی هەڤدژ بەرچاو بکەوێو ئەمە کەموکورتیەکە کە دەتوانم خۆم دڵنیا بکەم لە نووسینی بیوگرافی قارەمانێکدا کە مێژوو بە روونی باسی ناکات، دێتە بەخشینو چاوپۆشی لێدەکرێ، بە تایبەتی کە نووسینی ئەم کتێبە بە شێوازی رۆمانەو ئەگەر توێژەری مێژوو ئەوە بە قابیلی چاوپۆشی نەژمێرێ، خوێنەرانی رۆمان دەتوانن چاوپۆشی لێبکەن.**

ئەو پێشوازیە زۆرەی کە لە چاپی یەکەمی ئەم کتێبە کرا، بۆ من بووە مایەی ئومێدەوارییەکی زۆری ئەوتۆ کە بتوانم لە ئایندەشدا ئەو هەوڵو کۆششانەی کە لە رابردوودا لە رووی نائومێدیو بە گوێرەی ئەرکی ئەخلاقیو مەسئولیەتی فیکریو کۆمەلآیەتی ئەنجامم دەدا بەپشتیوانی ئەو گروپە هەژییەوە کە لەم رۆژگارە تاریکەدا، روونو رۆشنو سەربەخۆ بیردەکەنەوەو لە نێو ئەم تۆفانو لافاوە رەشو هۆڤیەدا هێشتا باسی مەشخەڵی لەرزۆکی ئینسانیەتو ئازادی دەکەن، درێژە پێ بدەم. چەند ساڵێك لەمەپێش چاپی یەکەمی ئەم کتێبە لەلایەن (بنکەی بلآوکردنەوەی حەقیقەتە ئیسلامییەکان)وە بلآوکرایەوەو چونکە زوو لە بازاڕا نەما، دەستەیەك لە یارانی نەناسو گەورە ئەنێشی تاران، چوونە ژێرباری دابین کردنی پارەی چاپی دووەمیو ئەمێستا کە سێیەمین چاپی بلآودەبێتەوە، هێڤیدارم بتوانم چیرۆکی پڕجۆشو خرۆشو سەیری یاسر، سومەیەو عەممارو بابو داكو کوڕێك کە لە ڕای ئارمانجی مقەدەسو پیرۆزی بەشەری خۆدا لە ژێر ئەزابو ئەشکەنجەو لە مەیدانی خەباتو نەبەردا گیانیان سپارد، بەم زووانە بە رۆشنبیرانو ئازادانی ئێرانی پێشکەش بکەم.

# پێشەکی چاپی دووەم

هەمیشە ترسی ئەوەم لە دڵە کە لەم دەرفەتە کورت و ئازیزو خۆشەویستەی ژیاندا، دەمێك بکەومە ستایشی کەسانێك کە کەمێك دوودڵن لە پەسندانی (شکۆداری)، (شۆڕش)و (هـزرین و رامان) بەسەر (شادی)، (ئارامی)و (لەزەت)دا.
ئاواتم بووە هیچ کاتێ ئەو ڤیزوبێزەی کە بەدیتنی هەندێ کەلەشان کە ئارامی و لەزەتی ئەو غەزوبەزە زۆرو نەرمەی لە ژێر پێستی عەرەق کردوو لینجیاندا کۆیان کردووەتەوە، و ئەو پێڵوە قورس و تەمەڵانەی کە لە شەرما هەوڵ دەدەن چاوانی ئاوێتە بە عەیش و نۆش و لەزەتیان لە چاوان وەشێرن، سەرو دڵم دەگرێ، لە خۆدا هەست پێنەکەم.
یارو هەواداری هونەرمەندانێك بووم کە لە جیاتی کەندەکاری و کاشیکاری وردوناسك و ئارایشێن ناسك و ناسککارانە، ویقاری کۆسارانی سەرسەخت و تورەیی تۆفانانی کێوی و هەیبەتی ئاسمان گیرومکوڕی زستان و پانایی دەشتانی زبرو ناهەمواریان کردووە بەسەرچاوەی هونەری خۆ.
هەمیشە لەو شیعرەی کە لە هەڵۆی بەرزە فڕی کۆساران و گوڵانی کێوی زبری بیابانی دوورەوە سەرڕۆو ئیلهامی وەرگرتووە، زیاتر لەزەتم وەرگرتووە و هەستی هونەریم خرۆشاوە تا لە شیعرێك کە ستایشی کەنارییەکی خۆش خەت و خاڵ و، رەنگینی ئاواز خوێنی ناو قەفەز یان گوڵێکی بەناز پەروەردەی ناو گوڵخانەیە بکات.
بەڵێ: شێعرێك کە تانۆپۆیەکەی بە ئەشکەنجەو شانازی شاعیرێکی بەرزەفڕی بێباکی پای دیوارانی بەرزی زیندان و بە بەرچاوی دڕندانەی جەلادانەوە چنرابێ، جوانی و رەونەق و شەرەف و شکۆیەکی هەیە کە ئەو شیعرانەی لە پای مەقەڵی وافورو لەپشت مێزی بادە فرۆشیوە لە دایك دەبن هەمیشە لێی بێ بەشن. من هەمیشە کە تاوانەکانی نازیسمم بیردەکەونەوە موچوڕکم پێدا دێ و رادەجفرم، بەڵام کە دەبینم ئەشرافی شەهوەت بازی پۆخڵی دەوەرانی پاشایەتی و سەڵتەنەتی ویلهم لە ژێر پێی قورس و زبری سوپای هیتلەریدا پان و پلیش بووەتەوە، ناتوانم لە دڵی خۆدا هەست بە ستایش وشانازی نەکەم.
میوە خۆش وگەوارا و بۆندارەکانی مێژوو، ئەو مرۆڤانەن کە سەعادەت وشادیان لە پێناوی بەرز بوونەوە بۆ لوتکەی شکۆو مەزنایەتی، تور داوەتە قولایی دۆڵەوە، ئەو چێژانەی حەزیان لە تاڵییە... ئەو دڵانەی کە بە رەنج کامەران دەبن... ئەو چارەو سیمایانەی کە لە چرچ و لۆچی درشتی مکوڕی، سافی و ناسکی سڕیونەتەوە، ئەو پێیە مەردانەیەی کە حەزیان لێیە بەرووتی بەنێو بەردەڵانی سوتێنەردا رابکەن تا لەسەر فەرشی نەرم بڕەقسن... ئەو پێغەمبەرەی کە دەڵێت: "هەر ئاینێك رەهبانیەتی خۆی هەیەو رەهبانیەتی ئەم ئاینەش خەزایە..*" (* *لكل مذهب*

*رهبانية ورهبانية هذا المذهب الجهاد. محمد.ص*) ئەو مرۆڤەی کە بەیداخی جیهاد لە جەرگەی تۆفاندا بە کوڕەکەی دەسپێریّو پێی دەڵێت: "کێوان جوڵان تۆ نەجوڵێی، ددانەکانت لێکدی بسوو، سەرت بەخودا بسپێرە، هەردوو پێت لە عاردی بچەقێنە، نیگات ببڕە ئەوپەڕی سوپای دژمنو هیچ خەتەرو مەترسییەك مەبینەو چاك بزانە کە سەرکەوتن بە دەستی خوایە*" (* عەلی لە شەڕی جەمەلدا بەیداخەکە بە کوڕەکەی خۆی، محەمەد حەنیفە دەسپێریّو ئەو فەرمانەی دەداتیّ) ئەو کەسەی کە گوتی: "ژیان باوەڕو خەزایە"١ (ان الحیاه عقیده وجهاد- حسین.ع) سەری پەنجەیەك کە (چارەنووس) بخاتە بەر پێی ئینسان تا لە ژێر چنگە بەهێزو تۆڵە ئەستێنەکانیدا هاوار بکات، بلورێنیّ* (*ئەمە وەسفێکی ئەمیل لودویکە بۆ سەمفونیای پێنجەمی بتهۆڤن)، ژنێك کە جلکی سپی پۆشیو لە نێو گڕو بڵێسەی سەرکێشی ئاگردا سەعادەتو شادی لەبەر خاتری شکۆو گەورەیی سوتاند* (*جاندارکی شێرەژنی فەرەنسا)، ئەو قەڵەمە بیّ باك و سەر راستانەی کە لە نیوە شەوانی ترسناکدا، لە سەنگەرانی خامۆشەوە، "دەفتەرانی فەرامۆشیان) لە پێناوی رزگاری میللەتی دیلدا دەنوسی.* (* نووسەرانی ژێرزەمینی و گومناوی فەرەنسا کاتیّ کە وڵاتەکەیان لە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەری ئەڵماندا بوو، ڤیرکوری نووسەری خامۆشی دەریاو هاو قەڵەمەکانی) و لە دواجارا ئەو ژن و پیاوانەی کە دەمرن تا حەساری قایم و مکومی ژینگەی خۆیان بڕوخێنن...

***.... ئەمانەن ئافەرێنەرانی گەورەیی و مەزنایەتی.***

قەڵەمی من بە شانازییەکی پڕ غرووروەوە بەسەر ئەم لاپەڕانەدا دەخزیّ، چونکە ئەو قارەمانەی کە لەم چیرۆکەدا دەی نەخشێنیّ، سەماکاری سەماخانەیەك نییە کە بیەویّ ئارەزووی تەماشاڤانەکانی بجولێنیّ، شاعیرێك نییە کە لە هاماج و کەش و هەوای بۆگەنی مەیخانەیەکدا یان لە دیار مەقەڵییەك لوولە دوکەڵی چڕ بە بن میچاندا بکات، لەو بووکەڵانە نیە کە پیر لویس دروستی کردوون* (* پیرلویس نووسەرێکی فەڕەنسیە کە بە بۆنەی دەربڕین و وەسفی خەون و سۆزەکانی بلیتیس-ی سۆزانی یونانییەوە شۆرەتی دەرکردووە...)

یارو وەفاداری کابارەکانی ژێر زەمینانو کوچەو کۆڵانانی گەرەکە بەدناوەکانی پاریس نیە.

چیرۆکی ئەو ئەشقە بۆگەنانە نیە کە لە هولیوودەوە سەرچاوە دەگرن، سەربهوردی تەنازانی ئاگرینو عیشوەگەری دوڕگەی کاپری نیە کە لە هەر چوار نکالی دنیاوە، ورگانێك، سکانێك بەرەو خۆی گاز دەکات کە لە ژێر هەر یەکێککیاندا زێرابێك لە شەهوەت دانراوە.

پێستی بەدەنی نەرم و مەرمەڕینی ئەو ئەستێرە تەنازە نیە کە هەموو سپێدەیەك لە بانیۆی شیردا دەخەویّ، ئەو دەموچاوە نیە کە کرێمی بۆندار تیشکێکی چەوری خستووەتە سەر، لەرەی هەوەس بزوێنی ئەو ران و مەمکانە نیە کە ناوونانی بە سەدان نووسەر بەخشیوە.

قارەمانی ئەم چیرۆکە فرزەندی مەردورەندی بیابانە، فرزەندی بیابانێکی سەربەرزە کە بە هەموو بێنەوایی و دەستکورتیەکەوە، هەمیشە پێی شەرم بووە کە تەنانەت ئاسمانیش ئەشکی رەحم و بەزەیی بە سەرا بباریێنیّ، رۆڵەی بیابانێکە، لە رەخی دەریایاندا دانیشتووەو بە سەدان سالّ لە

ژێر ئاگری خۆردا بە تینویەتی ماوەتەوەو لەبەر نەفس بەرزی بۆ ئاو خواردنەوەش، سەری بۆ دەریا فرو نەهێناوە.
سیمایەکی رەشتاڵەی تاوەگازە کە زبری بیابانی تیا نەخشاوە، پێستێکی چرچ و لۆچە وەکو پارچە چەرمێك لە ژێر هەتاوی دورگەدا، وشك بووەو رەش هەڵگەڕاوە، بە ژن و باڵایەکی باریك و زرافە کە باری رەنج و سەختی بیابان کەمێك چەماندوویەتی، سینەیەکی لەڕو لاوازی رەقەڵەیە کە مەردی و رەندیو خۆڕاگری لێ دەچۆڕێ، و دووچاوی نەترسو بوێری شێرێکە کە لە کڵپەی ئاگری بیابان، جووتێ نیگای بۆ خۆی دروست کردووە.
ئەم چیرۆکە سەرگوزشتەی رەشەبایەکە لە ناو تایفەیەکەوە هەڵی کردو لە بیابانێکی چۆڵدا نیشتەوە.... سەربهوردی پیاوێکی خەڵکی غیفارە.

**فەروەردین ١٣٣٧ ( ١٩٥٨ )**

**عەلی شەریعەتی مزینانی.**

## بەناوی خودا*( * پێشەکی چاپی یەکەمە )

لەو رۆژەوە کە محەمەد مەکەی لە پاش سیانزە ساڵ رەنج و خەباتی بەردەوام بەجیٚ هێشت و بۆ مەدینە هات، دەیزانی کە ئیدی سەردەمی لاوازی و پەنهانکاری ئیسلام بەسەر چووەو دەبیٚ بە یارمەتی یارانی ئەمەکدارو دلێری خۆی، کۆشکی پڕ گەورەو شکۆداری دام و دەزگای ئیسلامی دابمەزرێنیٚ و رژێمە سیاسیەکەی خۆی بەو ئاوایە کە خوا گەرەکیەتی، رەنگ رێژی بکات.

لە هەمان سەردەما، لە رۆژهەڵاتی نیمچە دورگەدا، شاهنشای ئێران کۆشکێکی شکۆدارو دەربارێکی بە رەونەق و رازاوەی هەبوو کە چەندین هەزار قەرەواش و هەزاران نەفەر کۆیلەو خزمەتکارو خوڵام بۆ بەڕێوەبەردنی کاروباری تەشریفاتی و فەرمی خرابوونە کارو بەری رەنجی خەڵکانی بێنەواو زەحمەتکێش بۆ بەڕێوەبردنی ئەو دام و دەزگایە خەرج دەکرا.

لە باکوری عەرەبستانیشدا، هیراکلیوس بە دام و دەزگای ترسناك و پرشکۆی ئیمپراتۆریەتەکەیەوە دیار بوو، دەشێت بگوترێ، ئەوەی لەم دوو وڵاتە گەورەیەدا خۆی دەنواند هەمان ئەو کۆشکە سەر بە فەلەکانە بوو کە تایبەت بوون بە دەسەڵاتدارانەوە، هونەرو ئەدەب و کاری جەنگ و وەرگرتنی باج و سەرانەو بەهرەو داهێنان، هەر هەمووی بۆ ئەمە ئەنجام دەدرا تا بۆنەو ئاهەنگ و تەشریفاتکاریی پاشایەتی و ئیمپراتۆریەتی پڕشکۆترو گەورەتر ساز بکریٚ و بگێڕدریٚ.

لیٚ پێغەمبەری ئیسلام هەر کە گەییە مەدینە، مزگەوتێکی دامەزراندو ماڵۆچکەیەکیشی بۆ خۆی لە پەنایەوە دروستکردو دەرگاکەی لە ناو مزگەوتەکەوە کردەوەو تا کۆتایی تەمەنی کە حکومەتی ئیسلام لە سەرانسەری عەرەبستاندا بەرقەرار بوو بوو هیچ گۆڕانێکی لە ژیانی خۆیدا نەکرد.

فەرمانڕەوای رەهای مەملەکەتێك بوو و نانی جۆی دەخواردو دەگەڵ هەژاراندا لەسەر یەك سفرەو خوان، لەسەر زەوی میناکی کۆیلەی زەبوون دادەنیشت و سواری کەری بیٚ کورتان دەبوو و زۆر جار نەفەرێکی دیکەشی لە پشت خۆیەوە سوار دەکرد.

ئەم تەرزە رەفتارەی پێشەوای ئیسلامی لەبەر ئەمە بوو کە جیاوازی رژێمەکەی ئەو لە رژێمی شاهنشای ئێران و ئیمپراتۆری رۆم دەربکەویٚ و خەڵکی بە چاوی خۆ ببینن کە رژێمێکی تازەو سیستەمێکی نویٚ لە نێوان دوو پایەگای ئەشرافی دا دامەزراوە کە حوکمڕان و حوکم کراو، فەرماندەو فەرمان پێدراو، ئاغاو بەندەی تێدا نییەو هەمووان لەبەر بارەگای خواو عەدالەتدا لە یەك ریزدا وەستاون.

دامەزرێنەری ئەم رژێمە رۆیی و بە ئەفرۆزکردنی عەلی و دەستەبەندی رامیاری، یەکەمین خشتی خەلافەت بە خواری دانرا. ئەبو بەکریش عومەری بە جێنشینی خۆی هەڵبژاردو دووەمین جەزرەبە لە رژێمی ئیسلامی کەوت.

عومەرو ئەبوبەکر ئەگەرچی بە خۆیان سەبەبکاری ئەم لادانە بوون، بەڵام سیستەمی سیاسی ئیسلامی لەسەر هەمان پایەو بناغە بوو کە پێغەمبەر دای نابوو، سادەیی، یەکسانی، دابەشکردنی دادوەرانەی سەروەت و سامان و رێگەگرتن لە کەڵەکەبوونی سەروەت لە چەند دەسێکی کەمدا پەیڕەوی دەکرا.

عومەریش رۆیی و عوسمان، ئەم پیرەمێردە بە رواڵەت موقەدەس و بیٚ توانایە، جڵەوی کاروباری حکومەتی گرتە دەست و ئەو شلۆقیەی کەوتبووە بونیادی حکومەتی ئیسلام بەرادەیەك توند بوو کە بیناکەی محەمەد بە جاریٚ وێران بوو، و لە سەردەمی ئەودا (عوسمان) خەلافەت گۆڕا بە پاشایەتی و کوخی پێشەوایانی ئیسلامی بوو بە کۆشکی شاهنشاهی و سادەیی گۆڕا بە تەشریفاتکاری پڕشکۆی دەرباری معاویەو دام و دەزگای تەخشان و پەخشانی عوسمان.

ئەبو زەڕ کە پێنجەمین ئیسلام بوو و شمشێرەکەی لە پێشڤەبرنی بزووتنەوەی ئیسلامدا یەجگار کاریگەر بوو ئەم کەچڕەویانەی دەبینی، عەلی، نموونەو ئاوێنەی تەقواو حەقیقەت گۆشەگیر بوو و دژمنانی ئیسلام دزەیان کردبووە نێو دام و دەزگای خەلافەتەوەو میناکی مۆریانە ئیسلامیان دەخوارد.

ئازادان و حەقیقەت پەرستان هەریەکەیان بۆ لایەك رەهەندە بوون و خامۆش بوون. ئەو رۆژەی کە ئەبو بەکر ناجوامێرانە عەلی لە شانۆی سیاسەت وەدەرناو بە خۆی لەسەر کورسی خەلافەت دانیشت، ئەبو زەڕ نیگەران و شپرزە ترسی لێنیشت و ئایندەی ئیسلام لەبەر چاوی تاریك و ترسناك بوو، بەڵام بە هەر حاڵ کە دەی بینی هێشتا کاروانی ئیسلام تا رادەیەك بە رێگەی ئەسڵی خۆیدا دەڕوات و ئەگەرچی هەقێکی گەورە پایەماڵ کراوە، هێشتا شیرازەی سیستەمی ئیسلامی لێك نەپچڕاوە، لەبەر ئەمە ئەگەرچی خوێنی جگەری خۆی دەخواردەوەو قوڵپی دەدا، بەڵام مۆری بێدەنگی لە زاری داو خامۆش بوو. کاتیٚ کە رژێمی عوسمان بەسەر ئیسلامدا زاڵ بوو، بیٚ بە شان و جەماوەری زەحمەتکێش و بیٚ نەوایان لە ژێر پێی سووتخۆران و کۆیلە فرۆشان و دەوڵەمەندان و ئەشرافاندا، کە هاتوچۆی دەرباری عوسمان و معاویەیان دەکرد، پایەماڵ بوون، جیاوازی چینایەتی و سەروەتداری هەمدیس بوژایەوەو مەترسییەکی گەورە هەڕەشەی لە ئیسلام کرد، ئەو وەزع و حاڵەی جارانی پێغەمبەر، ئەو سادەیی و بیٚ ریاییەی ئەبوبەکرو عومەر، کە وەکو کەسێکی ئاسایی و بگرە هەژارو دەستکورت دەژیان، گۆڕا. هەزاران دینار بۆ دروستکردنی کۆشکی کەسکی حوکمڕانی ئیسلامی (معاویە) خەرج کراو دام و دەزگایەکی میناکی دەربارانی شاهنشاهی بەرپا کرا.

ئەبو بەکر، بۆ بەڕێوەبردنی گوزەرانی خۆی بزنانی کابرایەکی جولەکەی دەدۆشی و عوسمان، خەلیفەی پێغەمبەر! بەهای گەردنبەندی ژنەکەی هاوتای سێیەکی باجی ئەفریقا بوو.

عومەر لەسەر ئەسپێك، کە کوڕی یەکێك لە گەورەترین سەردارەکانی، بە پشتیوانی دەسەڵاتی بابی خۆی بەزۆر لە یەکێکی دەسەنیٚ، کوڕەکەو بابەکەی رادەکێشێتە دادگا، بەڵام عوسمان، مەروانی حەکەم –واتە ئەو کەسەی کە پێغەمبەر دووری خستبووەوە– دەکات بە شیرەتکاری خۆی و هەرچی باج و خەراجی ئەفریقایە لە یەك جیٚ بەوی دەبەخشیٚ!...

ئەبو زەڕ کە ئەم دیمەنە پڕ شەرمەزاریانەی دەبینی و چونکە نەیدەتوانی لەوەی پتر خۆی بگریٚ و بە بێدەنگی دانیشێت، راپەڕی، راپەرینێکی مەردانەو سەیر، راپەرینێکی کە سەرانسەری ولاتانی ئیسلامی لە عوسمان هاڕوژاند، راپەرینێك کە تا ئێستاش شەپۆلە خرۆشاوەکانی لەسەر شانۆی کۆمەڵگە مرۆڤانیەکاندا بە چاو دەبینین.

ئەبو زەڕ لە پێناوی پەرەپێدانی سوسیالیزم و هاوبەشی ئابوری و رامیاری ئیسلامدا تیٚ دەکۆشا، و دام و دەزگاکەی عوسمان ئەشرافیەتی دەژیاندەوە. ئەبو زەڕ ئیسلامی بە پەنای داماوان و ستەمدیدان و جەماوەری رەش و رووت دەزانی و عوسمان کردبووی بە ئامێری سەرمایەداری و سەنگەری پاراستنی بەرژەوەندی سووتخۆران و دەوڵەمەندان و ئەشراف.

ئەم کێشماکێشە لە بەینی ئەبو زەڕو عوسماندا هەڵگیرساو ئەبو زەڕ لە ئەنجامدا گیانی خۆی لە پێناویا بەختکرد. ئەبو زەڕ هاواری دەکرد ئەم سەرمایانە، ئەم سەروەت و سامان و زێڕو زیوانەی کە کۆتان کردووەتەوە، دەبیٚ بەسەر هەموو موسوڵمانانا بە یەکسانی دابەش بکریٚ، دەبیٚ لە سایەی یەکسانی و رژێمی ئابووری و ئەخلاقی ئیسلامدا هەموو کەسێك لە بەهرەی ژیان بەرخوردار بیٚ، بەلام عوسمان ئیسلامی بە ئەنجامدانی تەشریفات و رێورەسمی رواڵەتی و بە تەقواو تەقەدوسی زاهیری دەزانی و ئاینی بەوە نەدەزانی کە پەیوەندی بە هەژاری زۆربەو دەوڵەمەندی کەمینەوە هەبیٚ، ئەبوزەڕ لەو خەباتەدا کە لە ڕای پەرەپێدانی سوسیالیزمی ئیسلامیدا دەستی دابوویە وچانی نەدەداو نەیدەهێشت دژمنەکەشی ئارام بگریٚ و وچانێك بدات.

ئەم بانگەوازی لایەنگرییە لە چینی چەوساوەو کڵۆڵ کە ئەبوزەڕ لە کۆمەڵگەی ئەو رۆژگارەدا بەرزی کردەوەو زوو بە زوو بڕا، یەکەمین هاژەی گڕکانێکی گەورە بوو کە هەزار ساڵ لەوەدوا، واتە لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا لە ئەوروپادا روویداو پریشکەکەی داوێنی هەموو میللەتانی گرتەوە.

ئەم گڕکانە ئەگەرچی نەو بڕێك هێور بووەتەوە، بەلام هێشتا نەکوژاوەتەوە، و بەم زووانەش دانامرکێتەوە، یەکەمین پریشکی ئەم گڕکانە مەزنە کە پاشان لە شێوەی رێبازو قوتابخانانی جۆراوجۆری ئابووریدا پاش شۆڕشی مەزنی فەرەنسا لە جیهاندا پەیدا بوو، لە گەرووی مەردانەی ئەبوزەڕەوە هاتە دەریٚ، لیٚ دەزگاکەی عوسمان توانی زوو بە زوو لە بیابانی بەرینی (رەبەزە)دا خەفەی بکات و بیکوژێنێتەوە.

ئەشراف وسەروەتداران و سەرمایەداران وایانزانی کە بە مردنی ئەبوزەڕ، پێشەوای رەش و رووتان و داکۆکیکاری زۆر لێکراوان، ئەو خەتەرو مەترسییەی کە لەلایەن ئەم چینەوە هەڕەشەی لێدەکردن بە یەکجارەکی لاچووە، بەلام شۆڕشە ئابوورییەکانی دوایی سەلماندی کە رژێمی عوسمان سەرکەوتووە یان سوسیالیزمی ئەبوزەڕ؟

***سوسیالیستانی نویٚ دەڵێن:***

دنیا دەبیٚ ببیٚ بە سوسیالیست، تا شایستەی ژیان و ژین بیٚ، تالانچیەتی و زۆرداری و ئەشراف، لە بەین بچیٚ و مەحوبێتەوە، نەمێنیٚ ئێمەش هەمان جۆرە بیر لە سەرانسەری ژیانی ئەبوزەڕدا دەبینین ئەگەر دروشمی سوسیالیزم ئەمەیە کە: "لە هەر کەس بە گوێرەی توانای و بۆ هەر کەس

بە گوێرەی کاری". جا ئێمە ئەوە لە خەباتی دلێرانەی ئەبوزەڕدا بە شێوەیەکی شکۆدارترو، سیازدە سەدە لەوە پێش دەبینین.

مـن هـەر کـاتێ بیر لـە ژیـانی سـەیری ئـەبوزەڕ دەکەمـەوەو تەمەشـای خواپەرسـتی ئـەو دەکـەم (پاسکال) وەیاد دێنمەوە، پاسکال دەڵێت: **"دڵ هەندێ بەڵگەی هەیە کە ئەقڵ دەستی نایگاتێ و دڵ گەواهی بوونی خوا دەدات نەك ئەقڵ، و باوەڕو ئیمان لەم ڕێگەیەوە بە دەست دێت".**

ئەبوزەڕ دەڵێت: ***"من لەم بوونە بێ سنوورو کەشەنەدا نیشانەو بەڵگەیەکم دۆزیوەتەوە کە خودای نیشاندام، بەتەما مەبە ئەقڵ بە باس و شیکردنەوە پەی بە نهێنی ئەو بەرێت، چونکە ئەو (خودا) لە هەموو ئەوانە گەورەترە، و ئەقڵ باوشی پێیڕا ناگاتەوە."***

ئەبوزەڕ، وەکو پاسکال، خوای لە ڕێگەی دڵەوە، ناسیوەو سێ ساڵ بەر لەوەی پێغەمبەر بدێنێ، پەرستوویەتی.

کاتێ کە دەربارەی سەروەتداری و زێڕ کۆکردنەوە قسان دەکات و بە توندی بەرگری لە هەژاران دەکات و هێرش دەکاتە سەر ئەشرافان و کۆشك نشینانی شام و مەدینە، پیاو سوسیالیستێکی توندڕەوی میناکی (پرودون)ی وەبیردێتەوە. بەڵام ئەلهەقی ئەبوزەڕ شتێکەو پاسکال و پرودون شتێکی دیکەن، ئەبوزەڕ لەو ڕۆژەوە کە خودای ناسی ئیدی لە رای ئەودا بۆ ساتێکیش وچانی نەداو بۆ دەمێك لە هزیرین و کار خاونەبووەوە، نە پرودون پاکی و بێگەردی و خواپەرستی ئەبوزەڕی هەیەو نە پاسکال چالاکی و چەلەنگی و جۆش و خرۆشی ئەوی هەیە، ئەبوزەڕ لە قوتابخانەی ئیسلامدا بوو بە "بنیادەمێکی پوختە" و ئەم وەسفە بۆ گەورەیی ئەو بەسە.

لەوەیە بۆ گەلێك لەو کەسانەی کە مێژووی ئیسلام دەخوێننەوەو تاوتوێ دەکەن ئەم پرسیارە بێتە پێشێ کە: ئایا ئەو ئەنجامە دەرخشانەی کە لەم ڕاپەڕین و شۆڕشە کەوتەوە جگە لە چەند لەشکرکێشی و فتوحاتێك و دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورە –کە دوای چەند سەدەیەك ئەویش لەناو چوو– چی بوو؟ و جیاوازی بزاڤ و ڕاپەڕینی ئیسلامی دەگەڵ هەموو بزووتنەوەو ڕاپەڕینە سیاسی و سوپاییەکانی مێژوودا کە سەرکەوتنی لەو جۆرەیان بە دەست هێناوەو تەنانەت وڵاتگیری فرەتریشیان کردووە چییە؟ بە تایبەتی کە دەبینین ڕاپەڕینی ئیسلام، هەر لە یەکەم قۆناغەوە، دووچاری جیاوازی و ناکۆکی ڕامیاری بوو، و لەکاروانی ئەسڵی خۆی لایداو پێشەوایانی ڕاستەقینەی ئیسلامیش بە خۆیان دانیان بەم خاڵەدا ناوە.

کەواتە ئیسلام چی کردووە؟ لەو هەموو گیان فیدایی و خەباتەی پێغەمبەرو یارانی خوا پەرست و دلاوەری ئەو، چ ئەنجامێك بە دەست هاتووە؟ خۆ ئەگەر هەندێ فتوحات و وڵاتگیری کرابێ، ئەوا لەو ڕوانگەیەوە کە ئێمە تەمەشای ئاین دەکەین، بایەخێکی نیە، بە تایبەتی کە زۆربەی ئەم فتوحاتە بە دەستی سوڵتانانی بەنی عەباس و بەنی ئومەیەو ئەو جۆرە خەڵکانە ئەنجام دراوەو پەیوەندییەکی واقیعی و ڕاستەوخۆی بەحەقیقەتی ئیسلامەوە نەبووە.

ئـەم داوەرییـە لـەم ڕووەوە تـا ڕادەیـەك دروسـتەو، وڵاتگـیری و فتوحـاتی لەشـکری و هێـزی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی نابێ بە ئامانجی ستراتیژی و بنەڕەتی ئیسلام دابنەین و نە بە بەشێك لە ئەنجامی گەورەی ئەم ڕاپەڕینەی بزانین. ئەگەر بەو چاوەوە کە پێویستە بڕوانینە ئاین، تەمەشای

ئیسلام بکەین، ئەم مەسەلەیە نەك هەر چارەسەر دەبێت بەڵکو سەرمان لە ئەنجام و ئاکامی درەخشان و پێشکەوتن و سەرکەوتنەکانی ئیسلام سوڕ دەمێنیٚ.
ئاین تاقە فاکتەرێکە کە لە سەرێتی لە شارێی پەرەسەندنی گشتی خیلقەتدا، بەشەریش بخاتە سەر رێی پێشکەوتن و پەرەسەندن و پوختە بوون، وەکو چۆن هەندیٚ فاکتەرو هۆکاران بووەتە مایەی ئەوە کە بیٚ گیان بگۆڕیٚ بۆ رووەك و رووەك بگۆڕیٚ بۆ گیانلەبەرو گیانلەبەر پەرەبسەنیٚ و بگۆڕیٚ بۆ مرۆڤ، ئاینیش فاکتەرێکە، هۆیەکە کە ئەم چیرۆکە عەجیبەی خیلقەت پەیگیری بکات و ئینسان بەرەو ئەو مەنزڵ و قۆناغەی کە پێویستە بیگاتیٚ، بکێش بکات و روحی بەرەو لوتکەی بەرزی عیرفان و ئینسانیەت هەڵداو لەوەش بالاٚتری بەریٚ، شوێن و کاتی بخاتە ژێر پیٚ. کەواتە دەشێت بگوترێ کە ئاین بزوێنەرو دینەمۆی مرۆڤە بۆ تەی کردن و بڕینی پەیژەی تەکامل و پوختەبوون، بە گوتەیەکی دی ئاین کارخانەیەکە کە (مرۆڤی راستەقینە)ی تیا دروست دەکرێت، و ئێمەش جگە لەمە نابیٚ چاوەنۆڕی چ شتێکی دیکە بین لە ئاین.
ئێستا دەبیٚ بزانین کە ئایا ئیسلام توانیویەتی، لەم بوارەدا، سەرکەوتن بە دەست بێنیٚ و چەند نموونەیەك لە دەستکردەکانی خۆی لە بازاڕی بەشەریەتدا نیشان بدات یان نا؟
بۆ لێکۆڵینەوە لەم بابەتە، بەوپەڕی سەرسامی، دەبیٚ هاوڕێ دەگەڵ مێژوودا بچینە سۆراغ و تاقیبی هەندیٚ لەو پیاوو ژنانەی کە لە جەرگەی جەماوەری گومناوو بەندەو کۆیلانی زوڵم لێکراوو رەش و رووتانەوە سەریان قوت کردووەتەوە، واتە بچینە سۆراغی ئەو کەسانەی کە مێژوو هەمیشە شەرمی لە تۆمارکردنی ناویان کردووە، و بە زۆری لە بەردەم کۆشکی رازاوەی سوڵتانان و لە مەیدانانی جەنگ و لە بەر دەرگای خودان زێڕو زۆراندا چۆکی داداوە، بەلاٚم ئەمجارە دەبینین کە هەمان مێژووی ئەشراف پەرست و خۆ پەسند، بۆ چادرانی کۆنەو کوخانی وێرانی کۆیلانی ئەفریقایی و پیٚ خاوسانی ناوبزری بیابانی عەرەبستان و کەسانێکی نە ناسراوی بیٚ بایەخی وەکو ئەبو زەڕ، کابرایەکی سەر بە تیرەی غیفار، و سەلمان، ئاوارەیەکی ئێرانی، و بیلال، کۆیلەیەکی هەرزان بەها دەچێت و بەند بە بەندی ژیانی ئەوان بە تامەزرۆییەکی فرەوە تۆمار دەکات و بەوپەڕی شانازییەوە پێشکەش بە نەسلی ئایندەی بەشەریەتی دەکات! هەروەها دەبیٚ لەوەش بکۆڵرێتەوە کە بۆچی و لە کەیەوە، مێژووی فڕناخ و بەفیزو دەرباری، بەم شێوەیە بیٚ هەواو خاکی بووە؟
کەواتە بۆ زانینی ئەو ئەنجامانەی کە لە راپەڕینی ئیسلام کەوتوونەتەوەو بە دەست هاتوون نابیٚ سەیری ئەو فتوحاتانە بکریٚ کە لە ئاسیاو ئەفریقاو ولاٚتانی باشووری ئەوروپا ئەنجام دراون، بەڵکو دەبیٚ تەمەشای ئەو پێشکەوتنانە بکریٚ کە ئەم راپەڕین و شۆڕشە لە قولاٚیی هزرو مێشك و دڵ و گیانی ژمارەیەك لە پەیڕەوکارانیدا بەرپای کردووە.
ئەو فتوحاتەی کە ئیسلام لە دۆڵانی پێچاوپێچ و سەختی ئەم ژمارەیەدا کردوویەتی، لە روانگەو نۆڕینی ئەو کەسانەوە کە حەقیقەت و ئینسنیەتیان زۆر لە هێزو دەسەلاٚتی سوپایی و رواڵەتی، پیٚ بایەخدارترە، فراوانترو حیرەت ئەنگێزترو پڕبایەختر دەنوێنیٚ.

فتوحاتی ئیسلام، لە مێژووی وڵاتانێکی میناکی رۆم و ئێرانو سەربهوردی وڵاتگرانێکی وەکو چەنگیزو داراو ناپلیون و نموونەی ئەم "بێ مێشکانی ناودار"ـە بێ وێنە نییە، بەڵام لە پیاوێکی ناوبزری بیابان نشین و نیمچە کێوی میناکی جەندەبی کوڕی جەنادە، ئەبوزەڕێکی غیفاری دروست بکەی، لە هەر قوتابخانەو راپەڕینێك کارێکی کەم وێنەیە، خۆ ئەگەر دەسکەوتو ئاکامەکانی ئیسلام جگە لە پەروەردەکردنی چوار پێنج (ئینسان)ی وەکو ئەبوزەڕو سەلمان و عەممار وياسرو بیلال، چ شتێکی تریش نەبووایە، ئەمە خۆی لە خۆیدا بەس بوو کە ئەقڵ لەئاستی ئەو سەرکەوتنانەدا کە بەدەستی هێناوە سەرسام بێ.

لێ مەخابن بە جۆرێ هەقی ئەم جوامێرانە، کە بە شانازی مێژووی ئیسلام دەژمێردرێن، زایە بووە کە پەیڕەوکارانی هەمان ئەو ئاینەی کە بە هێزی هزرو زەبری شمشێری ئەوان بتەو بووە، نایان ناسنو پەیان بەو پلە بەرزانەی کە ئەم نموونانەی ئینسانیەت لە زنجیرەی پەرەسەندن و پێشڤەچوونی بەشەریدا بڕیویانە، نەبردووەو تەنانەت ئاگادارییەکی دروستیان لەمەڕ کورتە ژیانیانیش نییە.

ئێمە بەم خەمساردی و بێ موبالاتییەی کە دەرهەق بە ماف رەوای ئەم پێشەوایانەی هەق و ئەم نموونانەی تەقواو مەردایەتییە کردوومانە، جەزرەبەیەکمان لە حەقیقەتو مرۆڤایەتی داوە کە قەرەبوو کردنەوەی دژوارو ئەستەمەو هەموو موسوڵمانان لەم درێغی کردنەدا بەشدارو شەریکن، لێ پێویستە بەوپەڕی شەرمەزاریو داخەوە دان بەوەدا بنەین کە شیعەیان لەم تاوانە لە بەخشین نەهاتووەدا پشکێکی پتریان هەیەو لەم پایەماڵ کردنی هەق و حەقیقەتدا لە براکانی خۆیان لە پێشترن، چونکە ئەوان لەم دواییانەدا بە دانان و نووسینی کتێبان دەربارەی ژیانی ئەم پێشەوا بەرزو بە قەدرانەی ئیسلام تا رادەیەك قەرەبووی رابردوویان کردووەتەوە، لێ شیعەیان هێشتا هەر لە غەفلەتی خۆدان.

سەیر ئەمەیە زۆربەی ئەم کەسانەی کە بە سەرانی شۆڕشگێڕی ئیسلامی دەژمێردرێن، لەو رۆژگارەدا کە حکومەت کەوتە دەستی ئەبوبەکرو جێنشینەکانیو عەلی پێشەوای شیعەیان ئەفرۆز کراو ماف پێشێل کرا، پەپولە ئاسا بە دەوری حەقیقەتدا دەگەڕانو دژایەتی ئەو دام و دەزگایانەیان دەکرد لە دوا ئەنجامیشدا لەبەر پێی عەلی دا پەڕو باڵی گیانی خۆیان سووتاندو، بەدڵنیاییەوە دەشێت بگوترێ بەم خۆ سووتاندنە واقیعی ئیسلامیان بە ئەمانەت بە دەستی مێژوو سپارد، و بە خەبات و بەرەڤانی دلێرانەی خۆیان دژ بە گۆڕینی رژێمی ئیسلامی، بەشەریەتیان، وێڕای پێ داگری پایەخوازانو ریاکاران، لە سەرچاوەی حەقیقەت و مەعریفەت مەحرومو بێبەش نەکرد.

ئەبو زەڕ یەکێکە لەم چەند نەفەرەو یەکێکە لە هەمان رابەران و فریارەسانی ئازادی کە ئەمڕۆکە بەشەریەت خۆزیا خوازیانە، بە تایبەتی لە کاتێکا کە تەکنولۆژیا قەیرانێکی توندی لە جیهانی ئابووریدا چێکردووە، پرسە ئابوورییەکانی بە سەرەکیترین پرسێن ژیان و بناغەی هەموو شتێك داناوە، بۆچوونەکانی ئەو بایەخی زیاتریان پەیدا کردووە، هەمان ئەو دیمەنەی کە لە شام و مەدینەی دینایە ئاراوەو، رەش و رووت و هەژارانی لە دەوری خۆی خڕ دەکردەوەو لە عەلەیی

سووتخۆران‌و پاره پەرستان و ئەشرافی زێڕ پەرست هانی دەدان، ئێستاش دروست بووەتەوەو موسوڵمانانی جیهان گوێ لە قسە دڵگیرو بۆچوونە دروست و وتە ئاگرینەکانی دەگرن‌و دەڵێی لەوپەڕی مێژوودا بە چاوی خۆ دەی بینن کە زۆر لێکراوان‌و داماوەکانی لە مزگەوتدا کۆ کردووەتەوەو بە توندی دژی کۆشك نشینانی کەسك و دەزگای گەندەڵی عوسمان هانیان دەدات‌و هاوار دەکات: "ئەو کەسانەی زێڕو زیو کۆ دەکەنەوەو لە رای خودا بەختی ناکەن، تۆ لەو ئازارە بەژانەی تووشی دێن ئاگاداریان کە" (سورەتی تەوبە، ئایەتی ٣٤.)

"ئەی معاویە، ئەم کۆشکە ئەگەر لە پارەی خۆت دروستی دەکەی زیادە مەسرەفەو ئەگەر بە پارەی خەڵکیشە ناپاکی و خیانەتە!"

"ئەی عوسمان، گەدایان تۆ بە گەدات کردن و دەوڵەمەندان تۆ زەنگینت کردن"**

***مەشهەد*** ١٣٣٤ ( ١٩٥٥ )

**عەلی شەریعەتی مزینانی.**

*** پێشەکی چاپی یەکەم.***

***** پەراوێزێکی دیکە هەبوو، لەبەر ئەوەی یەکەم شیعر بوو، و بەندە حەزم لە وەرگێڕانی شیعر نیە، دووەم نەبوونی ئەو پەراوێزە کاری نەدەکردە سەر کرۆك و جەوهەری دەقەکەو هیچ زیانێکی لە زانیاری خوێنەری کوردی زمان نە دەدا، بۆیە بە داوای بوردنەوە پشت گوێم خست .***

***( حەمە کەریم عارف ).***

## تروسکەیەك لە نور

***ئەبو زەڕ گوتی:***
***سێ ساڵ پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ببینم نوێژم دەکرد.***
***گوتم: بۆ کێ؟***
***گوتی: بۆ خوا.***
***گوتم: ڕووت دەکردە کوێ؟ گوتی: ئەو شوێنەی کە ئاراستەی دەکردم.***

سەرانی تیرەی غیفار لە دەوری یەك خڕ بوو بوونەوەو ڕاوێژو تەگبیریان دەکرد. لە مێژ بوو کە باران نەباری بوو و خێرو چاکی پشتی تێ کرد بوون، داماوی‌و هەژاری رووی تێ کردبوون‌و مەڕو ماڵات و وڵاخیان کەسیرە بوو بوو. هەموو لە یەکتریان دەپرسی: بۆچی خواوەندەکەیان، مەنات، سەرباری ئەم هەموو گریان‌و پاڕانەوەو قوربانیە زۆرە، پشت گوێی خستوون‌و رقی لێیان هەستاوە؟ وەرزی باران تێ پەڕیوەو نە هەورێ بە ئاسمانەوە دەبینرێ‌و نە شوێنەوارێکی باران دیارە، ئایا گومڕا بوونەو غەزەبی خواوەندێك گرتوونی؟ نە! بۆ نزیك بوونەوە لە خوا قوربانیان کردووە، خوێنیان ڕشتووە، پاڕاونەتەوە، نە گومڕا بوونەو نە خواوەندەکەشیان لێیان چووە بەقینا، بەڵام چ لەگەڵ کاری ئاسماندا دەکرێ؟
پیاوانی غیفار هیچ دەسەڵاتێکیان لەوەدا نییەو جگە لە خواوەندی تواناو گەورەیان (مەنات) کەسی تر نەیدەتوانی باران بنێرێ‌و زەوی وشك و برینگ‌و مردوو سوتاویان پاراوو زندوو بکاتەوە، هیچ چارەیەك نیە مەگەر بە کۆمەڵ، پیاوو ژن بە بەردەباری‌و گوێڕایەڵی و گەردن کەچی‌و گریان‌و زاری‌و پاڕانەوە ودەربکەون‌و بەتەمای ڕەحمەت‌و بەزەیی‌و بەخششی مەنات بن، بەڵکو بەزەیی بە حاڵی زاریاندا بێتەوەو بایەك هەڵکاو هەوران بۆ دەڤەری وان ڕەوانە بکات‌و داکاتە بارانی ڕەحمەت، زەوی مردوو بژێنێتەوەو ڕەنج‌و نیگەرانیان بڕەوێنێتەوەو ئاسوودەیان بکات..
خێڵ، بۆ ڕۆیشتن بەرەو لای مەنات ئامادەو تەیار بوو، هەموو چوون بەلای وشترەکانیانەوە، (ئەنیس)ش سواری وشترەکەی خۆی بوو و هەیدێی لێکرد، وشتر هەستاو لەگەڵ کارواندا بەرەو کەناری دەریایەکی نێوان مەکەو مەدینە –مەنات لەوێندە دانرابوو– بەڕێ کەوت. ئەنیس چاوی بە دەورو بەری خۆیدا گێڕا، برایەکەی نەبینی، وشترەکەی یخ داو بە هەشتاو بەرەو ماڵ ڕۆیی‌و بانگی کرد: "جەندەب! هۆ جەندەب!"
وەڕوور کەوت، سەیری کرد بە کەماڵی خوێنساردی‌و هێمنی، بێ هیچ نیازو بڕیارێك لەسەر جێگاکەی خۆی پاڵکەوتووە.

مەگەر گوێت لە بانگی جارچییەکە نەبوو، کە جاڕی چوونە دەرێی دەدا؟

– با، لێ من لە ناخی خۆمدا یەجگار لە زیارەتی ئەم مەناتە بێ تاقەتو بێزارم.

– دەمت لێك بنە! داوای بوردنی لێ بکە. باشە ناترسی گوێی لەم قسەیەت بێو بەڵایەکت بەسەرا نازڵ بکا؟

– تۆ پێت وایە کە ئێمە دەبینیو گوێی لە قسەمان دەبێ؟

– ... ئەوە ئەمڕۆ چیت بەسەر هاتووە، ئەجنە دەستی لێ وەشاندووی؟ نەخۆشی؟ ها! تا زووە تۆبە بکە! بەڵکو تۆبەت لێ قەبوڵ بکات.

ئەبو زەڕ ئەم شانو ئەو شانێکی کردو لە جێگەکەی خۆیدا گینگڵێکی داو هیچی نەگوت.

ئەنیس گوتی: رابە! رابە! کاروان رۆیی و خەڵکی پێشمان کەوتن.

ئەوجا لە هەمان شوێن وەستا تا ئەبو زەڕی دەگەڵ خۆدا برد، ئەنیس بە گورجی خۆی هەڵدایە سەر وشترەکەی، لێ ئەبوزەڕ ماتو بێدەنگ بەرەو وشترەکەی رۆیی و سوار بوو.

ئەنیس روویکردە برایەکەی و گوتی: "ئاگات لێ بێ ئەم باوەڕەی خۆت ئاشکرا نەکەی دەنا خەڵکەکە بێ چەندو چوون هۆی نەبارینی بارانو غەزەبی خودا لە چاوی تۆ دەزانن و خراپ ئەزیەتت دەدەن".

هەنگێ کەوتە ژماردنی فەزڵ و چاکەی مەنات لە نێو عەرەباو ئەبو زەڕیش لە رووی بێزاری و ناچارییەوە گوێی لەم قسانە دەگرت، بەڵام کڕوکپ بوو و بە قوڵی لە فکران راچوو بوو. دوای چەند رۆژێك کاروان بە خزمەتی مەنات موشەڕەف بوو، و لە کاتێکا بە ویساڵی مەنات گوڕو تینێکیان تێ گەڕا بوو، وشترەکانیان یخ داو ئەوجا بەو قوربانیانەوە کە دەگەڵ خۆدا هێنابوویان، بە هەڵهەڵەو دوعا کردنو پاڕانەوەو بە دڵی پڕ لە خاکەسەری و گیانی گەرم و تەژی ئیمانەوە بە هەشتاو بەرەو دەرکەی پەروەردگارەکەیان چوون، قوربانیەکانیان کوشتەوەو ئەو خوێنە سوورو پاکەی کە مەنات زۆری حەز لێدەکرد،عاردەکەی رەنگین کرد.

ئەبو زەڕ بێ ئەوەی لەم رووداوەدا بەشداری بکاتو جۆشو خرۆشێکی وەکو ئەوانی تری هەبێ، بەردەوام تەمەشای ئەو رووداوەی دەکردو چاوە تیژەکانی لە بەینی مەناتو خێڵەکەی خۆیدا دەگەڕاو سەری لە غیفارو سادەییو نەزانی غیفار سوڕما بوو، سەری لەم خودا بەردینە بێدەنگەی کە لەو بەزمەی لەبەر بارەگاکەیدا رووی دەدا بێ ئاگایە، سووڕ دەما، سەری لەم دوو کەڵە ئاگرینەی کە لە قوڵایی دڵانی سوتاوو پڕ باوەڕەوە دەهاتە دەرێو مەنات گوێی لێ نەبوو سووڕ دەما، لەگەڵ ئەمەشدا چۆن دەتوانێ قەناعەتیان پێ بکاتو پاش ساڵانێکی درێژی ئیمان و باوەری نەگۆڕ ئەم رێگەیەیان پێ تەرك بکات.

شەو رەشماڵی خۆی بەسەر مەنات و مەنات پەرستاندا هەڵدا، جلی رەشی شەو هەموو شتێکی داپۆشی بوو، تەنیا ئەو ئەستێرە پرشنگدارانە نەبێ کە بە بەرۆکی ئاسمانی سافەوە دەدرەوشانەوە، ئەو ئاگرە نیوە گیانانە نەبێ کە هەڵیان گیرساندبوو تا هەر کەسەو جێیەك بۆ خۆی هەڵبژێرێو جێی خۆی بناسێتەوە.

کوڕی چیرۆکبێژان لێرەو لەوێ ساز بوو، ئەبوزەڕ خۆی بە کوڕی پیرەمێرو گەوراندا کرد، چیرۆکەکەیان دەربارەی خواوەندان و گەورەیی وان بوو. یەکێك باسی مەناتی دەکرد، یەکێکی دی چیرۆکی خۆش و بەلەزەتی لات و عزە، کیژانی خوداو شەفاعەتی ئەو جووتەی لە کن وی، دەگێڕایەوە. کاتێ کە باسی پایەی بەرزی سەعدی دەکرد، یەکێك لە نێو مەجلیسەکەوە قسەکەی بڕی و هەڵیدایەو گوتی:

– باسی ئەو پیاوەی کە جوێنی بە سەعد داوە دەزانن؟

هەموو بە یەك دەنگ:

– نە، چی گوتووە؟

– پیاوێك روو دەکاتە سەعد تا وشترەکانی بەو بسپێرێ، کە دەگاتە نزیکی سەعد وشترەکانی بەرەڵلا دەکات و هەر یەکەیان بەو بیابانەدا بەلایەکدا پەراگەندە دەبێت، کابرا تورە دەبێت و چونکە ناتوانێ کۆیان بکاتەوە لە داخانا. بەردێك هەڵدەگرێت و بە سەعدیا دەکێشێت و دەڵێت: "تۆ بە کەڵکی خوایەتی نایەی"، ئەوسا پشتی تێدەکاو دەکەوێتە شوێن وشترەکانی و لەبەر خۆیەوە دەڵێت: "هاتینە لای سەعد تا یەکمان بخات و کۆمان بکاتەوە، کەچی پەرت و بڵاوی کردینەوە، چیتر دوای سەعد ناکەوین، چما سەعد جگە لە پارچە بەردێکی ئەو گۆڕە کە نە چاکەی لە دەست دێ و نە خراپە، هیچی ترە؟".

یەکێك بە دەنگی بەرزو تورە گوتی:

– بە خودا ئەم پیاوە کافرە بووە... ئێ، دوایی چی بوو؟

– دوایی، هیچ نەبوو!

هەموو سەریان داخست و بە گومان و سەرسامییەوە لە فکران راچوون، تەنیا ئەبوە زەڕ نەبێ کە ئەم چیرۆکە دڵی تەژی ئاسودەیی و دڵنیایی کرد. بیستنی ئەم سەربورە زاتی خستنە بەر تا دەربارەی بتەکان بکەونە بیرکردنەوەو بەگێڕانەوەی ئەم جۆرە چیرۆکانە گوساخ و بوێر بن، یەکێکیان گوتی: ئایا چیرۆکی عودەی کوڕی حاتەم–تان، کە سەرپێچی لە عیبادەتی فلس کردووەو دەستی لە بت پەرستی هەڵگرتووە، و بووە بە نەسرانی بیستووە؟ گوتیان:

– نە، چۆن بووە؟

– سەیفی، خزمەتکاری فلس، ماچە وشترێکی ژنێك لە خێڵی بەنی عەلیم، کە هاوسێی مالیکی کوڕی کەلسوم بووە، دەگرێ و لەگەڵ خۆیدا دەیبات تا وەقفی دەرباری فلسی بکات، خودانی وشترەکە دەستەو دامێنی مالیك دەکەوێ تا نەیەڵێ وشترەکەی بەرن، مالیك سواری ئەسپێکی رووت دەبێت و نێزەکەی هەڵدەگرێ و بە تاو دوای سەیفی دەکەوێ،خزمەکارو وشترەکە لەلای فلس دەبینێ، مالیك بانگی لێدەکات:

– وشتری هاوسێکەم بەرەڵلا بکە!.

– تۆ خوایەکەت بە بچووك دەزانی؟

مالیك نێزە بە دەست هێرشی بۆ دەبات، کابرای خزمەتکار هەوسارەکە لە ملی وشترەکە دەکاتەوەو مالیك دەیگرێ و دەیبات، کابرای خزمەتکار پەنا وەبەر فلس دێنێ و لەلایەوە

دەوەسیّ و روو دەکاتە مالیك و هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوەو دەکەویّتە پاڕانەوە، و مالیك بە فلس نیشان دەدات و دەڵێت:

"ئەی پەروەردگار! مالیکی کوڕی کەلسوم ئەمڕۆ وشتریّکی جوانی لە تۆ سەندەوەو پەیمان شکێنی کرد. ئەی پەروەردگار تاکو ئەمڕۆ هیچ کەسێك ستەمی لە من نەکردبوو" و بە کوڵ و دڵ فلس لە مالیك هاندەدات و داوای لێدەکات کە مالیك دووچاری بەڵایەکی گەورە بکات.

عودەی کوڕی حاتەم لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا کە هاوڕێی بوو لە نزیکی فلس دانیشتبوون و هەردووکیان رووداوەکەیان دەبینی و ئەو قسانەیان دەژنەوت.

عودەی دەڵێت:

"بزانە ئەمڕۆ چی بەسەر مالیك دێت".

بەڵام رۆژان رادەبردن و هیچ نابیّ، عودەیش پەرستنی ئەوو بتەکانی دی تەرك دەکات و دەبیّ بە نەسرانی.

دیسان هەموو سەریان داخست و لە فکرانڕاچوون، هەورێکی تاریك نیشتبووە سەر سیمایان، ئەبوزەڕ هەستی کرد ئۆخژنێك لە دڵ و دەروون و روحی دەگەڕیّ.

ئەم چیرۆکە وەکو چۆن ئاوێکی ساردو سازگار بە جەرگ سووتاوێکی تینودا بڕێژن، بەو ئاوایە دڵی فێنك کردەوە.

کۆڕ بڵاوەیان لێکرد، هەموو لە دەوروبەری مەناتدا، لەسەر جێگای خۆ راکشان و وەنەوزو خەو پێڵوەکانی هێنانەوە یەك، پرخو هۆڕی خەو لە هەموو لایەکەوە هەستا، شەو هێدی و هێمن باڵی بەسەر هەموویاندا کێشا. بەڵام ئەبوزەڕ لەسەر جێگاکەی خۆی، روو لە ئاسمان راکشا بوو، و چاوەکانی بڕی بووە ئاسمان و بیری لەو چیرۆکانە دەکردەوە کە لە کۆڕەکەدا بیستبوونی، هەستی دەکرد باوەڕی بەم بتانەو تواناو خوایەتی ئەوان نیەو لە بن لێوانەوە ورتە ورتی دەکرد: ئایا مەنات جگە لە پارچە بەردێك کە نە کەسی پیّ رزگار دەکریّ و نەکەسی پیّ گومرا دەکریّ، زیاترە؟!.

لە ناکاودا بیرێکی بە مێشکدا هات، لە خەو رابوو، هێدی هێدی کەوتە ریّ تا گەییە مەنات و لە بەرانبەریا وێستا، سەیری کرد ئەمە نموونەی خامۆشییە، نە هەست دەکات، نە دەبیستیّ و نە دەبینیّ، هەر بۆ تاقیکردنەوە بەردێکی هەڵگرت و پێیدا کێشا، سەیری کرد هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، جگە لە دەنگدانەوەی پێکاکێشانی دوو بەرد، و نقومی هەمان گەوجێتی و حەپەسانی خۆیەتی.

بە رق و کینەوە گوتی:

"ئاخر تۆ بیّ توانای نەك توانا، خوڵقاوی نەك خاڵق، تۆ نە هێزێکت هەیەو نە توانایە، ئەدی بۆ چیت بپەرستن، و بۆچی مەرەکانیان بۆ تۆ بکەنە قوربانی و پێشکەشتی بکەن، تایفەکەی من لە گومڕاییەکی ئاشکرادا دەژین".

ئەبوزەڕ بە ئەسپایی بۆ سەر جێگاکەی خۆی گەڕایەوە، بە ئەرخایەنی پێڵوەکانی لێك نان و غەرقی خەوێکی قووڵ بوو.

سپێدە بزەیەکی کردو بووکی ئاسمان لە پەردە هاتە دەرێو بە دامێنە ناسکەکەی سەروو رووی نووستوەکانی نەوازش کردو مەنات پەرستەکانی خستە جمو جوڵو بێداری کردنەوەو مەنات بە دەقی خۆیەوەو لە شوێنی خۆی نقومی گەوجێتیو بێدەنگی بوو، نە هەستی بە هیچ دەکرد، نە هیچی دەبیست و نە هیچی دەبینی.
پیاو وژن  هەموو بۆ تەبەڕوك بە دەوریا سوڕانەوە، جگە لە ئەبوزەڕ کە خۆی نەکرد بە شەریکیانو پشتی تێکردنو سواری وشترەکەی بوو.
مەلی بیری بەم بوونە بەرینەدا دەفڕی، سەری بەرز کردبووەوەو لە بەرزیو شکۆی ئاسمانی دەڕوانی، لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەم ئاسمانە چۆن هەڵدراوە؟ کێ دروستی کردووە؟" روانیە خۆڕ دەتگوت شتێکی تازە دەبینێ، لە قولایی هاماجێکی بێ سنوورو کەنارو کەوشەناندا مەلەی دەکرد، بیری دەکردەوە کە چۆن لە سەرا پەردەکەی خۆی سەری هێناوەتە دەرو دەدرەوشێتەوەو بورج و مەزلانی خۆی دەبڕێ تا دەگاتە ناوەندی ئاسمانو لەوێندەرەوە نشێو دەبێتەوەو لە ئاسۆدا ئاوا دەبێت.
بیری دەکردەوە کە چۆن لە دوای ئەوە، شەوی تاریك دێتو ئەم ئەستێرە درەخشانانە کە روناکی هێدی و کپی خۆیان پەخش دەکەنەوە، دڕ بە  تاریکی شەو دەدەن.
نقومی بیرو خەیاڵێك بوو کە سەر قافڵەی یەقینو دڵنیایی بوو، بیرێك کە گومانی، وەکو ئاگرێك بەر بێتە پۆش، دەسووتاند.
تەواف تەواو بوو و هەموو ئامادەی رۆیشتن بوون، ئەنیس هات بۆ لای ئەبوزەڕو لە بەرانبەریا وێستاو دەمێ بێ ئەوەی زار هەڵێنێ لەسەروچاوی روانی، سەیری کرد نقومی شەپۆلی بیرەکانیەتی، هیچی نەگوتو لەگەڵ کاروانەکەدا بەرەو غیفار بووەوە، ئەبوزەڕیش وەکو خۆی کڕو کپ و بێدەنگ بە گەڵیان کەوت تا کاروانەکە بە دۆڵێکا نشێو بووەوە، نیگا پرسیاراوییەکانی بڕیە کۆسارەکانی دەوروبەر کە کێ ئەم کێوانەی بەرز کردووەتەوەو چۆن بەرزکراوەتەوە؟ دەتگوت ئەبوزەڕ بۆ یەکەمجار چاوی بەم جیهانەو موجیزاتەکانیا هەڵێناوە، روانییە زەوی: چۆن ئەم زەویانە ئاوا تەخت و هەموارکراون.
پیرو ئەندێشە لە کاسەی سەریا قوڵپی دەداو ژیان لە دڵیا رەوتێکی تازەی دەگرتە بەر، هەستی کرد تروسکەیەك لە نوری هیدایەت لە ناخی دڵیا پرشنگ دەداتو گەرم و رووناکی دەکاتەوەو دڕ بەو تاریکی و گومڕاییانە دەدات کە سالانێکی دوورو درێژ بوو تیایدا دەژیا.
ئەبوزەڕ، بەو دەقەوە لەگەڵ کاروانەکەدا دەڕۆیی تا گەییشتنە غیفار، پیاوو ژن لە وشترانی خۆ هاتنە خوارو ئەبوزەڕ ماتو بێدەنگو تەنیا یەکسەر بەرەو ماڵی خۆی شۆڕ بووەوە، ماڵێك کە وەکو گۆڕ، تاریکیو خامۆشییەکی مەرگبار حوکمی دەکرد، وەژوور کەوتو یەکسەر چووە جێگای خەوەوە تا ماندوویەتی رێگا دەربکاتو تۆزێك بخەوێ، لێ خەو لە چاوانی تۆرا بوو باڵندەی خەیاڵی لەم لاوە بۆ ئەولا دەفڕێ، هەندێ جار دەگەییە کەشکەلانی ئاسمانیو لە خۆی دەپرسی کە کێ هەڵیداوەو هەندێ جا لە زەوی دەڕوانی کە کێ رای خستووەو هەندەك گاڤیش لە خۆی رادەماو بیری لەو کەسە دەکردەوە کە ئەوی ئەفڕاندووەو چاوی داوەتێ کە پێی بدینێو

زوبانی داوەتیێ کە پێی باخفێ‌و سروشتێکی داوەتیێ کە سەرچاوەو ئیلهامبەخشی خێرو شەڕو خواناسی‌و گەندەڵییە، لە دڵی خۆیدا گوتی: "بێگومان ئافەرێنەی ئاسمان لە ئاسمان گەورەترەو خوڵقێنەری ئینسان لە خودی ئینسان مەزنترەو ئەوەی ئەم گەردوون‌و بوونە گەورەو سەیرەی چێکردووە، بێ چەندو چوون لە مەنات و لات و عوزەو ئەساف‌و نائیلەو سەعدو... هتد، شایستەتری پەرستنە، هەر ئەو ئافەرینەر،و داهێنەرو نێگارکێشی بەتوانایە،و ئەم بەردانە نە توانایان هەیەو نەداهێنان".

بەرە بەرە بۆی دەرکەوت کە خۆشی‌و شادیەك دڵی گرتووە، تیشکێك لە شادی، ئەو پەردە تاریکانەی کە دەستی گومانیان خستبووە سەر چاوانی دەدڕێت، ئاگری شەوق‌و تاسە بە جۆرێ لە گیانیا بڵێسەی سەند کە رونك کەوتە چاوانی‌و رژایە سەر زەوی‌و لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیاندا سوجدەی برد.

ئەبو زەڕ تینوی یەقین بوو، کەوتە تاقیبی هەمان سەرچاوە تا دۆزییەوەو کام‌و ئارەزووی دڵی تینوی خۆی لە ئاوی ساردو سازگاری حەقیقەت شکاندو پاراو کرد.

سەری لە سوجدە دوورو درێژەکەی هەڵبڕێ، و لە کاتێکا کە ئەشك و تنۆکە عارەقەی ساردی ئاوێتە بە یەکدی، سیما رەشتاڵەو دەستە لەڕو لاوازەکانی تەڕ کردبوو، گەڕایەوە ناو جێگاکەی، پڕتەوێکی مەلەکوتی ئاسمانی، سیمای رووناك کردبووەوەو گیانێکی خوایی تیا دەرکەوتبوو، چاوانی بیناو دڵی بێدار کردبووەوە، بەم گریانە کە لە یەکەم سوجدەی خۆیدا لەبەر بارەگای پەروەردگار کردی ئەو گرێیانەی کە سالأنێکی دوورو درێژ بینیان گرتبوو هەناسەیان تەنگ کردبوو، کرانەوەو ئەبوزەڕ ئەو شەوە لە هەموو شەوەکانی دی ئارامترو ئاسوودەتر خەوت.

سپێدە ئەنگوت، سەری قامکە ناسکەکانی بە هەموو شتێکدا دەهێناو دەستی بە دەرو دیواری جیهاندا دەکێشا تا کڵاو رۆژنەیەك بۆ ئەبوزەڕ، بەرەو ئەبەدیەت بکاتەوە. ئەبوزەڕ بە هێواشی رابوو هەردووك دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو بە دەنگێکی بە سۆزو تاسەمەندو دڵگیرەوە هاواری یەزدانی دەکرد، لەم کاتەدا ئەنیس وەژوور کەوت‌و سەیری کرد براکەی ئارام و گەردەن کەچ راوەستاوە، ویستی قسانی دەگەڵ بکات، لێ ئەم دیمەنە تازەو سەیرە بە جۆرێ سەرسامی کرد کە خۆی لە بیر کرد، وەستاو سەرسامانە دەیڕوانییە براکەی، و ئەو بە هەمان حاڵەتەوە بە جۆرێ لە رازو نیازی خۆی دەگەڵ دۆستە تازەکەیدا، ئەو دۆستەی کە تاقیب و سۆراخی زۆر بەوی ناساند بوو، و پاش هیجرانێکی دوورو درێژ بە ویساڵی گەیی بوو، نقوم بوو بوو کە هەستی بە هاتنی ئەنیس نەکرد، ئەنیس حەپەساوو سەرسام ئەنجام بە خۆ هاتەوەو گوتی: "چ دەکەی؟!"

ئەبو زەڕ رووی وەرگێڕاو براکەی بینی‌و گوتی:

– نوێژ دەکەم.

– بۆ کوێ؟

– بۆ خوا.

– یانی بۆ ئیلاه؟... خۆ نوێژ جگە لەبەر دەرگای نوهم یا مەنات دروست نییە.

– نە بۆ لات نوێژ دەکەم و نە بۆ هیچ شتێکی دیکە.

– ئەدی بۆ کێ نوێژ دەکەی؟

– ... من لە سروشتدا، لەم بوونە بێ سنوورەدا، نیشانەیەکم دۆزییەوە کە بەرەو خوایەکی جیا لە خواکانی ئێوەی بردم، خوایەکی مەزنە، بە توانایە، هیچ ئومێدێ نیە کە ئەقڵ‌و ئاوەز بتوانێ بگاتە سەرچاوەو بنج و بناوانی، یان بە گەنگەشەو کۆڵینەوە پەی پێ بەرێ‌و بیناسێت، هێزو نیرۆیەکە لە هەموو ئەوانە گەورەترەو مەحاڵە پەی پێ ببرێ.

– یانی نوێژ بۆ خودایەك دەکەی کە نە دەی بینی‌و نە پەی پێ دەبەی؟!

– پەیم پێ نەبردووە، بەڵام نیشانەکانیم دۆزیوەتەوە.

– شتێکی سەیرە! خوایەك کە بە بەرچاوتەوەیە، خواوەندانێك کە هەر کاتێ بتەوێ دەیان بینی، تەرك دەکەی، ئەم قسەیەی تۆ یەجگار سەیرە ئەبوزەڕ.

– ئەم خوایانە، هەندێ بەردن کە نە هیچ دەفامن و نە قازانج و زیان بە کەس دەگەیەنن.

– یانی ئەقڵی خۆمان‌و باب‌و باپیرانمان بە هیچ دەزانی؟

– ئەی ئەنیس! من گوناحم چیە کە باوانمان نەفام‌و نەزان بوونە، ئەم ئاینەی ئێمە ئەی ئەنیس یەجگار لاوازە، وەکو داوی جاڵجاڵۆکە سستە. وای دابنێ یەکێك لە ئێمە دەچێتە سەفەر، لە ڕێگەدا چوار دانە بەرد هەڵدەگرێ، یەکێکیان کە لەوانی دی جوانترە دەکات بەخوای خۆی‌و سێ دانەکەی تر دەکات و جاخ و کوچك ئاگری مەنجەڵی خۆراکەکەی، بەردێکیان دەکەین بە خوای خۆمان ئەمە چییە لامان جوانە، و بەردەکانی دی دەنەینە ژێر مەنجەڵەکەمان چونکە ڕەونەقیان نیە؟ ئاخر ئەمە زۆر سەیرە!

– ئێمە هیچ کاتێك لە سەفەرماندا کاری وا ناکەین، تەنیا بە مەبەستی پەیڕەوی لە کاری ماڵی کابە ئەم بەردانە هەڵدەبژێرین‌و دەنا خودی ئەو بەردانە نا پەرستین، بەڵکو لە جیاتی ئەساف‌و نائیلە، کە لە ماڵی کابەدا دانراون، دەیان پەرستین.

– ئەساف‌و نائیلە تەنیا دوو زیناکارن‌و هیچی دی. تۆ حەزەکەی دوو زیناکار بپەرستی؟

– ئەم قسەیە چیە ئەبوزەڕ؟

– ئەساف لە یەمەنا ئاشقی نائیلە بوو بوو بە دوو قۆڵی بە ناوی زیارەتەوە خۆیان بە کابەدا کرد، هەر کە خەڵکی چاویان غافڵ کردو ماڵ (کابە) چۆڵ بوو ئالکاوی یەکتر بوون، هێندەیان زینا کرد تا کوڵی دڵیان لە یەکتردا دامرکاندەوە، بەیانی ڕۆژی دوایی زیارەتکارانی کابە سەیریان کرد هەردووکیان مەسخ بوون. خەڵکی بۆ عیبرەت هەردووکیان لە کابەدا دانان، دوای ئەوەی ماوەیەکی فرە بەسەر ئەم ڕووداوەدا بوری، بوون بە خواو شایستەی پەرستن! ئەمانەن خواکانی ئێوە.* *[* لەو ئەفسانانەیە کە سەبارەت بە بتەکان لە نێو عەرەباندا باو بووە].*

– ئەدی دەربارەی ئەم هەموو پەرجووانەی کە لەوانەوە سەر هەڵدەدەن چ دەڵێی؟

– هیچ پەڕجوویەك لەوانەوە سەری هەڵنەداوەو سەریش هەڵنادات، ئەوانە نە هێزیان هەیەو نەتوانا، هەرچییەك بووە لەلایەن خواوە بووەو بە هەڵە داویانەتە پاڵ ئەوان... هیچ دوور مەڕۆ، دوێنێ چووینە زیارەتی مەنات‌و بە تەما بووین کە هەوران بێنێ‌و باران ببارێنێ، بۆ ڕازی کردنی

ئەو مەڕو پەزانمان کردە قوربانی، چی بۆ کردین؟ هیچی نەکرد، نەك لەبەر ئەوەی لێمان چووە بە قینا، یان گوناحی گەورەمان کردووە، یا درێغیمان لە جێبەجێکردنی کاروباری واجبو فەرزا کردووەو لێمان دڵگیر بووە، نا، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە هیچ کارێکی لە تواناداا نیە.

– بەسە... بەسە.... خەریکە باوەڕ بە قسەکانت بکەمو گومان لە خواکەمان پەیدا بکەم.

– ئەمە ئاواتی منە، ئەی ئەنیس من هیڤیدارم کە تۆش وەکو من لەمانە بتۆرێیو کاتێ کە دەتەوێ دوعا بکەی روو بکە ئەو خوایەی کە ئافەرێنەری زەویو ئاسمانانە.

– چما دەتوانین ئاینەکەمان وەکو چۆن جلە کۆنەکانمان لەبەر دادەکەنینو فڕێی دەدەین، بە ئاسانی تور بدەین؟

– ئەرێ ئەنیس، کە دینێك وەکو جلێکی کۆن بێ، ئەم کارە ئاسانە.

دایکیان رەملە* وەژوور کەوتو ئەوان بێدەنگ بوون، ئەوجا رووی تێکردن و گوتی:

– تەگبیرو رای کوڕەکانم چیە؟

ئەنیس: دەربارەی چی؟

دایکەکە گوتی: دەربارەی ئەم وەزعەی تووشی بووین. دەرگای ئاسمانمان لێ گیراوەو باران نابارێ، زەوی وشك بووەتەوەو قاتو قڕیو تەنگانەو دەستکورتیەکی سەخت رووی تێکردووین.

ئەنیس گوتی: تەگبیر، تەگبیری تۆیە.

– من پێم باشە بچینە لای خاڵتان، ئەو خاوەن پایەو سامانێکی زۆرە.

ئەبو زەڕ گوتی:

– تەگبیر، تەگبیری تۆیە، هەر چییەك ببێ لە خواوە دەبێ.

***** – رەملە: کیژی وەقیعەی خەڵکی غیفارە.***

# توڕه بوونی ئەبو زەڕ

***شەرم و پارسا یی و بێ فیزی ئەبو زەڕ هاوتای عیسای کوڕی مەریەمە.***

**(( محەمەد ))**

ئەبوزەڕو ئەنیس لەگەڵ دایکیاندا لە غیفار وەدەرکەوتن کە بۆ ماڵی خاڵیان بچن، ئەبوزەڕ لە دەوروبەری دەڕوانی، بە وردی بیری دەکردەوە، دەیڕوانییە هەرچیەك، گەورەیی ئافەرێنەرەکەی تیا دەبینی و زیاتر یەقین و دڵنیایی پەیدا دەکرد. لە ناکاودا دەرو دیوارانی مەککە دەرکەوت و وایان دەزانی بەو زووانە لە ناڕەحەتی و تەنگانە دەخەلەسن. وشترەکانیان دەنگداو تاودا تا هەرچی زووترە دوا قۆناغی تەنگانەو ڕۆژە ڕەشیان تەی بکەن و بگەنە شادی و ئاسوودەیی.

ئەبوزەڕو ئەنیس و دایکیان، گەیینە لای خاڵیان و کەوتنە خۆشی و ئیسراحەتەوە، ڕۆژگار ڕام بوو بوو و ژیان بە دەمیانەوە دەگرژییەوە، مودەتێکیان لەوێندەر بە ڕەحەتی و خۆشی ڕابواردو خاڵیان ئەم میوانانەی یەجگار لە دڵا شیرین بوون و حورمەتێکی فرەی دەگرتن و زۆری خۆش دەویستن. خێڵ، بەرەبەرە هەستیان کرد کە دۆستی و نزیکی زیادی ئەمانە لەوەوە، دەبێتە بایسی ئەوەی ئەوان لەبەر چاوی بکەون، ئیدی بەغیلی تەشەنەی کردو بوو بە کینەو کەرب و دژایەتیەکی توند، تا مەجلیسێك گیرا، شیرەت و راوێژیان کردو نەخشەو پیلانێکیان داناو پیاوێکیان راسپارد کە نەخشەو پلانەکە جێبەجێ بکات. ئەم پیاوە چووە لای خاڵی ئەنیس و ئەبوزەڕ، لە گۆشەیەکدا کڕو کپ دانیشت و بە جۆرێك سەری داخستبوو خۆی عێجزو خەمبار کردبوو کە هەموو کەسێکی دەخستە گومان و دوو دڵییەوە.

خاڵی ئەبوزەڕ پرسی: خێر بێ، چیە؟!

کابرا بە خەم و پەژارەیەکی دەستکردەوە گوتی:

– هاتووم شتێکی گرینگت پێ بڵێم، و ئەگەر لەبەر ڕێزو دڵسۆزیمان بۆ تۆ نەبوایە هەرگیز لێنەدەبڕاین کە ئەم هەواڵەت بە گوێدا بدەین و ئاگادارت بکەینەوە، بەڵام دڵسۆزی، ئێمەی بۆ لای تۆ بکێش کرد تا ئەو پەردە ئەستورەی کە بەسەر چاوانی تۆیاندا داوە بدڕین، ئەوەی لە پشتی تۆوە دەکرێ بدینی، ئەلهەقی مایەی داخ و کەسەرە کە دەبینین پاداشتی چاکە بەخراپەو پاداشتی کەرەم و بەخشش بە دزێوی و سپڵەیی دەدەنەوە!

خاڵی ئەبوزەڕ زانی کە ئەم ماستە مویەکی تێدایەو ئەمە حیکایەت و سەر بهوردێکی درێژی بە دواوەیە، زۆر پەشۆکا، هەستی بە نارەحەتی و پەرێشانیەکی فرە کرد، پرسی:

– رونتر قسەبکە، چ بووە؟

– ئەنیس...

– چی کردووە؟

– هـــەر كـــە تـــۆ لـــە مـــاڵ وەدەردەكـــەوی دەگـــەڵ ژنەكانتـــدا دادەنیشـــێت!

– نا، درۆیە، بوختانە!

– ئێمەش زۆرمان حەز دەكرد كە ئەم هەواڵە درۆو بوختان بوایە، بەڵام مەخابن راستێكە ئاو لێڵ ناكات.

– ئاخر بە چ بەڵگەیەك؟

– لە هەركێ دەپرسیت بپرسە، هەموو خێڵ دیتویانەو لەمە ئاگادارن، حەز دەكەی جگە لە من لە زمانی خەڵكی تریشەوە ئەمە بژنەوی؟

– نە، بەسە.

شەرمەزارو خەمین سەری داخست، ژانێكی بە سوێ دایە دڵی، وەكو ئەژدیهای تووڕە لە ماڵ وەدەركەوت، هەرچی كرد كە ئاگری غەزەببی دامركێنێتەوەو دڵی خۆی بداتەوە نەیتوانی، شەوو رۆژ نقومی خەمو پەژارەیەكی قوڵو بە سوێ بوو، لەوە بەداوە بە پێچەوانەی جارانەوە هەمیشە بە ساردیو خامۆشی دەگەڵ ئەنیسو ئەبوزەڕدا مامەڵەی دەكرد، و هەر كاتێ لە دەوری یەك دادەنیشتن ماتیو حیرەتێكی نهێنی ئامێز باڵی بەسەرا دەكێشان.

رۆژێك ئەبوزەڕ شوێنەواری ئەم پەریشانیو نیگەرانیەی لە چارەو سیمای خاڵیدا بینیو پەی بە پەژارەكەی دەرونی بردو پرسی:

– چیتە، چەند رۆژێكە نارەحەت دیاری، دەڵێی لە ئێمە بێزاری، كەم قسان دەكەیو زۆر لە فكران ڕادەچی؟!

– هیچ نیە.

– نا، هەڵبەتە شتێك هەیە؟ بیڵێ بەڵكو بتوانم خەمت سووك بكەمو بەشداری پەژارەو نیگەرانیت بكەم.

– خێڵەكەم، شتێكی زۆر خراپیان بۆ گێڕاومەتەوە!

– چییان گێڕاوەتەوە؟

– دەڵێن گوایە ئەنیس كارێكی قۆری كردووە.

– وەكو؟

– دەڵـێن هـەر كـاتێ مـن لـە مـاڵ وەدەردەكـەوم، ئـەنیس لـە جیـاتی مـن دەگـەڵ خێزانـەكانم دادەنیشێت.

دەموچـاوی ئـەبوزەڕ سـور بـووەوە، ئـاگری غـەزەب لـە هـەردووك چـاوییەوە، كـە بـوو بـوون بـە دوكاسەی پڕ لە خوێن، بڵێسەی دەسەند، گوتی: هەر چاكەیەكت كردبوو بە فیڕۆتدا، و لە ئێستا بە دواوە هیچ كاتێ پێكەوە كۆنابینەوە..

## سپێدە ئەنگوت

ئەنیس و ئەب زەڕ لەبەر ماڵەکەی خۆیاندا لە غیفار دانیشتبوون، پیاوێك لە ڕێوە هات، سڵاوی کردو لەلایانەوە ڕۆنیشت. ئەبوزەڕ پرسی:

– کوێندەریت؟

– مەکەیی

– خەبەرو باس؟

– پیاوێك هاتووە دەڵێت پێغەمبەرمو لە ئاسمانەوە هەواڵو سەرۆم بۆ دێت.

– ئەدی خەڵکەکە لەگەڵی چۆنن؟

– باوەڕ بە قسەکانی ناکەن، گوێی لێناگرن، ئەزیەتی دەدەنو لێی دوور دەکەونەوەو هەر کەسێك بەلایا بچێ هەڕەشەی لێدەکەن.

– باشە بۆ گوێ لە قسەکانی ناگرن؟

– چۆن گوێ لە کەسێك بگرن کە ڕەخنەیان لێدەگرێو گاڵتە بە بیروباوەریان دەکاتو باب و باپیرانیان بە گومڕا دەزانێو خواوەندەکانیان بەر جنێوان دەدات؟! سەیر ئەوەیە هەر یەك خوا بە خوا دەزانێ.

ئەبوزەڕ سەری داخستو بیری لە ڕستەی ((هەر یەك خوا بە خوا دەزانێ)) دەکردەوە، بیری لەم ڕستەیە دەکردەوە، بەڵام بەلایەوە سەیر نەبوو، چونکە هەمان ئەو شتەی لەم ڕستەیەدا دەبینی کە بە خۆی لە ئەنجامی رامانو وردبوونەوە لە گەردوونو بوون پێی گەییشت بوو، ماوەیەکی زۆر بەو دەقەوە لە فکران ڕاچوو، کابرای ڕێبوار تەماشایەکی ئەبوزەڕی کرد، کە بینی مات و بێدەنگ لە فکران ڕاچووە، دوعا خوازی کردو ڕۆیی.

ئەبوزەڕ رووی کردە ئەنیس و گوتی:

– سوار بەو بڕۆ بۆ ئەوێندەر، گوێ لە قسەکانی ئەو پیاوەی کە پێی وایە پێغەمبەرەو لە ئاسمانەوە سەرۆی بۆ دێتە خوارێ بگرەو بۆمی بگێڕەوە، بە جوانی قسەکانی هەڵگرەو بۆمی بێنەوە.

ئەنیس هەستا، سواری وشترەکەی بوو و مەککە خۆت بگرە وا هاتم. هەوەڵجار چوو بۆ کابە، تەواف کردو کۆمەڵە خەڵکێکی لەوێدا بینی. تووشی پیاوێك بوو و لێی پرسی:

– ئەرێ خەبەرو باسی ئەم شارە چییە؟

– پیاوێکی موڕتەدی لەدین هەڵگەڕاوە بانگەوازی ئاینێکی تازە دەدات.

ئەنیس هێشتا بە تەواوەتی ئەم قسەیەی نەژنەوتبوو، بە هەشتاو ڕۆیی، پیاوێکی بینی کە روو لە خەڵکەکە قسان دەکاتو دەڵێت:

**"سوپاسی خودا دەکەم، ستایسی ئەو دەکەم، بە ئومێدی یارمەتی ئەوم، باوەڕم بەوەو پشت بەو دەبەستم و شایەتی دەدەم کە جگە لەو هیچ خوایەکی دی نییە، بە تەنیایەو هیچ شەریکێکی نییە".**

**یەکێك لە ئامادەبووان گوتی: درۆ دەکەی.**

**ئەویش گوتی:**

**"پێشەنگ* درۆ لەگەڵ قەومی خۆیدا ناکات، بەو خودایەی کە هەر خۆی خودایە، من نێردراوی خودام بۆ لای ئێوە بە تایبەتی و بۆ هەموو خەڵکی بەگشتی، خودا وەکو چۆن دەخەون بەو ئاوایە دەتان مرێنێ، وەکو چۆن لە خەو رادەبن بەو ئاوایە زندووتان دەکاتەوە، لەسەر کردەوەی خۆتان لێ پێچانەوەتان لەگەڵ دەکرێ، بە چاکە پاداشتی چاکەتان دەدرێتەوە بە خراپە سزای خراپە دەدرێن، ئیدی یا بەهەشتی هەمیشییە یان ئاگری ئەبەدی"."١" .**

***[* پێشەنگ کەسێکە لەلایەن خێڵەوە رادەسپێردرێ بڕوات شوێنێکی لەبار بۆ ژیانی خێڵەکەی بدۆزێتەوەو قەومەکەی خۆی لێ ئاگادار بکاتەوە... ئەمە لە ناو عەرەبا بووە بە پەند }***

**یەکێك لەوانە گوتی:**

**– چۆن پاش ئەوەی بووین بە ئێسك و پروسکی رزیو، زندوو دەبینەوە؟**

**ئەو پیاوە گوتی:**

***"..... دەشڵێن: ئاخۆ ئەگەر ئێسك و پروسکیش بین، ژنۆ دروست دەبینەوە؟ بێژە کوچك یان ئاسن بن، یان چێبوێك لە خەیاڵی ئێوەدا زل دەنوێنێ. ئەوسا ئێژن: کێ زیندوومان دەکاتەوە؟ بێژە ئەوی یەکەمجار دروستی کردن، ئەوسا سەر دەلەقێنن و ئێژن: کەنگێ؟ بێژە شایەت بەم زوانە" .(سورەتی ئیسرا، ئایەتی ٤٩– ٥١).***

**ئەنیس وەستا بوو وگوێی دەگرت، ئەوەی بەر گوێی دەکەوت بەوردی ئەزبەری دەکرد، خەڵکی بڵاوەیان دەکرد. یەکێکیان گوتی:**

**– ئەمە کاهینە**

**– نە، شاعیرە**

**– نە، سیحربازە**

**ئەنیس بەدەم گوێ گرتنەوە لە پێغەمبەرو قەومەکانی، سەری دانەواند بوو، و لە فکران راچوو بوو، دەنگێك لە ناخیەوە دەیگوت:**

***"بە خودای قسەکانی خۆشن، بە خودا ئەو راست دەکات، ئەمانە درۆزنن" .***

**هەنگێ سواری وشترەکەی بوو و گەڕایەوە، بە درێژایی رێگا هەر بیری لە محەمەد دەکردەوە، ئەم واریقاتەی ئەوی پێ سەیر بوو، تا گەییشتەوە غیفار مات و بێدەنگ نقومی دەریای بیرکدنەوە بوو. ئەبوزەڕ بە غار بەرەو پیری براکەی چوو و بە نیگەرانی و پەرێشانی پرسی:**

**– هەواڵی چیت پێیە؟**

**– پیاوێکم بینی دەیگوت کە خوا ناردوویەتی و بانگەوازی بۆ چاکەو نەی لە خەراپە دەکرد.**

**– خەڵکی چی دەربارە دەڵێن؟**

– دەڵێن کاهین و شاعیرو سیحربازە، لە کاتێکا شاعیر نییە، چونکە من هەموو جۆرەکانی شیعر دەناسم و قسەکانیم دەگەڵ کێش و بەحرە جیاوازەکانی شیعردا بەراورد کرد، زۆر لێکدی دوورن، سیحربازیش نییە، چونکە من سیحربازانم دیوەو ئەفسون و جادوو تەڵسیانم دیتوە، کاهینیش نییە، چونکە کاهینانیشم دیووەو قسەکانی ئەو ناشوبهێتە سەر وێردی کاهینان و قافیەو سەروای قسەکانی ئەوان.

– چی دەڵێت؟

– قسەی سەیر دەکات.

– هیچ قسەیەکیت لە بیر نییە؟

– بە خودای جۆرە شیرینیەك لە قسەکانیا هەیە، بەڵام هیچیانم لە بیر نەماوە.

– خەبەری ئەسەحت بۆ نەهێناوم، تۆ لێرەبە من بە خۆم دەڕۆم بزانم خەبەرو باس چیە؟

– باشە، بەڵام خۆت لە قەومەکەی بپارێزە، چونکە دژمنایەتیەکی سەختی دەکەن و بەکەرب و کینەوە لێی دەڕوانن.

ئەبوزەڕ خۆی پێنەگیرا، کۆنە کوندەیەکی وشکی پڕ لە ئاو کردو سواری وشترەکەی بوو و کەوتە ڕێ، بە تاسەوە بەرەو ئارمانجی خۆی دەیڕانی، و دیمەنی جۆراوجۆر لە بەرچاویا بەرجەستە دەبوو، ئەم ئاینە تازەیە مژولی کردبوو و غەرقی شەپۆلانی هزرینی کردبوو: بۆ کوێ دەڕوات؟ چۆنی بگاتە ئەم پیاوەی خەڵکی بۆ ئاکاری بەرز، ڕەوشت بەرزی بانگ دەکات؟ کێ دەیباتە نك وی؟ ئەگەر تاقیبی بکات ئایا لە شەڕی دژمنەکانی دوور دەبێت؟... ئەنجام بڕیاریدا یەکسەر بۆ مزگەوت بڕوات و لەوێ تاقیبی پێغەمبەر بکات.

ئەبوزەڕ گەییە مەککە، چووە مزگەوت، و کەوتە سۆراخی پێغەمبەر. لێ نە دۆزییەوەو نە هیچی دەربارە ژنەوت، ناچار لە مزگەوتا مایەوە تا خۆر ئاوا بوو، شەو دێت، تاریکی دێت و کپی و کڕی و بێدەنگی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. هەموو خەوتن و جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم کەسی دی بەدەوری کابەدا تەواف نەدەکرد. لەم کاتەدا عەلی بۆ تەواف وەژوور کەوت و لە سوچێکی مزگەوتدا کابرایەکی کەڵەگەتی داڵەگۆشتی باریك و بنێسی بینی کە مێزەرێکی ڕەشی لەسەر ناوەو خۆی لەعەبایەکی کۆنی شڕەوە پێچاوەو بێدەنگ دانیشتووە. لێی چووە پێشێ و گوتی:

– دەڵێی غەریبی؟!

– بەڵێ.

– میوانی من بە

عەلی و ئەبوزەڕ بە دوو قۆڵی وەڕێ کەوتن، ئەبوزەڕ هیچی لێ نەپرسی. عەلیش چ قسەیەکی دەگەڵ نەکرد تا گەیینە ماڵەوە، ئەبوزەڕ ئەو شەوەی لەوێندەر ڕابوارد. سپێدە زوو کوچەو بازاران بۆ پێغەمبەر دەگەڕا، تا گەییە مزگەوت، نە کەس لێی دەپرسی و نە هەواڵێکی زانی، تاقیبێکی زۆری کرد، ئەو ڕۆژەش تەواو بوو، نە توێشوی دەگەڵ خۆدا هێنا بوو نە پارەیەکی پێ بوو خواردنێ بکڕێت. شەو دەواری هەڵدا، برسێتی ئازاری دەدا، غەریبانە چوو لە هەمان شوێنی دوێ شەوی خۆی ڕاکشا، عەبایەکەی لە خۆوە پێچاو بە دەم چاوەڕوانی خەوەوە بیری لە

چارەنووسی نادیاری خۆی دەکردەوە، عەلی ئەمجارەش بەلایا رەت بوو، کە ئەوی بینی هەڵوەستەیەکی کردو گوتی:

– هێشتا وەختی ئەوە نەهاتووە کە ماڵەکەی خۆت بناسیتەوە؟هەستە لەگەڵ منا وەرە.

عەلی هەڵیساندو بە دوو قۆڵی میناکی دوێ شەو، کرو کپ بەرەو ماڵ رۆییشتن.

شەوی سێیەمیش عەلی میوانەکەی خۆی بۆ ماڵ بردەوەو ئەبوزەڕ هەر بێدەنگ بوو تا عەلی پرسی:

– پێم ناڵێی چ کارەیت و چ شتێك تۆی گەیاندووەتە ئەم شارە؟

– ئەگەر بە کەس نەڵێیت و سۆزم بدەیتێ کە رێنوێنیم بکەی پێت دەڵێم.

– زۆر باشە.

– بیستوومە پیاوێك لێرە هەیە کە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکات. برایەکەم نارد بۆ تاقیب تا قسەی دەگەڵ بکات، رۆیی و گەڕایەوەو خەبەرێکی ئەوتۆی بۆ نەهێنامەوە کە سوکنایی بە دڵم ببەخشێت، ئیدی لێبڕام بە خۆم بیدینم، نە دەیناسم و نە دەوێرم سۆراغی بکەم.

تروسکەیەکی شادی لە چاوانی عەلییەوە هەڵهات کە سیمای روناك کردەوە، بزەیەکی ناسك کەوتە سەر لێوی، کەمێك لە ئەبوزەڕ ورد بووەوەو گوتی:

– تۆ کێی و لە کوێوە دێی؟

– ناوم جوندوب جنادەیە* و لەقەبم ئەبوزەڕەو لە خێڵی غیفارم

*[* جیاوازی دەربارەی ناوو شۆرەتی ئەبوزەڕ هەیە، ئەبول زەڕیشی پێ گوتراوە، بەڵام زیاتر بە ئەبو زەڕ مەنشورە ]*

– بە ئاواتی خۆت گەییشتی! بەخوا ئەو پێغەمبەرەو ئەوەی بۆی هاتۆتە خوارەوە هەقەو من ئێستا بۆ لای ئەو دەچم**، تۆش دوام بکەوەو چوومە هەر شوێنێکەوە تۆش وەرە، ئەگەر لە رێگەدا کەسێکم بینی کە خەتەرە تۆ بدینێ، من روو لە دیوار دەوەستم وەك ئەوەی پێڵاوەکانم چاك بکەم، و تۆ بەلاما تێپەڕە.

*[** هەندێك گوتوویانە عەلی گوتی سبەی بەیانی دەچینە لای پێغەمبەر ].*

عەلی و ئەبوزەڕ بە ناو تاریکی شەودا کەوتنە رێ، ئەب زەڕ هەستی کرد شادیو خۆشییەکی تایبەتی سەراپای گیانی دەگرێ، هەر ئەم هەوڵە سەرکەوتووە بوو کە ئەوی کرد بە یەکێك لە هەڵبژاردەکانی پێغەمبەری خواو کردی بە یەکێك لە پێشەنگانی ئیسلامو فاکتەرێکی کاریگەریی پەرەسەندن و شکۆی ئیسلام.

عەلی لەبەر دەرگای ماڵێکی نزیکی سەفا وەستاو بە گوێرەی قەرارێکی پێشوەختە بە شێوەیەکی تایبەتی لە دەرکەی دا، کەسێك لە پشت دەرگاکەوە روانیە دەرێ، عەلی ناسییەوەو دەرگاکەی ڤەکرد، عەلی و ئەبوزەڕ وەژوور کەوتن، ئەبوزەڕ لە خۆشیا دەلەرزی و دڵی بە جۆرێ لە سینەیدا لێی دەدا کە دەنگی دەژنەوت، تەنیا چەند هەنگاوێك لە مەحبوب و خۆشەویستەکەی خۆیەوە دوور بوو، بە ئارەزووە دێرینەکەی خۆی گەیی، لە دڵی خۆیدا سیمای پێغەمبەر، تەرزی گوتاری، چۆنیەتی مامەڵە دەگەڵ ئەوو ئەو بابەتانەی کە دەبوا لەگەڵیا باسی بکات، لەبەر چاوی خۆی

بەرجەستە دەکردو خۆی بۆ رووبەڕوو بوونەوەی کارێکی گەورە ئامادە دەکرد، کاتی دیدار نزیك دەبووەوە. عەلی خۆی وە ژوورا کرد، ئەبوزەڕیش بە دوایا وەژوورکەوتو چاوی بە محەمەد کەوت.

– سەلام و عەلەیکوم*

*[ئەبو زەڕ دەڵێت ئەم سەلامەی من یەکەمین سەلامە کە لە ئیسلامدا کراوە.]*

– عەلیکەسەلام وەرەحەمەتوڵڵاهی و بەرەکاتهو... کوێندەری؟

ئەبوزەڕ بە دەنگێکی شەرماوی‌و سووك بەرسڤی دایەوە؟

خەڵکی غیفار.

پاشان گفتوگۆ لە نێوان پێغەمبەرو ئەبوزەڕدا دەربارەی کۆمەڵێك بابەتی جیاواز کراو لە کۆتایی دا ئەبوزەڕ بە تۆنێکی ئارامی پڕ لە دڵنیایی گوتی:

– ئیسلامم پێ نیشان بدە!

– ئیسلام ئەمەیە کە گەواهی بدەی خوا یەکەو محەمەد نێردراوی ئەوەو نوێژ بکەی.

– گەواهی دەدەم کە خوا یەکەو محەمەد نێردراوی ئەوە...

– ئەبو زەڕ! ئەم مەسەلەیە لای خۆت بپارێزەو بگەڕێوە بۆ وڵاتی خۆتو لە ناو قەوم و قیلەی خۆتا جاڕی بدە، چونکە من دەترسم ئەمانە بتکوژن، هەر کاتێ هەواڵی دەرکەوتنی ئێمەت پێ گەیی وەرەوە.

پێغەمبەر لە ترسی ئەوەی قەومەکەی ئازاری ئەو پیاوە نەدەن، ئەم قسەیەی کرد، بەڵام ئایا ئەبو زەڕ گوێی لێیە، قەبوڵ دەکات؟ ئەبوزەڕ چۆن دەتوانێ ئیمان و باوەڕی خۆی وەشێرێو ئەو ئاگری باوەڕەی کە لە ناخی ناخیەوە بڵێسە دەسەنێ بشارێتەوە؟ نە بەخوا، ئەبوزەڕ بە هەر نرخێ بووە باوەڕی خۆی ئاشکرا دەکا. ئەبوزەڕ بە تۆنێکی مکومی ئەوتۆوە کە متمانە بە دین‌و پشت بەستن بە پەروەردگاری پێوە دیار بوو گوتی:

"قەسەم بەو کەسەی کە بە هەق تۆی ناردووە لە قەرەباڵغیدا لە ناو ئاپۆڕای خەڵکیدا بانگەواز دەکەم"!

ئەبوزەڕ هەستی کرد کە تینویەتی شکاوەو هەتاوی ئیمان لە تاریکایی دڵیەوە گزنگی داوە، غەرقی شکۆو جازیبەی پێغەمبەر بوو بوو، دەیویست بزانێ ئایا ئەم سەرچاوەی نورو ژیانەی کە ئەوی لە گومڕایی دەرباز کردووەو ئارەزوو وکامی تینویەتی ئەوی پاراو کردووە چۆن بوونەوەرێکە؟ لە نوورە؟ جەستەیە؟ بوونەوەرێکی ئاسمانی و فریشتەییە یان بەشەرێکی ئاسایی؟ بە ئەسپایی دەستی بردو خستیە سەر شانی محەمەد، لە پڕ هەستی کرد تەزوویەك لە نوور بە گیانیا دەڕواتو شادی و متمانەو رزگاری سەرانسەری بوونی دەگرێت.

ئەبوزەڕ هەستاو بەرەو مزگەوت رۆیی، بە سینەی تەژی ئیمان‌و دڵی پڕ لە مکوڕی و پێ داگری، بیری لە دژواری نەدەکردەوەو لە چ کەسێکیش نەدەترسا. لە مزگەوتا کۆمەڵێکی لە قورەیشان بینی، لە ناکاو هاواری کرد: "خەڵکی قورەیش من گەواهی دەدەم کە خوا یەکەو گەواهی دەدەم کە محەمەد بەندەی نێردراوی ئەوە".

ئەبو زەڕ پێنجەمین کەس بوو کە لە ڕۆژگاری غوربەتو سەختی ئیسلامداو لەو هەلو مەرجە ترسناکەدا دەستی یارمەتی بۆ پێغەمبەر درێژ کردو، هێشتا ڕاپەڕینی تازەی ئیسلام ئەوەندەی هێز پەیدا نەکردبوو کە گوێی خەڵکی بەمجۆرە هاوارو بانگە دنە ئامێزو دروشمە توندانە ئاشنا بکات، لەبەر ئەمە ئەو بانگەوازەی لە گەرووی مەردانەی ئەبوزەڕ هەستا، بە جۆرێ ڕقی هەستاندن کە بە قەستی کوشت بە سەریا ڕژانو بەوپەڕی توندی دەیانویست بە کوشتنی ئەم ئاژاوەچیە ترسناکە! بۆ هەمیشە ئەم بانگەوازانە خەفە بکەن.

ئەبوزەڕ بێ هۆش تەختی عاردی بوو بوو و خەڵکی بەردەوام شاپ و پێ لەقەیان بەسەرو سینگ و لاتەنگەکانیا دەکێشا تا عەباسی مامی پێغەمبەر هاتو بە هەزار زەحمەت لە نێو خەڵکەکەدا فریای کەوتو خۆی بەسەریا داو هاواری کرد:

واوەیلا بە حاڵتان! ئەم پیاوە دەکوژن؟ چما نازانن غیفارییەو کاروانی بازرگانیتان بۆ شام بەوێندەرا تێ دەپەڕێ؟*... خەڵکەکە لێی تەکینەوەو ئەبوزەڕ وەکو پەیکەرێکی خلتانی خوێن بەزەحمەت هەستاو هێدی هێدی کەوتە ڕێ تا گەییە بیری زەمزەم و خوێنو خوڕەکەی لەشی شت و کەمێك ئاوی خواردەوەو بە نیازی ماڵی خوا کەوتەوە ڕێ.

*[* پیاوانی غیفار ڕێیان لە کاروانان دەگرت و کاڵای بازرگانیان تالان دەکردو خێڵی غیفار زۆر جار جەندەب بن جنادەشیان لەم تالانیانەدا بە شمشێرەوە دیتووە].*

ئەبوزەڕ چووە نك پێغەمبەرو ئەبوبەکری لای ئەو بینی

– لە کەیەوە لێرەی؟!

– سێ ڕۆژە.

– ئەدی کێ نانی دەدایتێ؟

– جگە لە ئاوی زەمزەم هیچ خواردنێکی دیم نەبووە.

– ئەی پەیامبەری خودا! ڕێم بدە من ئەمشەو نانی دەدەمێ.

بە سێ قۆڵی کەوتنە ڕێ تا گەیینە بەر ماڵی ئەبوبەکر، ئەبو بەکر دەرگای کردەوەو وەژوور کەوتن، و چەند مشتێك مێوژی لەبەردەم میوانەکانی خۆیدا داناو ئەمە یەکەم خواردن بوو کە ئەبوزەڕ لە مەکە خواردبووی.

ڕۆژ بووەوە، ئەبوزەڕ لە دڵی خۆیدا هەستی کرد زۆری حەز لێیە کە ئیسلامبوونی خۆی ئاشکرا بکات، دڵی چکۆلەو سینەی ڕەق و تەقی ئەو نەیدەتوانی ئەو ئاگرە هەڵایساوەی ئیمانە لە خۆیدا وەشێرێ. شەق و تێ هەڵدانی خەڵکەکە هێندەی دی ورەیان بەرزو باوەڕیان بتەو کردبوو، چوو بۆ مزگەوت و دیسان بە هەموو هێزو توانایەوە هاواری بە سەر خەڵکەکەدا کرد:

هۆ قورەیشینە!... خەڵکی قورەیش!..

خەڵکەکە ڕوویان تێکردو ئەبوزەڕ لە ناخی دڵەوە هاواری کرد:

– من گەواهی دەدەم کە خوا یەکەو محەمەد نێردراوی ئەوە.

غەڵبە غەڵبێك لە ئاپۆڕاکەوە هەستاو بەسەریا ڕژانو تێڕو پڕیان دارکاری کرد، تا بورایەوەو کەوتە سەر زەوی. ئەمجارەش عەباس فریای کەوتو بڵاوەی بە خەڵکەکە کردو دڵی دایەوەو

نەوازشی کرد. ئەبوزەڕ لە تاو ئازار ئاهێکی هەڵکێشا، بەڵام هەستی بە ئاسودەیی و ئاسایشێکی روحی ئەوتۆ دەکرد کە ئازارو ژانی جەستە لاوازەکەی لە بیر بردەوە، هەستاو بەرەو لای پێغەمبەری خۆشەویستی کە تاقە ئومێدی ئەو بوو لە مەککەدا، رۆیی.

ئەبوزەڕ حاڵەکەی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، پێغەمبەر گوتی: من بۆ شوێنێ دەچم کە باخی خورمای هەیەو پێم وانیە جگە لە یەترب* شوێنێکی دی بێ، ئایا تۆ لە ناو خێڵەکەی خۆتا دەبی بە نوێنەرو تەبلیغکاری من؟ شایەت خوای مەزن بە هۆی تۆوە سوودێك بەوان بگەیەنێ‌و بە هۆی ئەوانەوە پاداشتێك بە تۆ ببەخشێت.

*[*- یەترب: ناوی پێشینی مەدینەیە. ]*

- بەڵێ، دەیکەم.

ئەبوزەڕ بە دڵێکی تەژی ئیمان بە خواو مەزنی محەمەد، پێغەمبەری ئەو، بەرەو غیفار کەوتە ڕێ، بە دەم ڕێوە بیری لە بەسەر هاتەکەی خۆی، لە برسیەتی، لە ئازارو ئەشکەنجە، لە دیداری پێغەمبەرو ئەوەی لەم سەفەرەدا دیتبووی دەکردەوەو ئایندەیەکی گەورە بەڵام نا دیارو بە تەمتومانی لە بەردەم خۆیدا دەبینی، شادییەك رووی دەگەشانەوەو بزەیەکی پڕ لە خۆشی و ئەرخایەنی بەسەر لێوییەوە دەگیرسایەوەو پەیتا پەیتا شوکرانەی خودای دەکرد کە ڕێگەی ئاینێکی لوژێکی و ئاوەزپەسندی دۆزیوەتەوە کە گیانانی پاك و پڕ سەفا رووی تێدەکەن، کە لەم دینەدا، بیروباوەڕی بە باچووی باب و باپیرانی دەبینی‌و بچووکی هزرو بیری ئەوانی کەشف دەکرد، هەستی بە ئازادی‌و کرانەوەیەك دەکرد، لە دوورەوە غیفاری بینی‌و بە دیداری برایەکەی‌و دایکی ئۆخژنێکی پڕ تاسەی لە دڵ و دەروون گەڕا، دەیویست بەزووترین کات خۆی بگەیەنێتە ئەوان‌و لە ئیسلام بوونەکەی ئاگاداریان بکاتەوە.

وشترەکەی دەنگ داو تاوی دا تا گەییە غیفار، لە وشترەکەی دابەزی، هەوسارەکەی گرتە دەست و بە دووی خۆیا رایدەکێشا، کە گەییە ئەنیس هاواری کرد:

- ئیسلام بووم و باوەڕم هێنا.

- ئیسلام بوویت و باوەڕت هێنا؟!

- بەڵێ ئەنیس، ئاینەکەی لەسەر هەقە، و داوات لێ دەکەم وەرە سەر ئەو دینە.

ئەبوزەڕ دەستی بە گێڕانەوەی سەربوری خۆی‌و ئەوەی، لەو ساوە کە لە غیفار دەرچووەو تا ئێستاکە گەڕاوەتەوە، بەسەری هاتووە، شەرح و شرۆڤە کرد.

ئەنیس بۆ دەمێك سەری داخست، ئەو قسە خۆشەی کە لە پێغەمبەری ژنەوتبوو، لە گوێیدا زرینگایەوەو یادگاری ئەو رۆژەی کە چوو بووە مەککەو ئەوی بینی بوو لە مێشکیدا بێدار بووەوە، لە دڵا هەستی بە نەشئەیەکی خۆش کرد، سەری هەڵبڕی‌و گوتی:

- من دژی ئاینەکەی تۆ نیم... وا منیش ئیسلام بووم‌و قەبووڵم کرد.

- وەرە با بچینە نك دایکمان‌و خەبەری بدەینێ.

ئەبوزەڕو ئەنیس چوون بۆ لای دایکیان، و کە چاوی بە ئەبوزەڕ کەوت گوتی:

- چیت بینی؟

- پیاوێکم بینی کە لە جوامێری و مەردی و رەندی دا بالاترین‌و لە خوو رەوشتا باشترین لە موعاشەرەت دا گەورەترین و لە قسەو باسدا چاکترین و لە خوێنساردی و پشوو درێژی‌و دروستکاری دا مەزنترین کەسی ناو قەومی خۆی بوو، و دوورترین کەس بوو لە دزێوی و موزێرییەوە.. قەت جنێوێکی لێ نەبیستراوە، کەس نەیدیوە شەڕو قەرقەشەی بوو بێ، لەبەر ئەمە (ئەمین) یان ناو ناوە، خەڵکی بۆ چاکە هاندەداو، دزێوی‌و خەراپەیان لێ قەدەغە دەکات، من گەواهیم داوە کە جگە لە ئەڵلا هیچ خوایەکی دی نییەو محەمەد بەندەو نێردراوی ئەوەو ئیسلامم لەگەڵ خۆدا هێناوەو ئەنیسی براشم موسوڵمان بووە.

- منیش دژی دینەکەی ئێوە نیم....ئەوا تەسلیم بووم و باوەڕم هێنا.

ئەبوزەڕ بە موسوڵمان بوونی خانەوادەکەی یەجگار شاد بوو، بەڵام ئاخۆ ئەبوزەڕ بەوەندە دادەسەکنێ "ئایا بەوەی بڕوات لە پەستوو وچخانەیماڵەکەیدا خەریکی عیبادەت بێ، خوای رازی کردووە؟" ئەبوزەڕ کاری وا ناکات دەبێ بڕوات‌و بانگەوازی ئاینی خوا لە نێو خێڵەکەیدا بکات.

ئەبوزەڕ لە ماڵ وەدەرکەوت‌و سەیری کرد خەڵکی لە دەوری سەرۆکی خێڵ (خەفاف کوڕی ئیمای کوڕی روخسەی غیفاری) دانیشتوون‌و لە هەزار ئاش دەکەن وهیچی ناماڵنەوە. خۆی بە ناوا کردن، سلاوی کردو لە سوچێکا رۆنیشت، نەك بۆ سوعبەت‌و پێکەنین، بەڵکو بۆ ئەوەی لە گزنگدانی رۆژێکی تازەیان ئاگادار بکاتەوە، لە رۆژو سپێدەیەك کە بەو زووانە لە تاریکییەوە بەرەو دەریایەك لە روناکیان دەبات و لە نەفرەت‌و زیللەت ئازادیان دەکات‌و بەرەو لوتکەی بەرزی سەروەری‌و ئازادی‌و سەروەتیان دەبات.

گفتوگۆی بەینی ئەوان وەکو ئێوارە شنەیەکی هێمن‌و خۆش لە گەڕدا بوو کە ئەبوزەڕ لە پڕا حیکایەتەکەی خۆی هێنایە مەیدان‌و تۆفانێك هەستاو گژەبایەکی ساردو شێتانە هەڵیکردو ئاژاوەو فەرتەنەو قەرقەشەو گەنگەشەو دەمەقاڵ لە هەموو لایەکەوە دەستی پێکرد، ئەم تۆفانە وردە وردە هێور بووەوەو نوری هەق تاریکی نەهەقی رەواندەوە، هەق سەرکەوت، ئەبو زەڕ گوتی:

- لە مەککەدا پێغەمبەرێ رابووە کە خەڵکی بۆ پەرستنی ئافەرێنەری ئەم ئاسمانە ساف و بێگەردو ئەم زەوییە پان و بەرینەو ئەم ستێرە پرشنگدارو بەجریوانە بانگ دەکات‌و...

یەکێك قووت بووەوەو قسەکەی بڕی و گوتی:

- باشە تۆ جگە لە لات‌و عزەو هیبەل و مەنات و نوهم، باوەڕت بە خوایەکی دی هەیە؟!

- ئەو داوا لە خەڵکی دەکات خۆیان لە پەرستنی ئەم بەردە رەقانە رزگار بکەن.

یەکێکی دی گوتی:

- بەردی رەق؟! تۆش قسەکانی ئەو دەکەی؟

- بەڵێ ئەمانە بەردی رەقن، نەخێریان هەیەو نە دەتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن.

یەکێکی دی گوتی:

- تۆش باوەڕت پێ کردووە؟

– ئەو جاڕی ئاینێ دەدات کە دەچێتە ئەقڵەوەو ئارامیو ئاسودەیی بە ویژدان دەدات، ئەو داوای برایەتیو یەکسانی لە بەینی خەڵکیدا دەکات. ئاغاو بەندە لە لای خوا یەکەو فەرقیان تەنیا لە باوەڕو کردار دایە، ئەو ڕێگەی نێوان خواو ئافەریدەی کردووەتەوەو هەموو جۆرە واسیتەیەکی نێوان خواو بەندەی لابردووە، بەندە دەتوانن بێ هیچ واسیتەو شەفاعەتکارێك لە خوا نزیك ببنەوە، ئەو دەڵێت خوا لە بەندەکانی خۆیەوە نزیکە، سکاڵاو داخوازییەکانیان دەژنەوێ،و ئاگای لە نهێنییەکانی دەروون و ویژدان هەیە، محەمەد جاڕی ئاینی هەق دەدا، ئیدی من چۆن باوەڕی پێ نەیەنم؟!

– ئەبوزەڕ گومڕا بووە!...

ئەبوزەڕ گوتی:

– قەسەم بە خوا ئەبوزەڕ ڕێگەی راستی دۆزیوەتەوە. و ئێوە گومڕان.

یەکێکی دی بە توڕەیی و توندی گوتی:

– ئەبو زەڕ لەوەتای ئەم پیاوە موڕتەدەی دیتووە هەڵخەڵەتاوەو وەکو ئەو لە دین وەرگەڕاوەو گاڵتە بە بیروباوەڕی بابو باپیرانی دەکات.

ئەبوزەڕ گوتی:

– سەبرکە، ڕێگەم بدە! من بەر لەوەی پێغەمبەری خوداش بدینم هەر باوەڕم بە لات و عزەو مەناتو هیبەل و نوهم و هەموو بتەکانی دی نەبوو، بە خۆم زانیم کە ئەمانە کۆمەڵە کەڤرێکن نە دەتوانن ڕێی راست بە کەس نیشان بدەن و نە کەس گومڕا بکەن.

لە هەموو لایەکەوە هەراو هەنگامە بەرز بووەوەو پیاوانی غیفار دژی ئەم ئیرادانەی کە لە خوایەکانیان دەگیران دەنگیان بەرز کردەوە.

ئەبوزەڕ بە تۆنێکی بتەو وهێمن گوتی:

– پێویستە بە هێمنی قسان بکەین و بچینە بنجو بناوانی شتان، بە بەڵگە، پوچەڵێ بکەینەوە، من جگە لە ڕێنوێنی ئێوە چ شتێکی دیکەم ناوێ، ڕێم بدەن پێتان بێژم کە چۆن پەیم بە بێ دەسەڵاتی ئەم بتانە برد.

یەکێکیان گوتی:

– نە، ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێت.

ئاپۆڕاکە کەوتنەوە هەراو زەنا، خەفافی سەرۆکیان گوتی:

– وازی لێ بێنن قسەی خۆی بکات، هەق روون و ئاشکرایە، کەس ئەقڵی لێ نەسەندوون.

ئەبوزەڕ گوتی:

– ڕۆژێ هاتم کە شیر بۆ نوهم بێنم، بەوپەڕی گوێڕایەڵیو ملکەچی و بێ فیزییەوە مەشکەیەك شیرم هەڵگرت تا پێشکەش بەوی بکەم، دەمویست بەم کارە توڕەیی دامرکێنمەوەو ڕەزایەتی بە دەست بێنم، کە شیرەکەم لە بەردەمیا دانا ویستم بگەڕێمەوە، لە پڕ چاوم بە بتەکەم کەوت و دیمەنێکم بینی کە تا ئەو کات رووداوی لەوە ترسناکترم نەدی بوو، سەیرم کرد سەگێك بەو پەڕی بێ منەتی و بێ پەروایی ئەو شیرەی کە لەبەر بارەگای ئەم خوایە! دانراوە، دەخواتەوەو ئەویش

حۆل و گێلو نقومی حیرەت بووە، نە هیچ دەبینیٚو نە بۆ پاراستنی ئەم شیرە پیرۆزە هیچ کاردانەوەیەك دەنوێنیٚ. کەمێك سەبرم کرد تا بزانم ئەنجام چ دەبیٚ، دیمەنێکی تاڵترو ترسناکتر لەوەم بینی، سەیرم کرد ئەم سەگە هەر بە دزینی مەشکەکەی ئەم بتە رازی نەبوو، بەڵکو لاقی لیٚ هەڵبڕیو پێیدا میزی!! ئەمەیە تواناو عیزەت و هێزی نوهم و ئەمەیە شکۆو گەورەیی، ئەمەیە تواناو دەسەڵاتی! هەموو سەریان داخست و بێدەنگیەکی مەرگ ئاسا باڵی بەسەریاندا کێشا، ئەبوزەڕ گوتی:

ها! خەریکە دڵتان لە ئیمان بەم خوایە هیچو زەبوونە خاڵی دەبێت و ئەو گومڕاییەی کە تیایا نقوم بوو بووین، لەبەر چاوتان ئاشکرا دەبێت.

یەکێکیان گوتی:

– کیٚ دەزانیٚ کە ئەم پێغەمبەرەی تۆ باسی دەکەی راستگۆیە یان درۆزن؟

ئەبوزەڕ گوتی:

– بەر لەوەی من نێردراوی خودا بدینم ئەم پرسیارەم لە خۆم کرد، بەڵام کە دیتم درۆم لە سیمایدا نەبینی.

هەمان پیاو گوتی:

– هەر کاتیٚ خۆی هات هەنگیٚ قەرار لەسەر پەیام و بانگەوازەکەی دەدەین

ئەبوزەڕ گوتی:

– ئەو داوای چاکەو بەرزی ئەخلاقتان لێدەکات. داواتان لێدەکات دەگەڵ یەکدا دڵنەرم و دلۆڤان و بە سۆزو بەزەیی بن، چاکە بکەن، کیژانتان زیندە بەچاڵ مەکەن، ئاخر تاوانی کیژێکی چکۆڵەی بیٚ گوناح چیە لە چاڵ بنریٚ؟ ئەو بۆ خۆشبەختی دنیاو شادمانی قیامەتی ئێوە هاتووەو نێردراوە.

ئەبوزەڕ دەستبەرداری داواکەی خۆی نەبوو تا سەرۆکی خێڵ، خەفاف کوڕی روخسە موسوڵمان بوو و گەلێك لە خەڵکەکەش چاویان لە سەرۆکەکەیان کردو ئیسلام بوون. ئەبوزەڕ دەیوست کارەکە یەك لایی بکاتەوەو تەماحی کردە موسوڵمان بوونی ئەوانی دیکەشو گوتی:

– ئێوە بۆچی سڵ لەوە دەکەنەوە کە ئیمان بە ئایینی خوداو نێردراوەکەی بێنن؟

ئەمجارە بە توندی بەرسڤیان نەدایەوەو بە درۆیان نەخستەوە، چۆن دەیانتوانی بە درۆی بخەنەوە؟ چونکە نە هەق کەوتبووە ئاویلکەدانو هەق لە جێی خۆی پایەدارە، رزگاری و گومڕایی ئاشکرا بووە، لەبەر ئەمە بە ئارامیەکی نە بەدڵیەوە گوتیان:

– هەر کاتیٚ پێغەمبەر هات موسوڵمان دەبین.

ئاپۆراکەی بڵاوەیان لێکردو غیفار ئەو شەوە لە سایەی ئایینی تازەدا ئاسوودەو دڵنیا، شادو ئارام لێی خەوت.

## قامبێژی گەڕەکێ کەس بە سازو ئاوازی ناڕەقسێ

خەفافی کوڕی ئیما دەگەڵ خێڵەکەیا لە نوێژا وەستا بوون. کە نوێژ تەواو بوو خەڵکەکە هەر یەکەبەلایەکابڵاوەیان لێکرد، ئەبو زەڕ و خەفاف بە تەنێ مانەوەو پێکەوە قسانیان دەکرد، ئەبو زەڕ گوتی:

– دەمێکە ئاگامان لە محەمەدو یارانی نییە، تۆ بڵێی چییان بەسەر هاتبێ؟

– هەر کەسێ باوەڕی پێ هێنا بێ ئەزیەتی دەدەن و زیندانی دەکەن و دەیانەوێ لە باوەڕەکەی بێزار بکەن. هەندێکیانیش بۆ حەبەشە کۆچیان کردووە.

– ئەمە هەمان هەواڵ و باسە کە لەو کاروانەی کە بۆ شام دەچوو بیستوومانە، دوای ئەوە چ بووە؟ بە ڕاستی دڵم بۆ ژنەوتنی هەواڵیان پەرۆشە. و زۆر لە خەمی ئەوەدام کە کافرەکان ئەزیەتیان دەدەن.

– ئایا کافرەکان وا دەزانن کە ئەگەر موسوڵمانەکانیان ئازار دا ئیدی لە باوەڕی خۆیان ژێوان دەبنەوەو دێنەوە سەر بت پەرستی؟

– ئاخر کەی گوشارو ئەزیەت و ئازاردانی خەڵکی کاریگەر بووە؟ ئیمان لە دڵیاندا چەسپیوەو خوا هەرگیز دوای ئەوەی هیدایەتی داون گومڕایان ناکاتەوە. دەیانویست بە فەندەڵ فێڵانی جۆراوجۆر موسوڵمانان بەلای خۆیاندا رابکێشن و پێداگرییەکی زۆریان کرد لێ سەریان دای لە بەردو شکستیان هێناو دوا تیری خۆیان هاویشت و موسوڵمانانیان دە زندانان پەستاوت و ئەزیەت و ئازاریان دان، بەڵام بەو زووانە تیرەکەیان رووی خۆیان دەگرێتەوەو کافران خۆشیان بێ و ترشیان بێ، ئیسلام رەواج و برەو دەسەنێ.

خواوەند، هەرگیز ئەو کەسانەی کە وشەی لا الە الا اللە دەڵێن و ئەمر بە چاکەو نەی لە خراپە دەکەن ملکەچ و زەبوون ناکات. خواوەند زوو بە زوو ئاینەکەیان ئاشکرا دەکات و ناوو ناوبانگیان بەرز دەکاتەوە.

لەم کاتەدا پیاوێك لە رێگاوە گەیی و سڵاوی کرد، ئەبوزەڕ بە پەلە پرسی:

– لە کوێوە دێی؟

– لە مەکەوە.

– وەزع و حاڵی محەمەد و یارانی چۆنە؟

– ئەزیەت و ئازاری جۆراو جۆر دەچێژن، چیرۆکی پەیماننامەتان نەبیستووە؟

– نە.

– موسـوڵمانان بـۆ حەبەشـە كۆچیان كـردووە، و لـە ویێنـدەر بەوپـەڕی تـەناهی و ئـازادی خـوای خۆیان دەپەرسن نە ئازاریٚ دەبینن و نە چ سخێفێك دەژنەون. قورەیش عـەمری كوری عاسـیان بـە دەست و دیاری بیٚ شومارەوە بۆ دەرباری نەجاشی پاشای حەبەشە ناردو داوایان لێكرد كـە ئـەم لـە دیـن دەرچـووانەیان تەسـلیم بكاتـەوە، بـەڵام نەجاشـی كـاتیٚ كـە گـوێی لـە قسـانی جەعفـەرو یاوەرەكانی بوو، خۆی لە تەسلیم كردنەوەیان دوور گرت.

خەفاف گوتی: نەجاشی كاری وای كردووە؟ بەڕاستی پاشایەكی گەورەیە.

كابرا گوتی: بەڵكو زێدەباری ئەوەش، ڕێزی پەناهەندەكانی گرتووەو قەدری گرتوون.

ئەبوزەڕ گوتی: ئەدی قورەیش چیان كرد؟

كابرا گوتی: قورەیش كە لە رەفتاری نەجاشی دەرهەق بە جەعفەرو یارانی ئاگـادار بوونـەوە، ئـەم شكسـتەیان فرە لەبـەر گـران بـوو، قینیـان لـە پێغەمبـەری خـوداو یـارانی هـەڵگرت و چاكیان لـیٚ هەڵماڵی كە بیكوژن، پەیماننامەكیان نووسـی كـە بـە گـوێرەی ئـەو پەیماننامەیـە نـابیٚ كـەس ژن و ژنخـوازی دەگـەڵ بـەنی هاشـم دا بكـات یـان مامەڵـەو موعاشـەرەتیان دەگەڵـدا بكـات، و ئـەم پەیماننامەیەیان لە ناو ماڵی كابەدا هەڵواسی.

پاشان بەنی هاشمیان لە دۆڵێكا بە نێوی دۆڵـی ئـەبو تالیب گـەمارۆ داو كوڕانی عەبدولموتـەلیبی كوڕی عەبد مەناف–ش لەو دۆڵەدا پەیوەندییان پێوە كردن.

ئەبو لەهەب قورەیشـی دژ بـە بـەنی هاشـم و بـەنی عەبدولموتـەلیب یەكخسـت. ئـاوو خۆراكیـان لـیٚ بـڕین سـیٚ دانـە سـاڵ لـەو دۆڵـەدا زنـدانی بـوون، جگـە لـە سـاڵی جارێـك، ئـەویش بـو حـەج، نەیاندەتوانی لەو دۆڵە وەدەركەون، تا كێرد گەییە ئێسكان و هەراو زەناو گریـانی مناڵـەكانیان لە دۆڵەكەوە دەبیسترا. دیمەنێكی دڵتەزێن بوو! قوڕەیشیش تاقمێكیـان ئـەم ئازاردانـەیان پـیٚ خـۆش بـوو، و دەسـتەیەكیان پێـی قـەڵس و ناڕەحـەت بـوون. لـەم كاتـەدا خـوا پێغەمبـەری لـە سـەربوری پەیماننامەكە ئاگادار كردەوە كە چۆن مۆریانە هەموو ئەو دێڕانەی كـە زوڵـم و زۆرو نەهـەقیان تیا تۆمار كراوە، خواردووەو ئەو بەشەی كە ناوی خوای لەسەر بووە بە دەقی خۆیەوە ماوەتەوە.

پێغەمبەر ئەم خەبەرەی بە ئەبو تالیب گوت، ئەبو تالیب بە سەرسامی پرسی:

– برازام! یانی ئەوەی گوتت راستە؟

پێغەمبەر گوتی: ئەریٚ بە خودای.

ئەبو تالیب برایەكانی لەمە ئاگادار كردنەوەو گوتیان:

– ئەدی تۆ چ دەڵێی؟

گوتی: بە خودا هەرگیز درۆی دەگەڵ مندا نەكردووە.

گوتیان: تۆ رەئیت چییە؟

گوتی: من رام ئەمەیە كە باشترین جلكی خۆ لەبەركەن و بە سـەرفرازی بـۆ لای قوڕەیش بـڕۆن، تـا بەر لەوەی لەم شتە ئاگادار بن خەبەریان بدەینیٚ.

هـەنگیٚ هـەموو بـەرەو مزگـەوت وەدەر كـەوتن و چـونكە دەم سـپی و ئەشـرافانی قـوڕەیش لـە ژوورێكـدا دانیشـتبوون بـەرەو لای ئـەوان چـوون. دەمڕاسـتانی قـوڕەیش بەوپـەڕی ڕێـزەوە لـە

سەرووی مەجلیسەکەوە دایان نیشاندن‌و چاوەڕوانیان کردن، تا قسەی خۆیان بکەن، ئەبو تالیب گوتی: "کوڕەکەی برام هەواڵێکی داومەتێ – هەڵبەتە هەرگیز درۆ دەگەڵ مندا ناکات– کە خوا مۆریانەی ناردووەتە سەر پەیماننامەکەتان‌و هەموو ئەو دێڕانەیان خواردووە کە باسی زوڵم و زۆرو پەیوەندی دابڕانی تیایەو تەنیا ناوی خوایان هێشتووەتەوە. جا ئێستا ئەگەر راستی کردبوو ئەوا دەست لەم بەد گومانی‌و کەرب و کینەیەتان دەرهەق بەو هەڵگرن و ئەگەر درۆشی کردبوو ئەوا من بە دەستی ئێوەی دەسپێرم و سەرپشك بن لە کوشتن یانە کوشتنی".

گوتیان: "قسەکەت ماقولە".

پاشان سێ نەفەریان ناردو پەیماننامەکەیان کردەوەو جگە لە ناوی خوا چ شتێکی تریان تیا نەبینی.

ئەبو زەڕ گوتی: ئێ دوایی چیان کرد؟

کابرا گوتی: لە تەریقی دا سەریان داخست و ریسوا بوون، و ئەوجا ئەبو تالیب رووی تێکردن و گوتی:

"بۆچی زیندانیمان دەکەن و ئەوەندە لەگەڵماندا توونَدن؟ لە کاتێکدا ئیدی مەسەلەکە روون بووەتەوە"

ئەوجا ئەوو هاوڕێکانی لە بەینی کابەو پەردەکانیا وەستان‌و گوتیان:

"خودایە بەسەر ئەو کەسانەماندا سەربخە کە زوڵمیان لێکردین و پەیوەندیان لەگەڵ دابڕین‌و خراپترین کاریان دەرهەق کردین!"

ئەوجا بۆ دۆڵەکەیان گەڕانەوە، ژمارەیەك لە پیاوانی قورەیش یەکتریان لەسەر ئەم رەفتارەی کە دەگەڵ بەنی هاشمیان کرد بوو سەرزەنشت کردو چەکیان هەڵگرت و بەرەو لای بەنی هاشم و بەنی عەبدولموتەلیب رۆییشتن‌و داوایان لێکردن لەوێندەر بێنە دەرێ و ئەم زیندانیانە، پاش سێ دانەساڵ، لە دۆڵەکەدا هاتنە دەرێ.

خەفاف گوتی: ئەدی قورەیشیەکانی دی چیان کرد؟

کابرا گوتی: تاڵاوی ئەم شکستەیان چەشت و بێدەنگ بوون.

خەفاف بە کەسەرێکی فرەوە گوتی:

من پێم سەیرە کە پێغەمبەری خوا چۆن لەلایەن قەوم و کەسوکاری خۆیەوە ئەم هەموو ئەزیەت‌و ئازارە دەدرێ؟

ئەبوزەڕ گوتی: سەیری پێ ناوێ.. قامبێژی گەڕەکێ کەس بە سازو ئاوازی هەڵناپەڕێ

# یەتروب موسوڵمان دەبێ

هەواڵی موسوڵمان بوونی یەتروب (مەدینە) لە ناوی خێڵی غیفاردا وەکو ئاگرێك بەربێتە پوش و چیلکە بڵاوبووە. شەپۆلێکی خۆشی و شادمانی رووی خەڵکەکەی گەشانەوە. موسوڵمانان بە بۆنەی ئیسلامبوونی (ئەوس و خەزرەج)ـەوە پیرۆزباییان لە یەکتر دەکرد، ئەم دوو خێڵە بە دەمترین و شمشێر بازترین خەڵك بوون. بە ئیسلام بوونی ئەوان، خودا ویستی لەسەربوو کە ئاینەکەی ئاشکرا بکات و پێغەمبەرەکەی سەر بخات و بەڵێنی خۆی بەسەر بەرێ.

ئەنیس، بە شادییەوە بۆ لای ئەبوزەڕ هات. مژدەیەکی بۆ هێنا بوو.

ئەنیس: راپەڕینی ئیسلامی لە یەتروب دا ئاشکرا بووەو ئەوس و خەزرەج بوون بە موسوڵمان.

ئەبوزەڕ: بەم زووانە پێغەمبەر بۆ ئەوێندەر دەچێت.

ئەنیس سەری سوڕما، لە کاتێکا بەسەرسامی دەیڕوانییە برایەکەی گوتی:

– جگە لەمە هیچ خەبەرێکی تازەت پێ گەییوە؟

– نە، خەبەری ئیسلام بوونی (یەتروب)ش لە تۆ دەبیەم.

– ئەدی کێ پێی گوتی پێغەمبەر بۆ یەتروب دەڕوات؟

– ئەو رۆژەی کە دیتم پێی گوتم: "من دەچم بۆ دەڤەرێك کە باخی خورمای هەبێ و باوەڕ ناکەم ئەو دەڤەرە جگە لە یەتروب شوێنێکی دیکە بێ"…. پێغەمبەری خوا راستی کرد…

ئایا قەومەکەی دێڵن ئەو بۆ یەتروب بڕوات و موسوڵمانانیان لێ هان بدات؟

– بیەڵن و نەیەڵن ئەو هەر دەڕوات، بەڵام چۆن و کەی، ئەمە بە دەستی خوایەو ئێمە نایزانین.

ئەبوزەڕ بڕیاری رۆییشتنی دا، برایەکەی گوتی:

– بۆ کوێ دەڕۆیت؟

– هاتووە بەسەرما بۆ یەتروب بڕوم تا لە ئیسلام بوونی ئەوانە ئاگادارم بم و دەنگ و باسی پێغەمبەری خۆشەویست بزانم.

ئەبوزەڕ کەڵکەڵەی یەتروبی کەوتە سەر. سواری وشترەکەی بوو، و رۆیی تا گەییە یەتروب و خۆی بە مزگەوتی (بەنی زەریق)دا کرد، لە پڕ لە ناو مزگەوتەکەوە گوێی لە ئاوازی دڵگیری خوێندنەوەی ئازادانەی قورئان بوو، وەژوورکەوت، دەگەییە هەر کەسێك لە پێغەمبەری دەپرسی.

خەڵکەکە رەوانەی لای رافیعی کوڕی مالیکی زەرقیان کرد. ئەبوزەڕ چوو بۆ نك وی و گوتی:

– سڵاوو رەحمەتی خوات لێ بێ.

– سڵاوو رەحمەت و بەرەکەتی خوا لە تۆش.

ئەم سڵاوەی ئەبوزەڕ بەم ئازادیە کردی نیشانەیەکی ئازادی و سەرکەوتنی ئیسلام بوو و روحی ئەبوزەڕی هێنایە جۆش و خرۆش. ئەبوزەڕ لەلایەوە دانیشت و گوتی:

– من برای ئیسلامی تۆ ئەبوزەڕی غیفاریم.

– خێر هاتی، کارێکت هەیە کە من بتوانم رای پەڕێنم؟

– خەبەرم زانیوە کە تۆ موسوڵمان بوویت و ئەوس و خەزرەجیش باوەڕیان بە ئیسلام هێناوە. روحم بۆ ژنەوتنی هەواڵی محەمەدی خۆشەویست لە شەقەی باڵی داو هاتم تا شایەت لەلای ئێوە دەرفەت و دەلیڤەیەك بدۆزمەوە تا کەمێك ئەم ئاگری تاسەیەی کە بەر بووەتە سینەم سووك بکەم.

– ئێمە پێغەمبەرمان بینی و باوەڕمان بە ئیسلام هێناو ئێستا لەم شارەدا ماڵێك نیە کە یارێکی پێغەمبەری خوای تیا نەبێت.

– ئەوتان بینی؟ لە کوێ دیتان؟ چۆن بوو؟

– من و پێنج کەسی دیکەی خەڵکی یەتروب لە مونا بووین، پێغەمبەر بەلامانا هات، وێستاو گوتی:

– هاوپەیمانانی جولەکەن؟

گوتمان: بەڵێ!

ئەوجا داوای لێکردین ئیسلام بین و بۆی شرۆڤە کردین و قورئانی بۆ خوێندینەوەو ئێمەش باوەڕمان بە ئیسلام هێنا. ئەوجا پێغەمبەر پێی فەرمووین:

"پشتم بگرن تا کاتێ کە دەستووری پەروەردگارم دەگات؟"

گوتمان: "ئەی نێردراوی خوا! ئێمە لە رای خواو پێغەمبەری خوادا درێغی ناکەین، بەڵام ئێستا دژمنی یەکترین و ئەگەر تۆ بێی هەموومان پەیوەندیت پێوە ناکەین، با جارێ ئێمە بگەڕێینەوە بۆ ناو خێڵەکانی خۆمان لەوەیە ئاشتیمان بکەوێتە نێوان و ساڵی ئایندە لە کاتی حەج دا یەکتری دەبینین.. کە وەختی دیاریکراو هات دە کەس لە خێڵی خەزرەج و یەکێك لە خێڵی ئەوس بۆ مەکە چووین و پێغەمبەری خوامان بینی و باوەڕمان بە ئیسلام هێناو شەرتمان کرد کە شەریك بۆ خوا پەیدا نەکەین، دزی نەکەین، زینا نەکەین، کچانمان زیندە بەچاڵ نەکەین، مناڵمان نە کوژین، بوختان و ئیفترا بۆ یەکتر نەکەین و لە گوناح دوور بکەوینەوە".

پێغەمبەر گوتی: "ئەگەر شەرتی خۆتان بەرنە سەر شایستەی بەهەشتن، و ئەگەر کەسێك پابەندی شەرت و پەیمانی خۆی نەبوو و سەرپێچی کرد ئەوا چارەونووسی بە دەستی خوایە، سەرپشکە لەوەی بیبەخشێت یان عەزابی بدات".

هەنگێ بۆ مەدینە زڤڕینەوەو خوا رەونەقی بە ئیسلام بەخشی.

– باشە دوای ئەوەش پێغەمبەری خواتان دیتوەتەوە؟

– بەڵێ، کە کاتی حەج هات یەکترمان بۆ زیارەتی حەج و دیداری پێغەمبەری خوا دعوەت کرد، و ئێمە حەوت کەس لە ئەوس و پێنج سەد کەس لە خێڵی خەزرەج چووینە نك پێغەمبەرو کە گەییشتینە خزمەتی فەرمووی:

"هەر کاتێ هەراو هەنگامە نیشتەوە، لە موناوە داگەڕێن‌و لە شاخەکەی دەستە راستەوە وەرن بۆ غارەکە من لەوێم".

ئەوجا دەستووری دا کە : "هەر کەسێك لە خەوا بوو هەڵی مەسێنن‌و هەر کەسێك دیار نەبوو چاوەڕوانی مەکەن‌و وەرن".

هێدی هێدی، یەك یەك و دوو دوو کەوتینە رێ‌و پێغەمبەر لە پێش ئێمەوە دەگەڵ عەباسی کوڕی عەبدولمەتەلیبدا بۆ ئەوێ رۆیی، کە هەموومان کۆ بووینەوە عەباس روو لە خەڵکەکە گوتی:

ئەی خێڵی خەزرەج! ئێوە محەمەدتان بانگ کردووە، بە هەژێترین کەسی ناو خێڵەکەی خۆی دەژمێردرێت، تەنانەت ئەو خەڵکانەش کە هەڤباوەڕی ئەو نین، پشتیوانی لێدەکەن، چونکە خودانی رەسەن‌و شەرەفێکی گەورەیە،بەڵام هەموو خەڵکی جگە لە ئێوە پشتیان تێکردووە، جا ئەگەر هێزو تواناتان هەیە، ئەگەر لە شەڕا سەربەخۆیی‌و کارامەیی تەواوتان هەیە، بیری خۆتان بکەنەوەو شیرەت و راوێژی خۆتان بکەن، هەموو عەرەب "لێتان دێنە دەست، بەبێ ئاگاداری یەکتر هیچ کارێك نەکەن، هەمیشە یەك دەست و یەك دەنگ بن، من بۆیە ئەم قسانە لە هەوەڵەوە دەکەم چونکە جوانترین قسە، راستترین قسەیە"

ئەوجا "مەغروور" گوتی:

– قسەکانمان وەرگرتیت، قەسەم بە زاتی خوا قسەی دڵ و زمانمان یەکە، ئەگەر مەبەستێکی ترمان هەبوایە دەمانگوت، ئێمە جگە لە ئەمەك و وەفاداری هیچی ترمان نیە، جگە لەوەی کە خوێنی خۆمان لە ڕای پێغەمبەری خودا بڕێژین هیچ مەبەست و ئاواتێکی ترمان نیە.

پاشان پێغەمبەر قورئانی بۆ خوێندین و داوای خواناسی لێکردین و بۆ ئیسلام بوونی هاندایین، ئیدی بورائی کوڕی مەغروور داواکەی قەبوڵ کردو باوەڕی بە ئیسلام هێنا، هەنگێ گوتی: "ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە سۆزمان بە تۆدا، ئێمە پیاوی چەك و زرێن‌و ئەم زرێیەمان لە پێشینانەوە بەمیرات بۆ ماوەتەوە"

ئەبول هەیسەم گوتی: ئێمە ئیسلام قەبوڵ دەکەین، ئەگەر سەروەت‌و سامانیشمان بە با بڕوات و گەورەکانمانیش لە نێو بچن".

لە هەموو لایەکەوە هەراو زەنا بەرز بووەو هەر کەسەو بە دەنگی بەرز دەعوەت و داواکەی پێغەمبەری قەبوڵ کردو جۆش و خرۆشیان تێ کەوت. عەباس گوتی:

– بێدەنگ بن! خەفێ و شۆڤاران تاقیبمان دەکەن.هەموو پێکەوە هاوارو قسان مەکەن. با ردێن سپی و مەزنەکانتان بێنە پێشەوەو قسانمان دەگەڵ بکەن‌و بە ئەسپایی قسەکانمان بە ئێوە بگەیەنن، چونکە ئێمە خەمی ئێوەمانەو دەترسین خێڵەکەمان دژمنایەتیتان بکەن، جا مادامێکی سۆزو بەیعەتتان دا بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆتان"

ئەوسا عەباس رووی کردە پێغەمبەرو گوتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، دەستت بێنە پێشێ!" هەنگێ ئێمە هەموو دەستیمان گوشی‌و سۆزو بەیەعەتمان دایە.

ئەبوزەڕ: لەم کاتەدا پێغەمبەر چۆن بوو؟

**رافیع: شـادو بەکـەیف بـوو، خـودا یـارانێکی دلێـرو ژێرەڤانـانێکی جـەنگاوەرو بـەهێزو خـودان هیمەتی ناردبووە کۆمەکی.**

**– هێشتا دژایەتی و رکونی قورەیش دەرهەق بەو سووك نەبووە؟**

**– نـە ئـەبوزەڕ! بیسـتوومە کـە دوای دیـداری دەگـەڵ ئێمـەدا، کـافران، یـارانی پێغەمبـەریان خسـتووەتە ژێـر گوشـارو درێغـی لـە ئەزیـەت و ئـازاردانی بـێ وێنـەیان ناکـەنو زۆر لەگەڵیانـدا توندنو عەزیەتیان دەدەن.**

**ئەبوزەڕ: ئەنجامی ئەم هەموو ئەزیەتو ئازارە ئەمە دەبێت کە موسوڵمانان زوو بە زوو مەکە چۆڵ بکەنو بەرەو یەتروب کۆچ بکەن.**

**رافیع: پێغەمبەریش دەگەڵیان دێت؟**

**ئەبوزەڕ: بەڵێ، بەو زووانە دێ، خۆشی لە یەتروب و خەنی لە خەڵکی یەتروب.**

# غیفار، خوا بیان بەخشێت

**غیفار کالای شادی و خۆشی لەبەر دەکردو لە کەیف و شادی دا نقوم دەبوو. هەواڵ هاتبوو کە محەمەد دەگەڵ ئەبو بەکری دۆستیا بۆ لای ئەوان دێ.**

ئەبو زەڕ هەستی کرد ئەو سەرچاوەی شادیەی کە تامەزرۆو تینووی بوو لە ناخی دەروونیەوە هەڵدەقوڵێ و ویساڵ و دیدار نزیك دەبێتەوەو هومای بەختەوەریو ئاوات بەرەو ئەو لە شەقەی باڵ دەدا، خەڵکی هەموو لە ماڵەکانیانەوە رژانە دەرێ و بە هێڤی دیداری محەمەد لە رێگەیا، لە دەوری ئەبوزەڕ، ئەڵقەیان بەستبوو، و ئەبوزەڕ لە کاتێکا کە بەتاسەوە نیگاکانی بۆ دوورترین خاڵ ڤڕێ دەکرد، چاوەڕێی هاتنی خۆشەویستەکەی دەکرد، خەڵکی بە تاسەو پەرۆشەوە چاوەڕوانیان دەکردو هەر سا نا ساتێ ئەبوزەڕیان، کە بە تاقە ئاشنای پێغەمبەر دەژمێردرا، بەگیر دێناو دەمرێژێ پرسیاریان لە بارەی ئەوەوە لێدەکرد: چۆنە؟ شێوەی چۆنە...؟ ئەبوزەڕ لە کاتێکا کە چاوی لە رێگاکە نەدەگواستەوە، وەڵامی دەدایەوە: "هەر ئێستا باشترین و بالاترین خەڵکی سەر رووی زەوی دەبینین".

چەرخی زەمانە بە خاوی بەبەردەم خەڵکەکەدا دەڕۆیی و ئەبوزەڕ بۆ ئەوەی مژدەی هاتنی پێغەمبەر بە خێڵەکەی، کە تاسەمەندو ئارەزوومەندی بیستنی گوتارو دیداری ئەو بوونو لە دوا کەوتنی نیگەرانو پەرێشان بوو بوون، بدات، چاوی بڕی بووە رێگە تا بیدینێ.

زەمان بە خاوی دەڕۆیی، خەڵکی غیفار خەمین و سەرگەردان چاوەڕوانیان دەکرد، ئەبوزەڕ لە ناکاو چاوی بە وشترێك کەوت کە دەهاتە پێشێ، جوان زەینی دایە، ئاپۆڕاکەش هەموو چاویان بڕی بووە ئەو شوێنەی کە ئەبوزەڕ سەیری دەکرد، لە پڕێکا ئەبوزەڕ کە لە خۆشیا لەپێستی خۆی نەدەهێوری، هاواری کرد: "بە زاتی خوا پێغەمبەر هات!".

ئاپۆڕاکە بە خۆشیو بە یەك دەنگ گوتیان: "پێغەمبەر هات!"

ئەبو زەڕ رایکردە پێشێو سلاوی کرد، پێغەمبەر پرسی: ئەبو نەملەی؟ گوتی: نە، ئەبوزەڕ.. ئەوجا هەوساری وشترەکەی پێغەمبەری گرت، ئاپۆڕاکە دەوری پێغەمبەریان داو بە جۆش و خرۆشێکی سەیرەوە هاواریان دەکرد:

"ئەڵلاهو ئەکبەر!" ژنان و کەنیزەکان و مندالان بە شەوق و شادییەوە هاواریان دەکرد: " پێغەمبەری خودا هاتووە!" پێغەمبەری خودا لە وشترەکەی دابەزی، موسوڵمانان سلاویان لێدەکرد، پێغەمبەر دانیشتو ئەبو بەکر بەپێوە قسەی دەگەڵ خەڵکی دا دەکرد، پێغەمبەر دەستی بە خوێندنی قورئان کردو داوای ئیسلام بوونی لە خەڵکەکە کرد، خەڵکی بەمەبەستی سۆزو بەیعەت هێرشیان بۆ دێنا، ئەبوزەڕ لە قەرەباڵغییەکەدا لە پاڵ پێغەمبەرا بەسەرفرازیو شادی وەستا بوو و لەزەتی لە دیتنی ئەم دیمەنە دەبینی.

**خەڵکی ئەبڵەق و حەپەساو چاویان لە سیمای ئەو بڕی بوو، دەیان بینی کە خوو خوڵقێکی باش، سیمایەکی خۆش و روویەکی گەشی هەیە: نە ئەوەندە قەڵەوە کە نارەحەتی بکات و نە ئەوەندە لاوازە لەبەر چاودا سووك بنوێنیّ، روو خۆش و گەش، چاوانی دڵگیرو خۆش نیگا، برژانگەکانی درێـژو رەش و دەنگـی گـرو پیاوانـە، چـاوانی رەش و برۆیـانی پەیوەسـتو باریـك، قـژی رەش و گـەردەنی بـەرز و ردێـنی تـۆپ و پـڕ، لـە کـاتی بێدەنگیـدا ویقـارو قورسـی و بتـەوی بـاڵی بەسـەرا دەکێشێت و کە دێتە قسان سام و هەیبەت و شکۆی لێدەباریّ، قسەکانی شیرین و دڵگیرە، وشە بـە شـکاوی و نـا مـەفهومیو بێهـودەیی لـە زاری دەرنایـەت، لـە دوورەوە لـە هـەموو دیـارترو بـە جیلوەترەو لە نزیکەوە شیرینترو لەبەر دڵانترە، باڵایەکی مامناوەندی هەیە، نە ئەوەندە بەرزە کە ناشیرین بنوێنیّ، نە ئەوەندە کورتە کە لە بەرچاوی بینەر بچووك دیار بیّ.**

**خـەفاف کـوڕی روخسـەی غیفـاری داوای لـە پێغەمبـەر کـرد نامەیـەك بـۆ خێڵەکـەی بنووسـێت، پێغەمبەریش قەراردادێکی نووسی کە :**

**"خێڵـی غیفـار موسـوڵمانن و لـە شکسـت و سـەرکەوتن و تەنگانـەو خۆشـیدا شـەریك و هاوبەشـی موسـوڵمانانی دیکـەن، پارێزگـاری گیـان و ماڵیـان لـە عۆیـەی خـواو پێغەمبـەرەو پێغەمبـەر بـەڵێن دەدات کە هەر کاتیّ زوڵم و ستەمێك روویان تیّ بکات یارمەتیان بدات و هـەر کـاتیّ پێغەمبـەریش داوای یارمەتی لەوان بکات، بە دەنگیەوە بێن و یارمەتی پێغەمبەر لە سەر هەموویان فەرزەو ئەم پەیماننامەیە، مەگەر بە گوناه، دەنا قابیلی گۆڕین نیە".**

**خێڵی غیفار هەموو بوون بە ئیسلامو ئەبوزەڕ کە دەی بینی قەومەکەی دەستە دەستە دێنـە سـەر ئاینی خودا، لە ناخی دڵدا هەستی بە شادییەکی فرە کردو هەردووك دەستی بۆ ئاسمان بـەرز کـردەوەو لـەبن لێوانـەوە گـوتی: [... *سـوپاس بـۆ خـوایـێ کـە ئێمـەی هێنایـە ئێـرە، ئەگـەر خـودا نەیهێنابایەن ئێمە کوا رێمان دەردەکرد... سورەتی ئەعراف، ئایـەتی٤٣*] پاشـان پێغەمبـەر رووی کردە ئەبوزەڕو لە کاتێکا بزەیەکی سەرکەوتن و نەوازشێکی پڕ لـە میهرو دلۆڤانی بەسـەر لێوەوە بوو گوتی: غیفار رەحمەتی خوایان لیّ بیّ..**

# بەرەو یەتروب

رۆژگارێك بوری، ئەبوزەڕ رۆژێ لە کپی گەرم وخەمینی عەسرا، بۆ نوێژ کردن، بە بالای بەرزو باریکییەوە خۆی بە مزگەوتدا کرد، کە نوێژ تەواو بوو بە ئەسپایی و لە حاڵێکا کە لە فکران راچوو بوو، و شوێنەواری خەم و پەژارە بە روویەوە نیشتبوو، چووە گۆشەیەکی مزگەوتەکەو لە پاڵ زەلامێکا کە بە دەنگێکی خەمین و بە سۆز قورئانی دەخوێند، رۆنیشت، سەراپای بوو بە گوێ، سەری کز کرد بوو و بە بەلەنگازی و خاکەساری گوێی بۆ ئەم گازیە گیانبەخشە ئاسمانییە شل کردبوو!

***[ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! دەتانەوێ مامەڵەیەکتان پێ بێژم کە لە ئازارێکی بەژان رزگاروکا؟ بڕوا بە خواو بە پێغەمبەری ئەو بێنن و بە دارایی و گیانی خۆتان لە رای خودا تێ بکۆشن، ئەمە بۆ ئێوە باشترە گەر بیزانن، لە گوناهانو دەبورێ و دەتانباتە ناو باغاتێك جۆباریان بە بەردا دەڕواو خانووی زۆر خۆش و خاوێنتان لە بەهەشتی هەمیشەییدا دەداتێ، ئەمە دەسکەوتی گەورەیە. سورەتی سەف، ئایەتەکانی ١٠- ١٢].***

ئەبوزەڕ ئەم ئایەتانەی بە گوێی روح و گیان دەژنەوت و روحی پڕ جۆش و خرۆشاوی بەرەو خوداو بەهەشت لەشەقەی باڵی دەدا. کەوتە بیرکردنەوە لە چارەنووسی خۆی. بیری لەوە دەکردەوە کە چ شتێك رێگرە لەبەردەم ئەوەی بڕوا بۆ یەتروب و یارمەتی پێغەمبەرو جیهادو نەبەرد لە رای خوادا. جەنگی بەدر، جەنگی ئوحد، جەنگی خەندەق کرا بوون و ئەبوزەڕ لێیان بێ بەش بوو بوو. یانی یارانی پێغەمبەر لە مەیدانی جەنگ و شەڕگاندا گیان بەخت بکەن و یارمەتی پێغەمبەر بدەن و ئەبوزەڕ لە ماڵی خۆیدا ئیسراحەت بێ؟ پێغەمبەر بە دەستی خۆی سەنگەر لێ بدات و ئەبوزەڕ لە جێی خۆیدا پاڵ بداتەوە؟ موسوڵمانان هەر دەمێ هەزاران رووداوی خوێناوی و مەرگبار یەخانگیریان بێ و ئەبوزەڕ تەنیا بەوەندەی کە موسوڵمانەو سەرگەرمی عیبادەتی خوایە، دڵخۆش بکات؟!.

چ شتێك ئەوی ناچار کردووە لە غیفاردا وەمێنێ؟ چ فاکتەرێك ئەوی لە برایانی موجاهیدو یارانی خواو یارانی ئیسلام دابڕیوە؟ هیچ! کەواتە پێویستە بڕوات و شەڕی دژمن بکات، یان سەرفرازو سەرکەتوو دەبێ یان مەرگ و شەهادەت لە هەمێز دەگرێت. شوێنەواری عەزم و جەزم لەسەر سیمای رەق و رەشتاڵەی نەخش دەبوو. لە ناکاو هەستاو بۆ ماڵ رۆییشتەوەو بە دەنگێکی دلێرو بنج بڕو نەگۆڕ گوتی: من سبەی بۆ یەتروب دەڕۆم..

– زۆر دەمێنیەوە؟ کەنگێ دەزڤڕییەوە؟

– ئیدی ناگەڕێمەوە.

– لەوێ چ دەکەی؟

– پەیوەندی بە پێغەمبەری خواوە دەکەم و ئیدی هەرگیز لێی جیا نابمەوە.

– دەچیە ماڵی کێ؟ لە ماڵی کێ دەخەوی؟

– لە مزگەوتا دەگەڵ ئەو یارانەی پێغەمبەرا کە هیچ ماڵ و ماوایەکیان نییە، دەخەوم.

– تۆ بوویت بە موسوڵمان و ئاینی خوات پەسند کردووەو ئەمەت بەسە، لە ناو عێڵ وعوربانی خۆت وەمێنەو ژیان وحاڵت بەجێ مەهێڵە، خانەوادەکەت لە هەر شتێك پتر پێویستیان بە تۆیەو ئەوان بۆ تۆ لە هەموو شتێ لە پێشترن.

– پێغەمبەر بۆ موسوڵمانان لە روح و گیان لە پێشترە، ئەی ئەنیس ئەوەی تا ئێستا لە دەستم چووە بەسە، پێغەمبەر لە شەڕی بەدرا بەشداری کردو من لە غیفار بووم، شەڕی ئوحد هاتە پێشێ و دەستەیەك لە یارانی شەهید بوون و بە دەرەجەیەکی گەورە گەییشتن و من لە کونج و پەستوی ماڵەکەمدا وەکو ژیژك خزی بوومە قاوغ و پێستی خۆمەوە، شەڕی خەندەق هەڵگیرساو من لە جیهاد بێ بەش بووم، ها.. ئەی ئەنیس من ئەم هەموو شانازییەم لە دەست دا، ئیتر بەسە.

– باشە تۆ لە دیار ماڵ و منداڵی خۆت دانیشەو هەر کاتێ بۆ جیهادیان گاز کردی بڕۆ.

– نە، خوا دوو دڵی لە سینگی مرۆڤدا دانەناوە، وا گیانم بە خوا بەخشی و چیتر تەماحم بە شڕو شیتاڵی ئەم دنیایە نییە. شایستەترین شت ڕەزامەندی خوداو پێغەمبەری خودایە. چ شتێك من بە ئێرەوە دەبەستێ؟ بە خوا هەر بۆ یەتروب دەڕۆم و خوا ڕێنوێنیم دەکات.

ئەبوزەڕ بڕیاری سەفەری دا، کەوتە ڕێ، بەڵام زادو توێشووی دەگەڵ خۆ هەڵنەگرت. ئەنیس گوتی:

- توێشوویەك بۆ ڕێگات نابەی؟
- لەم ڕێگەیە تیکە نانێك هەر پەیدا دەبێ.

ئەبوزەڕ سەفەری یەتروبی کردو پەیوەندی بە محەمەدەوە کرد، لەسەرچاوەی زانستی ئەو پاراو دەبوو، گوتارو ڕەفتاری ئەوی دەکرد بە سەر مەشقی خۆی و لە خێروچاکەو بەزەیی و دلۆڤانی و مەردی و ڕەندیدا چاوی لەو دەکرد.

## دالآن نشينان

ئەبو زەڕ شەوو رۆژی لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر رادەبواردو بە جارێ نقومی نوێژو پاڕانەوە بوو جگە لە خودا بیری لە هیچی دی نەدەکردەوە. چاوی لە تەماح و جوانی و هەموو شتێکی ئەم جیهانەو لەو لەزەت و سەروەت و سامانەی کە خەڵکی پێوەی سەرقاڵ بوون، پۆشی بوو، عیبادەتو پارسایی کردبوو بە پیشە،و شەوانە ئەویش وەکو ئەو یارانەی محەمەد کە ماڵ و حاڵیان نەبوو لە دالآنی مزگەوت دەنووست.

ئەمانە سەربازی ئامادەی محەمەد بوونو هەر گاڤێ ئیسلام پێویستی بە یارمەتی بوایە لە هەموو کەس زووترو ئارەزوومەندانەتر پشتیان دەکردە دنیاو شمشێریان هەڵدەگرت.

کە شەو دادەهات پێغەمبەر بە سەر یاوەرەکانیا دابەشی دەکردنو بە خۆیشی ژمارەیەکی لێ دەبردنەوەو نانی دەدانو، ئەبوزەڕ یەکێك بوو لەمانە.

خواوەند نقومی شادیو بەختەوەری کردبوو. گرێیەکانی دڵی ڤەکرد بوو و دڵی لێوان لێوی مەحەبەت و ڤیان و راستی و دڵنیایی و یەقین کردبوو، زمانی راستگۆو ویژدانی پاك و خووی راست و گوێی سووك و چاوانی تیژو بینا کردبوو. قسەکانی محەمەدی دەژنەوت و فێریان دەبوو و دەیگوتنەوە. لە کاتی شەڕدا دلێرانە شمشێری دەوەشاندو لە رۆژانی ئاشتی دا دەکەوتە فێر بوونی زانست و زانیاری و هێندەی زانست کۆ کردەوە کە بوو بە یەکێك لە گەورەترین زاناو گوتیاری حەدیسانی ئیسلام، لە پاکی و خواناسیدا چاوی لە پێغەمبەر دەکردو گەییە ئاستێك کە بوو بە یەکێك لە بەناوبانگترین پارساو خواناسان.

رۆژێ عومەر* خۆی بە مزگەوتدا کرد، ئەبوزەڕی بینی کە روپۆشێکی رەشی لە خۆوە پێچاوەو لە سوچێکا بە تەنێ دانیشتووە پێی گوت: بۆ بەتەنێ دانیشتووی؟

– دانیشە!... هاونشینی باش لە تەنیایی باشترەو تەنیایی لە هاونشینی خراپ باشترە، ماڵێك بەئەمانەت بسپێرێ باشترە لەوەی مۆرومۆمی بکەی، مۆرومۆمی بکەی باشترە لەوە کەسێك بە دز دەربکەی.

*[* لە مستدرك دا وا هاتووە کە سەدەقەی کوڕی ئەبی عەمران ئەم پرسیارەی لێکردووەو ئەبوزەڕ وەڵامەکەی لە زمانی پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوەو ئەمەیان لە دروست تر دەچێ، ع.ش].*

ئەبوزەڕ و عومەر دەستیان بەقسان کرد، وخەڵکی دەستە دەستە بۆ نوێژی ئێوارە بۆ مزگەوت دەهاتن. بیلال بانگی ئێوارەی داو پێغەمبەریش بۆ نوێژ لە ماڵ هاتەدەر.

دوای نوێژ، خەڵکی دەستە دەستە لە دەوری پێغەمبەر ئەڵقەیان بەست و گوێیان لە قسەکانی دەگرت.

ئەبوزەڕیش رۆنیشت و چاوانی بڕییە زاری محەمەدو بە تاسەو تامەزرۆیی گوێی دەگرت.

پاش نوێژی شێوان، خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کردو تەنیا ئەهلی دالاّن نشینان مانەوە تا شەو لەوێندەر رابوێرن.
پێغەمبەریش بۆ ماڵ رۆییشتەوەو یاوەرەکانی خەوتن، سێ یەکی شەو بوری بوو کە پێغەمبەر لە ماڵەوە هاتەوە بۆ مزگەوت و بە ئەبو هورەیرەی گوت: یارانم گاز بگە با بێنە لای من.
ئەبو هورەیرە چووە دیار سەری یەکە بە یەکەیان و بێداری کردنەوە، ئەبوزەڕیشی بێدار کردەوەو هەموویان هاتنە بەر ماڵی پێغەمبەر، مۆڵەتیان وەرگرت و چوونە ژوورەوە.
ئەمانە نزیکەی سی کەسێك بوون، پێغەمبەر خواردنێکی لە جۆ ساز کردبوو و لە بەردەمیانا دایناو دەستی نایە سەر قاپی خواردنەکەو گوتی: ناوی خوای لێ بێنن و دەست پێ بکەن، قەسەم بەو کەسەی کە گیانی محەمەدی بە دەستە، ماڵباتی محەمەد هیچ شەوێکیان بە خواردنێکی، جگە لەم خواردنە کە دەیبینن، نەبردووەتە سەر.
پاش نانخواردن بۆ مزگەوت گەڕانەوە تا بنوون، هێشتا بە تەواوەتی جێی خۆیان نەگرتبوو کە چاوانیان هاتنەوە یەك و نقومی خەوێکی قووڵ و خۆش بوون، بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشان.
ئەبوزەڕیش پێڵوەکانی لێك نابوو کە خشەخشی جلێکی هاتە گوێ، چاوانی هەڵێنان، پێغەمبەری خوای بینی کە لە ماڵی خۆیەوە بەرەو مزگەوت دەهات، بێ ئەوەی لە جێی خۆی بجوڵێ بەنیگا عەودالەکانی خۆی چاوەڕوان بوو کە هۆی ئەمە بزانێ، سەیری کرد پێغەمبەر چوو بۆ لای میحرابەکەو نوێژی لێ دابەست.
گوێچکەکانی هەڵخست، گوێی لێ بوو کە ئەو زۆر خاکسارانەو خاکیانە ئەم ئایەتەی دەخوێند:
***(گەر بتەوێ ئازاریان دەی، عەبدی خۆتن، گەر بشتەوێ لێیان خۆش بی، خۆت دەزانیو هەر بۆ خۆتی کە دەسەڵاتت بە دەستەو لە کارزانی. سورەتی مائیدە، ئایەتی ١١٨).***
ئەبوزەڕ کە بە هەمان دەقی خۆیەوە لەسەر زەویەکە راکشا بوو، درێژەی بە فزوڵیەتی خۆی دەداو دەی بینی کە پێغەمبەر هەر چەند دەچێتە روکعەو سوجدە هەمان ئایەت دەخوێنێ، ئەبوزەڕ چاوانی بڕی بووە پێغەمبەرو پێغەمبەر تا بەیانی درێژەی بەم رکوع و سوجودە دا، ئەبو زەڕ خوا خوای بوو پەی بەم رازە بەرێ، کە شەو تەواو بوو و پێغەمبەر نوێژەکەی تەواو کرد، ئەبوزەڕ هات و لەبەردەم پێغەمبەردا وەستاو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئەم ئایەتەت تاکو بەیانی لە رکوع و سوجودا دووبارە کردەوە؟
***- داوای شەفاعەتم لە خوا کردو پێی عەتا فەرمووم. ئەگەر ئەو خواستی لەسەر بێ، هەر کەس شەریك بۆ خوای مەزن پەیدا نەکات، لە شەفاعەتی بەرخوردار دەبێت.***

# وه سێت و ئامۆژگاری

***ئێمه ماڵێکی ترمان هەیه کە کەلوپەلە چاکەکانمان لە پێشەوە بۆ ئەوێ دەنێرین.***

**ئەبو زەڕ**

چەرخی ڕۆژگار دەگەڕاو ئەبوزەڕ لە گشت شەڕەکانی دوای خەندەقدا دەگەڵ پێغەمبەرا بەشداری دەکرد، ئازاو بوێر بوو، بە تەنیا ڕێی دەکردو بێ ڕەحمانە دەیدا بە سەری دوژمندا، لە جەنگی بەنی لحیانو زی قیرەدا هاوڕێ دەگەڵ پێغەمبەرا شمشێری دەوەشاند، لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەر بۆ شەڕی بەنیل موستەلەق چووە دەرێو ئەبوزەڕی لە مەدینەدا بەجێنشینی خۆی دانا، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی تەواوی متمانە بوونە بە پاکی و کەسایەتی ئەو. ئەبو زەڕ پایەیەکی یەجگار دیارو گەورەی لەنك پێغەمبەر بە دەست هێنا بوو. هەر کاتێ دیارو حازر بوایە قسەی دەگەڵ دەکردو کە دیار نەبووایە لیی دەپرسی. ڕۆژێ ئەبوزەڕ هاتە لای پێغەمبەر، پێغەمبەر نووستبوو و پارچەیەکی سپی بە شانیا دابوو، ئەبوزەڕ هات و خەبەری کردەوە. پێغەمبەر کە چاوی پێی کەوت گوتی: هیچ بەندەیەك نیە کە لا الە الا الله بڵێت و دوای ئەوە بمرێو نەچێتە بەهەشت.

- ئەگەر زیناح و دزیشی کردبێ؟
- ئەگەر زیناح و دزیشی کربێ
- ئەگەر زیناح و دزیشی کردبێ؟

پێغەمبەر دیسان بە تاکیدەوە گوتی: ئەگەر زیناح و دزیشی کردبێ.

ئەبوزەڕ بە سەرسامییەکی ئاوێتە بە نە باوەڕییەوە گوتی:

- ئەگەر زیناح و دزیشی کردبێ؟!؟!
- بەڵێ ئەبوزەڕ، ئەگەر زیناح و دزیشی کردبێ!

ئەبوزەڕ لە فکران ڕاچوو. ئەوسا بە دوو قۆڵی بۆ مزگەوت چوون، کە وەژوور کەوتن پێغەمبەر بە ئەبوزەڕی گوت: ئەبو زەڕ! سەر هەڵبڕە.

ئەبوزەڕ سەری هەڵبڕیو پیاوێکی بینی کە جل و بەرگی چاکی پۆشیوە، کە چەند هەنگاوێ لەو دوور کەوتنەوە دیسان پێغەمبەر گوتی: "سەر هەڵبڕە!" ئەبوزەڕ سەری هەڵبڕی، پیاوێکی بینی کە جڵکی کۆنەی لەبەر بوو. پێغەمبەر گوتی:

- ئەی ئەبوزەڕ! ئەمەیان لەبەر قاپی خوادا زۆر لەوی ترو لە دنیایەك نموونەی وەکو ئەو هەژێترە.

* * *

ئەبوزەڕ بەو دەقەوە ژیانی لە مزگەوتدا رادەبوارد تا ئوم زەڕی خواست. ئوم زەڕیش لە یاوەرانی گەورەی پێغەمبەرەو لە هەموو دژواریو تەنگانەکاندا شەریکی مێردە دروستکارو فیدا کارەکەی بووەو پشکی خۆی لەو شانازیانەدا هەیە کە ئەبوزەڕ بە دەستی هیناون.

ئەبوزەڕ پاش ئەوەی ئوم زەڕی هێنا، ئیدی ژیانی دالآن نشینانی بەجێهێشت و بۆ نیشتەنی خۆی لە دەرێی مەدینەدا، لەسەر گردێك خێوەتێكی بچووكی هەڵدا. ئیدی لەوێوە دیمەنێكی دیكە لە ژیانی دەست پێدەكات. ئەبوزەڕ بە تەبیعەت بیابانی خۆش دەویست، روحی گەورەو بە شكۆی ئەو لە حەساری ژیانی سنووردارو ئاڵۆزدا جێی نەدەبووەو هەڵی نەدەكرد. حەزی دەكرد هەمیشە چاوانی ببڕێتە ئاسۆیانی دوورو بیابانێكی ساف و بەرینی لەبەر چاودا بێ. خووی بە تەنیاییەوە گرتبوو، زیاتر لەسەر ئەو گردە، لە بەردەم خێوەتەكەیدا رۆدەنیشت و دەكەوتە تەمەشای ئەو بیابانە بەرینو ئارامەی كە لە باوەشی بێدەنگییەكی هەمیشەیی و نهێنی ئامێزدا دەژیاو بە سبەینێیەكی شكۆدار ئاوس بوو، و خۆی دەدایە دەم خەیاڵ و ئەندێشەی بێ بنەوە. دیمەنی زەردەپەڕی ئێوارەی خەمناك و گزنگی شادی بەخش و خەندانی خۆری، یەجگار بەلاوە جوانو دڵگیر بوو و مەلی بیریان بەرەو قوڵایی ئاسمان هەڵدەفڕاند. بیری لە رابردووی تاڵ و رەشی خۆی، لە بەسەرهاتی خۆیو ماڵباتەكەیو خێڵەكەی، لە بارودۆخی راپەڕینی نوێو رزگاری بەخش كە رۆژ بە رۆژ پتر ئەم بیابانە پان و بەرینەی عەرەبستانی ئەو خێڵە عەرەبانەی كە لە زۆنگاوی هەژاری و هۆڤیگەریو ركونیدا دەژیان، لە ئامێز دەگرێت، دەكردەوە. كاتێ لەسەر ئەو گردەوە دەیڕوانیە مەدینە، بە چاوی خۆی تێكۆشانی بێ وچانی موسوڵمانانی بە رابەرایەتی محەمەد دەبینی، و كە لە بێدەنگی ئەفسانە ئامێزی بیاباندا نقوم دەبوو، دەنگی شكانی زنجیرانی كۆیلەیەتی دەگەییە گوێ، گوێی لێدەبوو كە عەرەب بە هێزی ئیسلام لە ژێر نیری ئێران و رۆم ئازاد دەبن و سروودی خۆیبوون و ئازای دەڵێن.

هەر شنەبایەك كە دەهات، بە ناو ئەم بێدەنگییە دوورو درێژەدا، هەواڵی خرۆشی ئازادی و جمو جۆڵی یەكێتی و تەبایی میللەتی خۆی و هەنگامەی جەنگی ئیسلامی دەگەڵ پاشای بە كەشو فشو دنیا پەرستی ئێران و ئیمپراتۆری خۆسەرو بە توانای رۆمی بۆ ئەبوزەڕ دێنا. مەككەی پایتەختی عەرەبستانیش تەسلیم بوون، بوونە موسوڵمان، ئەبوزەر هەستی كرد كە هومای ئیسلام سێبەری بەسەر سەرانسەری دوڕگەدا كێشاوەو ئاینی خودا قایم و بتەو بووە. بەردەبارىو تەگبیری ئاقلانەی محەمەد، دێوو شەیتانی هەژاری و پەرێشانی دەگەڵ ناكۆكی و نا تەباییدا لە دوڕگە وەدەرناوەو جیاوازی گەورەی چینایەتیو ئاغایی و كۆیلەیەتی مەیدانیان بۆ برایەتی و یەكسانی راستەقینە چۆڵ كردووە. ئەم سەركەوتنانە دڵی ئەبوزەڕیان تەژی خۆشی و شادی دەكردو بە چاوانی خۆی دەیدی كە لە چاوانی تۆزاوی كۆیلەو گەدایان و خێڵە هەژارو برسی و بێ نەواكاندا تروسكەی شادی و ئومێد پرشنگ دەداتو پرشنگێكی تازە لەسەر چاوانی وشك و سیمای پەژموردە و لێڵی، دەستی زیللەت و زەبوونی و هەژاری، هەڵهاتووەو ئومێدی ژیانو ئایندەی لە ناخدا هێناوەتە جۆش. ئەبوزەڕ بە سەربەرزی دەی بینی كە گەدایان و هەژاران و بێ ماڵ و حاڵان، بوون بە خودانی ژیان و سامانێك و لە بەهرەكانی ژیان بەرخوردار

بوون، بەڵام ئەبوزەڕ بۆ خۆی لەم راپەڕینەدا جگە لە تەمەشای سەرکەوتن و پێشکەوتنەکان چ سوودێکی دی پێ نەبرابوو. لەم رژێمەدا کە بۆ خۆی یەك لە سەران و پێشەوایانی بوو جگە لە خێوەتێکی چکۆلە کە لەسەر گردێکی دەرێی شارا هەڵیدابوو، چیتری پێ نەبڕا بوو. رۆژێ دۆستێکی دەچێتە دیدەنیو هەر چەند دیقەت دەدا چ شتێك لە ناو خێوەتەکەیدا نابینێ، ئەوجا بە سەرسامی روو دەکاتە ئەبوزەڕو دەڵێت ئەبوزەڕ کەلوپەلی ناو ماڵەکەتان کوا؟

- ئێمە ماڵێکی ترمان هەیە، کەلوپەلە باشەکانمان بۆ ئەوێ دەنێرین.
- تا لێرەی دەبێ کەلوپەلێکت هەبێ!
- خاوەنی ئەم ماڵە نایەڵی زۆر لێرە وەمێنین

ئەبوزەڕ ئەوسا روانیە میوانەکەیو گوتی:

- قەسەم بە خوا ئەگەر ئەوەی من دەیزانم تۆ بتزانیبایە لەگەڵ ژنەکانتا نەدەخەوتی و لە ناو جێگەدا ئۆقرەت نەدەگرت، قەسەم بە خوا حەزم لێ بوو خوا بەو درەختەی دروست کردبام هەر کە میوەکەیان دەخوارد دەیان بڕییەوەو لە نێو دەچوو و دەبڕایەوە.
- باشە ئەمە رێ لەوە دەگرێت کە سوود لە دنیا وەربگری؟
- پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: "سەیرم لەو کەسە دێ کە باوەڕی بە جیهانی ئەبەدی هەیەو بۆ ئەم دنیای فریوە هەوڵداوە."

میوانەکەی رۆیی. ئەبوزەڕ بەرەو مزگەوت پەل بووەوەو کە وەژوور کەوت پێغەمبەری بینی بە تەنێ رۆنیشتووە، لە پاڵیا دانیشت، پێغەمبەر رووی کردە ئەبوزەڕو گوتی: ئەی ئەبوزەڕ مزگەوتیش درودو سڵاوی خۆی هەیەو درودوی مزگەوت ئەمەیە کە دوو رکاتان نوێژ بکەیت، بوەستەو نوێژ بکە. ئەبوزەڕ نوێژەکەی کردو ئەوجا هاتە لای پێغەمبەرو دانیشت، چونکە پێغەمبەر بە تەنێ بو،. دەرفەتی هێناو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ داوای نوێژم لێدەکەی، نوێژ چیە؟

- باشترین یاسایە، چ زۆر بکرێ و چ کەم.
- ئەی پێغەمبەری خوا باشترین کار چیە؟
- باوەر بە خوای مەزن و جیهاد لە رای ئەو.
- باوەڕی کام ئیماندار پوختەترە؟
- خۆش خووترینیان.
- ئەی پێغەمبەری خوا، کام ئیماندار موسوڵمانترە؟
- کەسێك کە خەڵکی لە دەست و زمانی سەلامەت بن.
- ئەی پێغەمبەری خوا، باشترین نوێژ کامەیە؟
- نوێژێك کە قنوتی* درێژتر بێ.

***(*قنوت، بریتییە لەوەی دەستەو دوعا لە نوێژا بوەستی و دەستان بە رادەیەك بەرز بکەیەوە کە بەر چاوت بگرێ، بە تایبەتی لە رکاتی دووەماو بەر لە چوونە رکوع. ح.ع).***

- ئەی پێغەمبەری خوا، کام دوور کەوتنەوە باشترە؟

– دوور کەوتنەوە لە گوناحان.

– ئەی پێغەمبەری خوا، ڕۆژوو چییە؟

– واجبێکە کە لەلای خوا پاداشتی چەندین چەنانەی هەیە

– ئەی پێغەمبەری خوا، باشترین جیهاد کامەیە؟

– جیهادی کەسێکە کە دوای ئەسپەکەی بکەون و خوێنی بڕێژن.

– ئەی پەیامبەری خودا، ئازاد کردنی کام بەندە باشترە؟

– بەندەیەك کە لای خاوەنەکەی گرانبایی ترو خۆشەویست تر بێ.

– ئەی پێغەمبەری خوا، کام بەخشش باشترە؟

– بەخششی پیاوێکی کەم سەرمایەی کەم دارایی کە لەدەسترەنجی خۆی کۆمەك بە هەژار بکات.

– کام ئایەت لەو ئایەتانەی کە خودا بۆ تۆی ناردووە گەورەترە؟

– ئایەتەل کورسی* ئەی ئەبوزەڕ، حەوت تەبەقەی ئاسمان لە هەنبەر کورسیدا، وەکو ئەڵقەیەکە فڕێ درابێتە بیابانێکەوە.

***[* بۆ مانای کورسی و عەرش، بڕوانە بۆچوونی زانایانی ڕەحمەتی کاشیفول غیتا، لە کتێبی الفردوس الاعلی دا].***

– خواوەند چەند کتێبی ناردووە؟

– سەدو چوار کتێب، بۆ شیت پەنجا کتێب و بۆ ئەخنوع سی کتێب و بۆ برایم دەو بەر لە تەورات بۆ موساش دە کتێب و پاشان تەورات و ئینجیل و زەبوورو قورئانی نازل کردووە.

– ئەی پەیامبەری خودا، کتێبەکانی برایم چ بوون؟

– هەموویان پەندو حیکمەت بوون: "ئەی شای قۆرە دەماغ و بە خۆ گیرۆدەو سواری کۆڵی خەڵکی! من تۆم هەڵبژاردووە تا لەلایەن منەوە دادی مەزڵومانو بەلەنگازان بسێنی". و لەم جۆرە پەندانەی تیا بوو: "ئاقڵ چەند سەعاتێکی لەبەر دەستە، سەعاتێ کە خوای تیا بپەرستێ و لێی بپارێتەوەو سەعاتێ کە بۆ پەروەردگاری تەرخان دەکاتو سەعاتێ کە بۆ بە دەست هێنانی خواردن و خواردنەوەی پێویستی خۆی تەرخان دەکات، و ئاقڵ لەسەرێتی جگە لەم سێ کارە هیچی تر نەکات: کۆکردنەوەی توێشوو بۆ ڕۆژی پەسلانێ، هەوڵدان بۆ ژیان و لەزەت بردنی حەڵاڵ، لەسەر ئاقڵە کەوەخت ناس بێ، بە کاری خۆی را بگا، پاسەوانی ژیانی خۆی بێ، و گوتارو ڕەفتاری چوون یەك بێ، لە حاڵەتی زەرورەت و پێویست دا نەبێ قسان نەکات".

– ئەی پێغەمبەری خودا، کتێبەکانی مووسا چ بوونە؟

– هەر هەموو عیبرەت بووە: "سەیرم بەو کەسە دێ کە باوەڕی بە مەرگەو شادی دەکات، سەیرم لەو کەسە دێ کە یەقینی بە ئاگر هەیەو پێدەکەنێ، سەرم لەو کەسە سوڕماوە کە باوەڕی بە چارەنووس هەیەو ئازار دەچێژێ، خەفەت دەخوا، سەیرم لەو کەسە دێ کە دنیا دەبینێ و بێ وەفایی دنیا لەگەڵ کەسوکاری خۆیدا تەمەشا دەکات و متمانەی پێ

دەكات، سەیرم لەو كەسە دەمێنێ كە باوەڕی بە لێپێچانەوەی سبەی هەیەو كاری بۆ ناكات."

- ئەی پێغەمبەری خوا، ئامۆژگارییەكم بكە.
- ئامۆژگاریت دەكەم كە تەقوا بكەیت و ئەوە بەرزترین شتە.
- ئەی پێغەمبەری خوا، زانیاریم زیاد بكە.
- قورئان بخوێنە، خوێندنی قورئان بۆ تۆ لە زەویا نورو روناكییەو لە ئاسماندا یادو زیكرە، خۆت لە پێكەنینی زۆر بپارێزە چونكە دڵت دەمرێنێ و رۆشنایی رووت دەبات.

بۆ چاكە نەبێ قسە مەكە، چونكە بێدەنگی شەیتانت لێ دوور دەخاتەوەو دینت بتەو دەكات، بەلەنگازو نەداران بحوبێنەو دەگەڵیان دانیشە، بڕوانە كەسانی خوار خۆت نەك سەرووی خۆت، چونكە وا چاكە شوكرانە بژێری ئەو نیعمەتە بی كە خوا پێی داوی و بە كەمی نەزانی، خزمانت بەسەر بكەوە با لێشت دڕدۆنگ بن، لە پێناوی خوادا لەسەر زەنشتی هیچ كەسێك مەترسە، لە پێناوی خوادا لە لۆمەی هیچ كەسێك مەترسە، هەق بڵێ ئەگەر رەق و تاڵیش بێ، خۆت شتێكت تیا بوو، لەسەر ئەو شتە عەیب لە خەڵكی مەگرە، كە خۆت كارێكت كردبوو، لەسەر ئەو كارە سەرزەنشتی خەڵك مەكە، چونكە هەمان عەیبت بەسە كە عەیبێك لە خۆتا هەبێ و نەیبینیو ئەو عەیبە لە خەڵكی بدۆزیتەوەو بگری، یان كاری خراپی خۆت نەبینیو لە خەڵكیا بدینی.

پاشان بە دەست لە سینگی ئەبوزەڕی داو فەرمووی: ئەی ئەبوزەڕ هیچ ئەقڵێك وەكو راوێژو تەگبیرو هیچ عیبادەتو پارساییەك وەكو خۆپارێزی و هیچ چاكییەك وەكو خۆش خوویی نیە.

## بەرەو مەكە

***(بێژە: ئەوا راستی هات و چرووك نەما، دیارە چرووك لە نەمانە. سورەتی ئیسرا، ئایەتی ٨١)***

محەمەد لە مزگەوتدا، دەگەڵ كۆمەڵێكدا دانیشتبوو، كڕو كپ لە فكران راچوو بوو. هەموو وایان زانی كە سروش و سەرۆی بۆ دابەزیوە، بۆیە بەو حاڵەوە وازیان لێ هێنا بوو، كات بە بێدەنگیەكی رەهای راز ئامێز دەبوری و جگە لەو هزرە جۆراو جۆرانەی كە لە مێشكاندا كەتبووە جمو جۆڵ ئیدی سرتەو ورتە لە كەس نەدەبینرا، هەموو كڕوكپ و خامۆش چاوەنۆڕی كۆتایی ئەم بێدەنگییە بوون، دەتگوت باڵندەیەك بەسەر سەریانەوە نیشتووەتەوە كە ئەگەر قسەیەك یان جوڵەیەك بكەن، هەڵدەفڕێ. شیرازەی ئەم بێدەنگیە بە هاتنی ئەبوزەڕ پچڕا، ئەبو زەڕ بە زەحمەتو پاڵەپەستۆ بە بەینی ئاپۆڕاكەدا خۆی گەیاندە پێغەمبەرو لە بەرانبەریدا رۆنیشت، پێغەمبەر رووی تێكردو فەرمووی: ئەبوزەڕ ئەمڕۆ نوێژت كردووە؟

– نە.

– رابە نوێژەكەت بكە.

ئەبوزەڕ رابوو و نوێژی دابەست، چوار ركات نوێژی نیوەڕۆی كرد، پاشان پێغەمبەر رووی تێكردو گوتی: ئەبوزەڕ، لە شەڕی ئەهریمەنانی جنو ئینسان پەنا بەرە بەر یەزدان!

– ئەی پێغەمبەر، چما بە شەریش ئەهریمەنانیان هەیە!

– بەڵێ ئەهریمەنانی جن و ئینسان قسەی جوان و فریودەر بە گوێی یەكدا دەدەن.

پێغەمبەر بێدەنگ بوو، ئەبوزەڕیش خامۆش بوو، و ئەم قسەیەی محەمەد سەدان بیرەوەری خەوتووی ناو مێشكانی بێدار كردەوە، دیسان پێغەمبەر فەرمووی:

– ئەبوزەڕ، ناتەوێ هەندێ وشەت لە گەنجی بەهەشت فێر بكەم؟

– بۆ نا، گیانم بە فیدات

– بڵێ: "هێزو توانا، تەنیا بۆ خوایە".

دیسان بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو لایەكدا كێشا.

لە ناكاو عەمری كوڕی سالم بە هەشتاو خۆی بە مزگەوتەكەدا كرد، و پەشێوو پەریشان بەرەو پیری پێغەمبەر هات و لەبەر دەمیا وەستاو گوتی:

– ئەی پێغەمبەری خوا، قورەیش پەیمانی حودەیبییەیان شكاندووە.

لە پڕ ئاپۆڕای خەڵكەكە لە هەر سوچێكەوە، بە سەرسامی هاواریان كرد چۆن؟! چۆن!؟

– خێڵی من (خوزاعە) بە بەرەی تۆو خێڵی بەكر بە بەرەو پەیمانی قورەیش پابەند بوون، بە خۆت دەزانی بەینی ئێمەو خێڵی بەنی بەكر ناخۆشەو شەڕو شۆڕی كۆنمان لە بەینا هەبووە كە لە دوای پەیمانی ئاشتی حودەیبییەوە ئەم شەڕانە وەستا بوو، بەڵام لەوەتای تۆ لە جەنگی (موتە)دا تۆڵەت لە رومیەكان نەستاند قورەیشەكان وایان زانی كە لە دوای ئەم شەڕەوە ئیدی ئەو زەمانو رۆژگارە بەسەر چوو كە تو بتوانی پشت راست بكەیەوەو دەسەڵاتێك بە دەست بێنی، لەبەر ئەمە بەنی بەكریان لە ئێمە هاندا، رۆژێ ئێمە بەسەر ئاوێكی خۆمانەوە بووین لە ناكاودا

هێرشیان هێنایە سەرمان و ژمارەیەکیان لێ کوشتین، و جا من ئەی پێغەمبەری خوا هانام وەبەر تۆ هێناوە تا لە شەڕی ئەوانەدا کە زێدەگاڤیان کردووەتە سەرمان، یارمەتیمان بدەی.

پێغەمبەر بە دەنگێکی پڕ دڵنیاییەوە فەرمووی: عەمری کوڕی سالم خەمت نەبێ یارمەتی دەدرێی! ئەوسا پێغەمبەر بە قووڵی لە فکران راچوو و لایەنە جۆراو جۆرەکانی ئەم کارە خەتەرەی، کە هاتبووە پێشێ، تاوتوێ کردو سەیری کرد کە بۆ نیشاندانی کاردانەوەی شکاندنی ئەم پەیمانە هیچ چارێك نییە جگە لە فەتح و گرتنی مەکە. ئەوسا چەند پەیك و تەتەرێکی بۆ دەوروبەری دوڕگە نارد تا بۆ ئەنجامی دەستورەکانی ئایندەی ئامادە بن. پێغەمبەر خۆی بۆ ئەم فەتحە گەورەیە تەیار دەکردو زۆری بیر لەوە دەکردەوە کە چ تەگبیرێك بکات تا مەککە بەبێ خوێن رشتن تەسلیم بێ، پاشان لێڕا بێ ئەوەی بێڵێ خەڵکەکە بزانن بۆ کوێ دەچن، بۆ شەڕ ئامادە و تەیار بکات، تا خەڵکی مەککە لە نەخشەکەی ئاگادار نەبنەوەو بێ ئەوەی خۆ بۆ بەرگری سازبدەن، بکەونە بەر ئەمری واقیعو تەسلیم بن.

خەڵکی بێ ئەوەی بزانن کێوە دەچن بۆ شەڕ ساز بوون، و پێغەمبەر پاش پێشڕەوی لەشکر، خۆی دەگەڵ ئەبوزەڕدا هاتە دەرێ تا ئاگاداریان بکاتەوە کە بە نیازی مەککەیە تا ماڵی خوایان بکەوێتە دەست. بە دەم رێوە بەرەو لای درەختێك چوو، دوو لقی درەختەکەی گرت و رایتەکاندو گەڵاکانی رژانە سەر زەوی، و ئەوجا فەرمووی:

– ئەبوزەڕ!

– بەڵێ پێغەمبەر!

– بەندەی موسوڵمان، نوێژ بۆ رەزامەندی خوای بەرزو مەزن دەکات و گوناحەکانی وەکو گەڵای ئەم درەختە دەوەرێن.

ئەوجا بە دوو قۆڵی کەوتنە رێ تا گەییشتنە لەشکرەکە،و پێغەمبەر دەستووری دا کە بەرەو گرتنی ناوەندی شار پێشڕەوی بکەن و لە خوا پاڕایەوە کەخەفێ و شۆفارانی قوڕەیش بە هێرشەکەیان نەزانن، و پێی گوتن کە دەبێ لە پێناوی ئەم کارە دژوارەدا هەوڵ و کۆششێکی فرە بدەن. لەشکر لە مەدینەوە بەرەو مەککە پێشڕەوی کرد، مەدینە لەشکری وا بە شکۆو بە سامی بە خۆوە نەبینی بوو، ئەبوزەڕ بە درێژایی رێگە لە پێغەمبەر دوور نەدەکەوتەوەو خزمەتی دەکردو بۆ دەمێك لێی غافڵ نەدەبوو.

لەشکری موسوڵمانان گەییە (مەڕوزەهران)، لەم کاتەدا ترس و شڵەژان و پەشێویەکی نادیار باڵی بەسەر مەککەدا کێشابوو. خەڵکی سەراسیمەو سەرگەردان، ئەبو سوفیان و بەدیلو حەکیم یان بۆ هەواڵ و باسان، بۆ دەرێی مەککە نارد.

عەباس، سواری هێسترەکەی پێغەمبەر بوو بوو و رێی دەکرد، لە پڕ گوێی لە گفتوگۆیەك بوو، وەستاو گوێی هەڵخست، ئەبو سوفیان و بەدیل پێکڤە داخافتن:

ئەبو سوفیان: "ئەمانە خەڵکی خوزاعەن کە بۆ شەڕ وا خڕ بوونەتەوە".

ئەبو سوفیان: "خێڵی خوزاعە ئەوەندە نین کە ئاگرێکی وەها هەڵگیرسێنن و لەشکرێکی وەهایان هەبێ".

عەباس، دەنگی ئەبو سوفیانی ناسییەوەو بانگی لێکرد:
– ئەبو حەنزەڵە!* *[* دەکاتە ئەبو سوفیان].*
ئەبو سوفیانیش عەباسی ناسییەوە و بانگی لێکرد:
– ئەبو فەزڵ* *[* دەکاتە عەباسی مامی پێغەمبەر]* چ خەبەرە؟
– ئەمە پێغەمبەری خوایە، واوەیلا بە حاڵی خەڵکی ئەگەر بە تۆبزی بێتە ناو مەککە.
ئەبو سوفیان راجفری و بە ترسەوە گوتی:
– چار چییە؟ داك و بابم بە قوربانت
عەباس، هەڵیداشتە تەرکی هێسترەکەی پێغەمبەرەوەو بە رێ کەوت، خەڵکەکە کە چاویان بە هێسترە سپییەکەی پێغەمبەر دەکەوت رێگەیان دەکردەوەو ئەو جووتە بە نێو ئەو ئاگرەدا کە ئەم دە هەزار لەشکرە بۆ ترساندنی مەککەییەکان هەڵیانگیرساند بوو، رەت دەبوون، کە بە بەر ئاگرەکەی عومەردا تێ پەڕین، عومەر چاوی بە ئەبو سوفیان کەوت، تێ گەیی کە عەباس دەخوازێ پەنای بدات، بۆیە بە هەشتاو خۆی گەیاندە خێوەتەکەی پێغەمبەرو تکای کرد کە دەستوور بدات تا لە ملی بدەن، عەباس گوتی: ئەی پێغەمبەر من پەنام داوە، قەرقەشەیەکی توند لە نێوان عەباس و عومەردا دەستی پێکرد، ئەوسا محەمەد بە عەباسی فەرموو:
عەباس! ببیە لای خۆت و سبەینێ بیهێنە لای من، سبەی بەیانی گەورە پیاوانی موهاجیرو ئەنسار هاتنە خزمەتی محەمەدو ئەبو سوفیانیان هێنا، پێغەمبەر گوتی:
– واوەیلا بە حاڵت ئەبو سوفیان، هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە کە بزانی خودا یەکەو نابێ بە دوو؟
– داك و بابم ببنە قوربانت، چەند لێبوردەو جوامێری، چەند دەگەڵ خزم و خوێشانت بە دلۆڤانی رەفتار دەکەی، قەسەم بە یەزدان من پێم وایە ئەگەر جگە لە خوای تاق و تەنیا خوایەکی دی هەبووایە تا ئێستا شتێکی هەر دەکرد.
– وای لە حاڵت ئەبو سوفیان! هێشتا وەختی ئەوە نەهاتووە کە بزانی من نێردراوی خودام؟!
– باب و داکم بە فیدات بن، چەند لێبوردەو جوامێری، چەند بە دلۆڤانی دەگەڵ خزم و خوێشانت دا رەفتار دەکەی، بە زاتی خوا لە دڵی خۆدا وا بیر دەکەمەوە کە بێ.... هیچ نیە.
عەباس رووی کردە ئەبو سوفیانو داوای لێ کرد پێش ئەوەی لە ملی بدەن ئیسلام ببێ، ئەبو سوفیان بێ هیچ بەرگرییەك ئیسلام بوو.
لەشکر بەرەو مەککە جما، محەمەد دەگەڵ جماعەتی موهاجریندا بەو گردەدا کە مەککەی کەوتبووە پشتەوە، سەرکەوت کە گەییە سەر شاخی (زی تەوا) دیمەنی مەککەی پاش حەوت ساڵ غوربەت، حەوت ساڵی پڕ لە ئاشوب و خەتەر بینی، لەسەر ئەو شاخەوە تەمەشای هەر لایەکی دەکرد، بیرەوەرییەکی لەلا زیندوو دەبووەوە، بە قوڵی دەیڕوانییە کێوی حەڕا، ئەو شەوە درێژانەی وەیاد دەهاتنەوە کە بە تەنیاو بەبێ دەنگی،و بە دەم هزرینەوە لەوێندەری رادەبوارد، یادی ئەو شەوەی کە سروش و سەرۆی بۆ هاتە خوارەوە، لە مێشکا بێدار بووەوە، دەیڕوانییە بیابانەکان و یادی رۆژانی شوانی و بازرگانی خۆی دەکردەوە، تەمەشای شاری دەکرد و ئەو هەموو ئەزیەت و ئازارەی کە دیبووی وەبیر دێنایەوە. تەمەشای خەدیجەی دلۆڤان و خەمخۆرو

ماڵی بە شکۆی خوای دەکرد لە هەر سوچ و گەڕەك و کوچەو کۆڵانێکەوە یادگاری تاڵ و شیرین دەهاتنە دیدەنی، محەمەد وەستا بوو و چاوە تامەزرۆکانی بە نێو شاخەکانی دەوروبەرو ئەو دۆڵەی کە ماڵەکانی مەککەی تیا بڵاو بوو بووەوە، دەگەڕان. بیرەوەری لە نێوان بێدەنگی و ئارامیەکی راز درکێن دا بە بەردەمیا رەت دەبوو، لە پڕ دڵۆپە فرمێسکی درشت بەگۆناکانیا هاتە خوارێ و دڕی بە بێدەنگییەکە دا، محەمەد چووە سوجدە.

لەلای گۆڕەکەی خەدیجەو ئەبو تالیب، شوێنێکی تایبەتیان بۆ رێك خستبوو، لێیان پرسی: ئایا بۆ ئیسراحەت دەچێتە ماڵەکەی خۆی؟

محەمەد گوتی: نە، هیچ ماڵێکیان لە مەککەدا بۆ من نەهێشتووەتەوە!

پاش ئەوەی لە شوێنەکەی خۆی، لەلای گۆڕەکەی خەدیجەو ئەبو تالیب ئیسراحەتی کرد، سواری وشترەکەی بوو و لە کێوەکەوە داگەڕا، ئەبوزەڕ ئیربارێکی، کە بە ماجوم کون و کەلێنەکانی ناوەوەو دەرەوەی سواخ درا بوو، تەژی ئاو کردو هێنایە پێشی و پەردەیەکی بۆ محەمەد گرت تا خۆی شت. محەمەدیش هەمان کاری کردو ئەبوزەڕیش خۆی شت، ئەوجا بە شەوق و زەوقەوە بە هەشتاو بۆ زیارەتی کابە رۆییشتن، پێغەمبەر حەوت جاران بەسواری تەواف کابەی کردو ئەوجا دەرگاکەی کردەوە، ئەمە هەستیارترین ساتی مێژوو بوو. بەو زووانە کۆتایی بت پەرستی و سەرەتای یەکتاپەرستی رادەگەیەنرێ. بتەکان دوا ساتەکانی قەدرو عیزەتی خۆیان تەی دەکرد، محەمەد لەبەر دەرگای کابەو روو لە خەڵکەکە وەستا. قورەیش‌و زۆرانبازی مەرگ و ژیانیان لە لێوەکانی ئەودا دەبینی، چاوانی چاوەڕوانیان بڕی بووە لێوانی ئەو تا زمانی محەمەد کۆتایی ئەم زۆرانبازییە رابگەیەنێ‌و چارەنووسی مەککەی شکست خواردوو دیاری بکرێ، خەتەری تۆڵە لە نێو بێدەنگی و ئارامیەکی ئاوس بە رووداوانی گەورەدا شەپۆلی دەدا.

لە ناکاودا محەمەد زمانی هەڵێنا: ***"ئەی خەڵکینە! هەر لە نێرو مێیەکەوە ئێوەمان وەدی هێناوەو کردوومانن بە چەند گەلێك‌و چەند هۆزێك هەتا یەکتری بناسن، بەڕێزترینتان لای خودا، پارێزگارترەکانتانن، خوا زانایەو ئاگادارە، سورەتی حوجورات، ئایەتی ١٣)***

هێشتاش ئەو ترس و لەرزەی کەوتبووە گیانی قورەیش نەڕەوییەوەو چاوەڕوانی ئایندەیەکی ترسناك بوون. ئایا تۆڵەیان لێ دەستێنێ؟ ئایا قەتڵ و عامیان دەکات؟.. پاشان پێغەمبەر پرسی: ئەی گەلی قورەیش! رەفتاری من سەبارەت بە خۆتان چۆن پێشبینی دەکەن؟

– چاکە دەکەی، تو برایەکی گەورەو کوڕی برایەکی گەورەو جوامێری.

– بڕۆن، ئازادن.

محەمەد لە کاتێکا زۆری کەیف بەم عەفوە کە لە تواناوە هاتبوو، دەهات، بە ناو کابە کەوت و بەو دار دەستەی بە دەستییەوە بوو ئاماژەی بۆ ئەو بتانە دەکرد کە بە چوار دەورا ریزیان کردبوو، و لە کاتێکا دڵی لێوان لێو بوو لە ستایش و ملکەچی لە هەنبەر توانای خوادا دەیگوت: ***"... ئەوا راستی هات و چرووك نەما، دیارە چرووك لە نەمانە. سورەتی ئیسرا، ئایەتی ٨١"***، بتەکان لە هەموو لایەکەوە بە پشتاو بە دەما دەڕمان‌و ئاپۆراکە یەك دەنگ بە خۆشی و شادییەوە ئەم دروشمەیان دووبارە دەکردەوە،و ئەبوزەڕیش کە پەیتا پەیتا بتی دەشکاند و تۆفانی شادی

**وخۆشی لە ناخیا هەستا بوو، وفرمێسکی شادی دەرشت، لە کانگەی دڵیەوە دەگەڵ ئەوانی دیـدا هورای دەکێشا.**

***(... ئەوا راستی هات و چرووك نەما، دیارە چرووك لە نەمانە).***

## له جیهانی فریشتەدا

***ئەی محەمەد***

***قەسەم بەو کەسەی کە تۆی بە پێغەمبەری هەڵبژاردووە***

***ئەبو زەڕ لە مەلەکوتی ئاسمانانیدا ناسراوترە تا لە سەر زەمین.***

***"جبرائیل"***

خێڵە عەرەبان روویان دەکردە محەمەد و دەستە دەستە دەهاتنە سەر ئاینی خودا، ئاڵای ئیسلام لە سەرانسەری دوڕگەی عەرەبستاندا هەڵکرا بوو، پێغەمبەر پیاوانی بۆ وەرگرتن و کۆکردنەوەی باج و زەکات بۆ دەوروبەر دەنارد، شوێنەواری سەروەت و دەوڵەمەندی لە ناو موسوڵماناندا دەرکەوتبوو، برسییان تێر بوو بوون و ماڵ و دارایی حەڵاڵیان بەدەست هێنا بوو و لە هەژاری و دەسکورتی رزگار بوو بوون.

ئەدی ئەبوزەڕ؟ ئەبوزەڕ دەستبەرداری پارسایی و خواناسی نەبوو بوو جگە لەو خۆراکەی لە جۆ دروستی دەکرد چیتری نەبوو. رۆژێ ئەبوزەڕ چوو بۆ رەبەزەو مودەتێك لەوێ مایەوەو پاشان بۆ مەدینە گەڕایەوە، لە رێوە یەکسەر چوو بۆ لای پێغەمبەرو لەلایەوە دانشیت. کڕوکپ و بێدەنگ بێ ئەوەی بچووکترین قسە بکات.

پێغەمبەر گوتی: ئەبوزەڕ!

ئەبوزەڕ هەر بەو دەقەوە، بە بێ دەنگی سەری داخستبوو و هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

محەمەد: ئەبوزەڕ! دایك رۆ رۆت بۆ بکا!

ئەبو زەڕ (بە دەنگێکی شەرمنی سووك): لەشم پاك نییە.

پێغەمبەر قەرەواشێکی گاز کردو دەستووری دا کە ئاو بێنێ، ئەبوزەڕ ئاوەکەی وەرگرت چووە پشتی وشترەکەیەوەو غوسڵی دەرکرد، ئەوسا گەڕایەوەو سڵاوی کردو رۆنیشت. پێغەمبەر گوتی: ئەگەر بیست ساڵیش ئاوت دەست نەکەت خۆڵ کافیەو هەر کاتێ ئاوت دەسکەوت خۆت بشۆ.

پێغەمبەر خەریك بوو پەندی ئەبوزەڕی دا دەداو ئەبوزەڕ بە گوێی گیان قسە شیرین و گیانبەخشەکانی ئەوی دەنۆشی کە (ئیبن لیتیە) کە یەکێك لە کار بەدەست و مامورانی وەرگرتنی باج بوو لە رێوە هات و ئەوەی دەگەڵ خۆیدا هێنا بووی کردی بە دوو بەشەوەو گوتی: ئەم بەشەیان هی ئێوەیەو ئەمەشیان بە دیاری داوە بە خۆم. سیمای پێغەمبەر لە توڕەییدا گڕی گرت، ئەبوزەڕ کە ئەم دیمەنەی بینی رووی تێکردو بە توڕەیی و سەرسامی گوتی: چۆن بە دیاری داویانە بە تۆ؟

پێغەمبەر کە هێشتا شوێنەواری شڵەژان و توڕەیی بە چارەیەوە دیار بوو، وەستاو رووی کردە خەڵکەکە، پاش ستایش و سوپاسی خوا گوتی: من بۆ ئەنجام دانی ئەرك و واجبێك کە خوا خستویەتیێ ئەستۆم، چەند کەسێکم لە ئێوە راسپاردووە کەچی یەکێکیان دێ و دەڵێ ئەم بەشە بۆ ئێوەو ئەم بەشەی تریش پێشکەشەو بە خۆمیان داوە؟

قەسەم بەو کەسەی کە گیانم لە دەستی ئەودایە هەر کەسێك شتێك لە سەروەت و سامانی خەڵکی هەڵگریّ و لابداتە لاوە لە ڕۆژی پەسلاّندا ئەو وشترە یان پەزو گایەی کە لە خەڵکی وەرگرتووە، دەکەنە کۆڵی و لە کاتێکا ئەو حەیواناتە هاواری لێدەکەن بە ریسوایی دەیهێننە ساراو مەیدانی مەحشەر.

ئیبن لیتیە هەموو ئەوەی هێنا بووی دایەوەو هیچی لیّ هەڵنەگرت. ئەبوزەڕ رووی تێکردو گوتی: وا باشترە. ئیبن لیتیە گوتی:من نەمدەزانی.. لە کاتێکا کە سەری داخستبوو و پەشیمانی و شەرمەزاری رووی داگرتبوو، بێدەنگیەکی خەمناك دەوری دابوو، غەڵبە غەڵب و پەشێوییەکی زۆر لە ناخیا بەرپا بوو بوو.

ئەبوزەڕ گوتی: خەمبار مەبە! چاك بزانە دنیا ماڵی کەسێکە کە ماڵی نەبیّ، سەروەت و سامان هی کەسێکە کە هیچ سەروەتێکی نیەو کەسێك هەوڵی بۆ دەدات کە یەقینی نیە، بڕۆ تەوازۆ بۆ پێغەمبەر بێنەوە، داوای بوردنی لیّ بکە.

ئیبن لیتیە چوو بۆ لای پێغەمبەر عوزرخوایی لێکردو داوای بوردنی کرد، پێغەمبەر فەرمووی: خودا دەڵێت: ***"ئەی بەندەکانم هەمووتان گوناح کارن مەگەر ئەوەی بەخۆم رزگارم کردبیّ و خستبمە سەر ڕێگای راست، کەواتە داوای بوردنم لیّ بکەن تا چاو پۆشیتان لیّ بکەمو بتان بورم هەر کەسێك من بە توانا دەزانیّ و داوای بوردن دەکات، بە توانایی خۆم دەیبەخشم و لاریم لەوە نییە، و هەروەها هەمووتان گومڕان جگە لەوەی کە خۆم ڕێنوێنیم کردبیّ، هەمووتان هەژارن، مەگەر یەکێك کە من دەوڵەمەندم کردبیّ، کەواتە داوا لە من بکەن تا دەوڵەمەندتان بکەم..."***

پێغەمبەر هەستاو ڕۆیی و خەڵکەکە هەر کۆمەڵەو لە ئاشێکیان دەکرد، ئەبوزەڕیش سوپاس و ستایشی خوای دەکردو گاڵتەی بە دڵبەستن بە دینی دنیای پوچ و فانی دەکردو مژدەی بەهەشتی جاویدانی بەو کەسانە دەدا کە دڵی هەژاران و رەش و رووتان خۆش دەکەن و یارمەتیان دەدەن و سەروەت و سامانی خۆ لە رای خوا دابەش دەکەن و خۆ لە سەرمایەداری و زێڕ کۆکردنەوە دوور دەگرن و داوای یەکسانی لە هەموان دەکرد. خەڵکەکە بلاّوەیان لێکرد، و ئەبوزەڕ بە قەستی ماڵی خۆی وەدەرکەوت، لە ڕێگەدا تووشی پێغەمبەر بوو و کە جبریل- ی لە قیافەتی پیاوێکدا لەگەڵ بوو، ئەبوزەڕ بیّ ئەوەی سلاّو بکات بەلایاندا تێپەڕی.

جبریل: ئەمە ئەبوزەڕە، ئەگەر سلاّوی بکردایە وەلاّممان دەدایەوە.

محەمەد: بۆ دەیناسیت جبریل؟!

جبریل: سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە هەق بە پێغەمبەرایەتی هەڵبژاردووە، ئەبوزەڕ لە مە لەکوتی ئاسمانانندا ناسراوترە تا لەسەر زەوی.

محەمەد: بە چی بە م پایەیە گەییوە؟

جبریل: بە پارسایی و دینداری و لە خواترسی لەم دنیای فانیەدا.

## دەبێ ئەبوزەڕ بێ

هەواڵ گەییە پێغەمبەر کە لە شام دا ئاپۆڕایەکی فرە خڕ بوونەتەوە، هیراکلیوسی ئیمپراتۆری روم، سەربازەکانی پڕ چەك کردووەو خێڵ و هۆزێن لوحوم و جەزام و عامیلە و غەسانیش دەستیان دەگەڵی تێکەڵ کردووەو هیراکلیوس بریای شەڕی باکووری عەرەبستانی داوە تا یادو بیرەوەری ئەو جەزرەبە ناخافڵەی کە موسوڵمانان لە شەڕی (موتە)دا نیشانیان دا بوو بسڕێتەوە. محەمەد کە لەم کاتەدا یەکجار سەرقاڵی سەقامگیرکردنی تەناهی و ئاسایشی ناوخۆی مەملەکەت بوو، ناچار بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم دوژمنە بە هێزو لەزەبرو ترسناکە خۆی ئامادەو تەیار بکات، هەوای عەرەبستان لە ئاخرو ئۆخری تاوستانداو بە تایبەتی لە سەرەتاکانی پایزدا، یەجگار گەرم دەبێت. محەمەد دەبوایە لەم کەش و هەوایەدا بەرەو رووی جەنگ بجمێ، ئاگر لە ئاسمانەوە دەباری‌و تیشکی سوتێنەری خۆر کە دەتگوت زۆر لە زەوییەوە دوور نییە، بیابانی وشك کردبووەوە. سوپای موسوڵمانان لەلایەکەوە دەبوایە بۆ شەڕی روم لە وڵات وەدەرکەون و بۆ شام بڕۆن، و ئەم رێگە درێژو مەترسیدارە بەو گەرما کوشندەیەی کە مێشکی لە کاسەی سەراندا دەبرژاندو خوێنی لە دەماراندا هیشك دەکرد بڕن. ورەی ژمارەیەك لە سست باوەڕان نزم بووەوەو بۆ ئەوەی پێغەمبەر لەم سەفەرە ژێوان بکەنەوەو موسوڵمانان سەرپێچی لە دەستورەکانی بکەن، کۆمەڵێك پیلانیان گێڕاو دەستیان دایە کۆمەڵێك بانگەشەو جەمو جۆڵی فراوان. مەترسی ئەم جەماعەتە لەو کاتە ناسك وەهەستیارەدا زیاد دەبوو، محەمەد هەستا ئاگری لەو ئەنجوومەنە بەردا کە ئەمانە تیایدا خڕ بوو بوونەوەو نەخشەیان دادەنا، بەمە ئەو خەترو مەترسییەی لەسەر خۆی لابرد. محەمەد هەر گاڤێ چووبا شەڕی، سوپاکەی خۆی بە کوێرە رێگایاندا دەبرد تا دوژمن غافڵگیر بکات، بەڵام ئەم جارەیان لە یەکەم هەنگاوەوە شتەکەی درکاند، چونکە کارەکە کارێکی سەخت‌و ترسناك بوو و دەبوایە سوپاییان بە ویست و ئارەزووی خۆیان و داوخوازانە بەشداری بکەن، هۆزو تیرەکان لە مەدینە خڕ بوونەوەو دەوڵەمەندانیش هیچ درێغییەکیان لە کۆمەکی دارایی بۆ سازدانی سوپا نەکرد، ئەم سوپایەیان لەبەر ئەوەی زەحمەتێکی فرەی دیتبوو ناو نا ((سوپای تەنگانەو دژواریان)).

ئەبوزەڕ زانی کە پێغەمبەر بۆ شەڕی ئیمپراتۆر بەرەو تەبوك دەڕوات، بڕیاری چوونی دا، چوو بەلای وشترەکەیەوە، سەیری کرد زۆر لەڕو بێ تاقەت وشەکەتەوبەرگەی ئەم رێگا دوورو درێژو سەختەی بەینی مەدینەو تەبوك ناگرێ، کەمێك لە فکران راچوو، بە ئەسپایی لە بن لێوانەوە گوتی: "چەند رۆژێك ئالیکی دەدەم تا گوڕێکی وەبەر دێتەوەو هەنگێ دەگەڵ پێغەمبەرا دەڕۆم".

سەفەری دوورو درێژو گەرمای کوشندە بوو بوو بە بیانووی دەستی سست باوەڕان بۆ ئەوەی نەچنە شەڕو لە شارا وەمێنن، ئەوانەی کە نە ماڵی دنیایان هەبوو و نە بارەبەری سەفەریان هەبوو، بەڵام بڵێسەی ئیمان و ئاگری تاسەی شەڕ لە رای خودادا لە ناخیاندا کڵپەی دەسەندو جگەری دەخواردن، بەلالانەوەو پاڕانەوەوە داوایان لە پێغەمبەر دەکرد کە لەگەڵ خۆیدا بیانبات، تا لەم شادی و بەختەوەرییە گەورەییە بێ بەش نەبن، پێغەمبەریش هێندەی لە توانای دا بوو

وەسیلەی سەفەری دەستەجەمی بۆ فەراهەم کردن و ئەوانی دیکەی جواب کردو گوتی: "چ شتێك شك نابەم سواری بن". ئەم گروپە لە کاتێکا کە خەم گیانی دەسوتاندن و گریی پەژارەو کەسەر ئەوکی دەگوشین، بە چاوانی فرمێسکاوی و بە عەزرەتەوە دەیانڕوانییە موجاهیدەکان،* *[* لەبەر ئەمە ئەم گروپە ناونران بەکائین، واتە چاو بە فرمێسکان].*

محەمەد توانی بە کۆششی بێوچان سی هەزار کەس بۆ شەڕی روم تەیار بکات، لەشکر لە دەریی مەدینە نوێژیان کردو ئەوجا وەڕێ کەوت. لە هەموو لایەکەوە گەردوتۆز هەستا،و دوای تۆزێك لە قولایی بیاباندا لە چاوی ئەو ژن و منداڵانەی کە لە سەربانەکان وێستا بوون، ون بوون و (چاو بە فرمێسکان)یش بە نائومێدی و گریان و خەم و پەژارەوە گەڕانەوە، سوپای تەنگانە لە کاتێکا هەردوو کەس و سواری وشترێك بوو بوون و بۆ جیهادی لە رای خواو وەدەستهێنانی خۆشنودی دەڕۆیی، مونافیقانی لە شارا، نقومی نەنگ و شەرمەزاری و غەزەبی خوا، بەجێ هێشت. لەشکر دڵی بیابانی شەق دەکردو خۆریش لە دوڕ ئاسمانەوە ئاگری بەسەردا دەباراندن. سست باوەڕان لە هەموو کەس زیاتر ئازاریان دەچەشت، تا زیاتر دەچوونە پێشەوە عەزمی گەڕانەوەیان جەزمتر دەبوو، لە ناکاوا کەعەبی کوڕی مالیك گەڕایەوەو رێگەی مەدینەی گرتەبەر، یاران بە پێغەمبەریان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا کەعەبی کوڕی مالیك گەڕایەوە.

– وازی لێ بێنن ئەگەر خێرێکی هەبێ خواوەند بەو زووانە دەیگەڕێنێتەوە ناو ئێوەو ئەگەرنا ئەوا لە شەڕی رزگاری کردوون.

لەشکر درێژەی بە رێگەی خۆی دا لە پڕێکا هەمدیس یاران هاواریان کرد: مەرارەی کوڕی رەبیع گەڕایەوە.

– وازی لێ بێنن ئەگەر خێرێکی هەبێ خوا بەو زووانە دەیگەڕێنێتەوە نا ئێوە، دەنا لە شەڕی رزگاری کردوون.

لەشکر درێژەی بە پێشڕەوی خۆی دا، پاش ماوەیەکی دی دیسان یاران هاواریان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا هیلالی کوڕی ئومەیە گەڕایەوە، *[* ئەم سیانە تووشی نەنگی و خوارییەکی سەیر بوون. تا پەنجا دانە رۆژ نە کەس تێکەڵیان دەبوو و نە کەس قسەی دەگەڵ دەکردن و کاری لەگەڵ دەکردن، تا ژیانیان لێ تاڵ بوو و تۆبەیان کردو خودا لە گوناحیان خۆش بوو].*

پێغەمبەر ئەمجارەش هەمان وەڵامی دانەوەو درێژەی بە کاروانی خۆی دا، دژواری و ناخۆشی سات بە سات زیاتر دەبوو، لە پڕ پێغەمبەر ئەمجارە گوێی لێ بوو: ئەی پێغەمبەری خوا ئەبوزەڕ گەڕایەوە!!.

– وازی لێ بێنن ئەگەر خێرێکی تیا بێ خوا بەو زووانە دەیگەڕێنێتەوە ناو ئێوە، ئەگەر نا لە شەڕی ئەو رزگاری کردوون.

ئۆو! ئەبوزەڕ لە شەڕ هەڵدێ؟ سەرپێچی لە پێغەمبەر دەکات؟ بۆ مەدینە دەگەڕێتەوە؟ نا، چۆن ئەبوزەڕ سەرپێچی لە پەیامبەری خۆشەویستی دەکات و لە ناو جەرگەی ئەم هەراو هەنگامە سەخت و ترسناکەدا لەو بیابانەدا بەجێی دێڵێ و بۆ شار دەگەڕێتەوە؟ چۆن ئەبوزەڕ دکارێ بۆ مەدینە بڕوات و بچێتە پاڵ مونافیقەکان؟ ئەبوزەڕ هەستی کرد کەوتووەتە تەنگانەیەکی نەنگەوە،

بە هەموو هێزێکی خۆیەوە دەنگی وشترەکەی دا، شایەت بتوانێ خۆی بگەیەنێتە پەیامبەری خۆشەویستی، لێ فایدەی نەکردو نەکرد، وشترە لەڕەکەی دوا توانای خۆی لە دەسەت دا بوو و هەنگاوی بۆ نە دەنرا، هیچ چارێك نییە، دەبێ ئەم وشترە کە بوو بووە مایەی شەرمەزاری ئەو، لەو بیابانەدا بەرەڵڵا بکاتو شتەکانی بدات بە کوڵی خۆیداو بەپێیان دوای محەمەد بکەوێ، یان دەبێ بمرێ یان بگاتەوە بە برا دلێرو جەنگاوەرەکانی خۆی.

لە وشترەکەی دابەزیو شمەکەکانی لێ گرتەوەو دای بە کوڵی خۆیاو وشترەکەی بەو دەقەوە بەرەڵڵا کردو ڕێگای دوورو درێژی بیابانی کپ و مەنگی گرتەبەر. لە ئاسمانەوە ئاگر دەباریو لە تۆ وایە بەردەکان خەریکن لە گەرمادا دەتوێنەوە. ماندوویەتی و تینوویەتی ئەبوزەڕیان شپرزە کرد، بیابانی بەرین و وشك، ڕێگا درێژ، هەوا گەرم و گڕەوسەمون. لە هەر هەنگاوێکا تاپۆی مەرگی بە چاو دەبینی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشا خاترجەم و کوڵنەدەرانە، هەنگاوی دەناو دڵی بە خودا سپارد بوو، هومێدی بە لوتفی خودا گەلەك خۆش بوو، پشتی توند بەست و ویژدانی هەواڵی دەدایێ کە کۆتایی شەوی تاریك سپێدەیە، هەر تەنگانەیەك فەریجی لە دوایەو هەر گرفتارییەك فەرەجێکی هەیە.

ورەی بەرزتر بووەوە، و خۆی گورج کردەوەو بە عەزم و ورەیەکەوە نە سستی دەناسی و نە بە کەمتر لە گەییشتنە ئامانج، شادو رازی دەبوو درێژەی بە ڕێگای خۆی دا، تینوویەتی زۆرو گڕەو سەمونی بیابان پێغەمبەری خۆشەویستی وەیاد هێنایەوە، ئەو چ دەکات؟ چی بەسەر هاتووە؟ چۆن لەگەڵ ئەم تەنگانەو ئەم گەرمایەدا هەڵدەکات؟ بێگومان تینوویەتی و لەم بیابانە سەرو بن نادیارو کانگای ئاگرەدا ئاوی نەدۆزیوەتەوە، بەو دەقەوە دەڕۆیی تا لە گۆشەیەکی ئاسماندا پەڵە هەورێکی بینیو وای دەنواند کە لەو ئاستەدا بارانێك باری بێ، ئەبو زەڕ ڕێی خۆی بۆ ئەوێ گۆڕی تا گەییە بەردێك، کە تۆزێك باراناوی لەسەر وەستا بوو* ***[*سەحار پێی وایە ئەبوزەڕ لە ڕێگەدا ئاوی دەست نەکەوت]*** جەوەنەیەکی پێ بوو پڕی کرد، تینوویەتی هەناوی برژاند بوو، تۆزێکی لێ خواردەوەو لە پڕ بیرێکی بە مێشکدا هات و هەموو ئاوەکەی نەخواردەوە، جەوەنەکەی دا بە شانیاو بە تینوویەتی بەڵام بە ورەیەکی بەرزترەوە درێژەی بە ڕێی خۆی دا.

لەشکرەکەی محەمەدیش لە تەنگانەدا بوو، تیشکی ئاگر ئاسای خۆر دەیسوتاندو ئەو ئاوەشی کە پێیان بوو، تەواویان کردبوو. گەرماو شەکەتی زۆریان بۆ هێناو بە ناچاری لە شوێنێکدا لایاندا. بە دوای ئاودا لە هەموو لایەکەوە بەناو پیرە بیابان کەوتن، بەڵام ئاویان نەدۆزییەوە.. موسوڵمانان پێیان وابوو کە مەرگی مسۆگەر بەگیری هێناون و تینوویەتی لە نێویان دەبات، بەڵام لە ناکاودا پەڵە هەورێك بە ئاسماناوە پەیدا بوو و بارانێکی کەم باری و موسوڵمانانی پاراو کرد.

ئەبوزەڕ هێشتا هەورازو نشێوانی دەبڕی و هەر سا نا ساتێ گردۆلکە لمێکی بزۆزی لێ پەیدا دەبوو و هەڕەشەی مەرگی لێ دەکرد. لەم کاتەدا لە پڕ چاوی بە سوپاو لەشکری موسوڵمانان کەوت و ئاواتە مردووەکەی زندوو بووەوەو ژیایەوەو دڵی بە توندی کەوتە لێدان، حەزی دەکرد یەزدان جووتێ باڵی وێدا تا بەرەو لای محەمەدی خۆشەویستی بفڕێ. ئیدی تاقەتی ئەوەی نەما کە دۆستەکەی، پێغەمبەر، لەوەی پتر لێی بە گومان بێو لە ریزی مونافیقانو سەرپێچی کارانی

دابنیٚ. ئەبوزەڕ لە حاڵێکا کە چاوانی تامەزرۆو تاسەباری لە لەشکریانی محەمەد نەدەگواستەوە، پێی هەڵگرت، لەم بەینەدا یەکێك لە سوپاییەکان لەوپەڕی بیاباندا تارماییەکی بینی کە دەهاتە پێشیٚ، مدەتێك وەستاو ئەوجا گوتی:

– ئەی پێغەمبەری خوا! پیاوێك لەم بیابانەدا بە تاقی تەنیا ریٚ دەکات؟!

پێغەمبەر: دەبیٚ ئەبوزەڕ بیٚ.

لەشکرییان بەدەم چاوەڕوانییەوە بە وردی سەیریان دەکرد تا بزانن کێیە، لە ناکاودا یەکێکیان هاواری کرد ئەی پێغەمبەری خوا، وەڵڵاهی ئەمە ئەبوزەڕە.

محەمەد: خوا ئەبوزەڕ ببەخشێت، بە تەنیا دەژی، بە تەنیا دەمریٚو بە تەنیا زندوو دەبێتەوە. هەنگیٚ بەغار بەرەو پیری ئەبوزەڕ رۆیی، و لە حاڵێکا کە لە خۆشی و شادی هەبوونی وەها یاوەرێکی وەفاداردا لەپێستی خۆی نەدەهێوری، دەستی لە ملی وەرێناو فەرمووی: ئەبوزەڕ! خواوەند لە بری هەر هەنگاوێکت کە بەرەو لای منت هەڵێناوە گوناحێکی لیٚ هەڵوەراندوویت..

ئەوسا پێغەمبەری خودا شتەکانی لە کۆڵی ئەبوزەڕ داگرت و لە عاردی دانان و ئەبوزەڕ لە تینویەتی و ماندویەتیو لاوازیدا تەختی زەوی بوو.

پێغەمبەر: ئاو بدەنە ئەبوزەڕ چونکە زۆری تینووە.

ئەبوزەڕ: من خۆم ئاوم پێیە.

محەمەد: ئاوت پێیەو تینووی؟

ئەبوزەڕ: بەڵیٚ داك و بابم بن وە قوربانت، لە رێگادا تووشی بەردێك بووم کە باراناوی تیا خڕ بوو بووەوە، تۆزێکم لیٚ خواردەوە، سەیرم کرد ئاوێکی ساردوسازگارە. گوتم لێی ناخۆمەوە تا محەمەدی دۆستم لێی بخواتەوە.

محەمەد: ***خودا بتەبەخشێت ئەبوزەڕ! بە تەنیا دەژیو بە تەنیا دەمریو بە تەنیا زیندوو دەبیتەوە.***

# مژده

ئەبو زەڕ پاش حەج دەگەڵ پێغەمبەردا، گەڕایەوە، دوایەمین سەفەری حەجی پێغەمبەرە، لە فکران ڕاچوو بوو بیری لەم سەفەرە دەکردەوە، پێغەمبەر ڕێوڕەسمی حەجی تەواو کردو لەو گوتارەدا کە فەرمووی کۆمەڵێك بابەتی تازەو گرینگی گوت.

ئەم سەفەرە نا ئاسایی دەهاتە بەرچاو، مەلی بیری لەملاوە بۆ ئەولا دەفڕی، ئاهەنگی دەنگی پێغەمبەر کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:

***[... وا لە مڕۆوە دینەکەتانم تەواو کردو بەبێ کورتی و کەمایەسی چاکەم دەربارەی ئێوە کرد، ئیسلامم بۆ دینی ئێوە هەڵبژارد.. سورەتی مائیدە. بەشێك لە ئایەتی ٣ ].***

لە گوێیدا وەکو زەنگی خەتەر زرینگابووەوە. خەمێکی قورس باڵی بەسەر گیانیا کێشا، ئەرخایەن بوو کە پێغەمبەری خۆشەویستی، کارو ئەرکەکەی تەواو کردووەو زۆری پێ ناچێ کە ئەم دنیایە بە جێدێڵێ‌و پەیوەندی بەدۆستی ئاسمانیی خۆیەوە دەکات. ئەبوزەڕ لەم بیرە ڕەش‌و کوشندانەدا نقوم بوو بوو و تاقەتی نەبوو بیر لە جودایی محەمەدی خۆشەویست بکاتەوە. چۆن ڕابەرو دۆستەکەی خۆی کە ساڵانێکە بۆ دەمێکیش لێی جودا نەبووەتەوە، بە جێ بهێڵێ؟ لەوەشە ئەو لە پێش پێغەمبەری خودادا ئەم ژیانە بە جێ بێڵێ، بەڵام خوا هەرچییەکی بوێ هەر ئەوە دەبێ.

ئەبوزەڕ هەستی بە جودایی کرد، ئاگرێك سەراپای گیانی گرت و تینووی دیداری محەمەد بوو، هەستاو لە ماڵ وەدەرکەوت.

پێغەمبەر لە مزگەوتا وەستا بوو و دەگەڵ یارانی دا قسەی دەکردو ئەوانیش سەراپایان بوو بوو بە گوێ، لەم کاتەدا دوو نەفەر لە ئەنسار هاتن و پێغەمبەریان بینی کە یارو یاوەرانی لە دەوری ئەڵقەیان بەستووە، یەکێکیان بەوی تری گوت، تۆ تەماشای ئەم یارانە بکە! هەمیشە پێکەوەن، بە دەگمەن ڕێدەکەوێ کە یەکێکیان لەوێ نەبێ.

– ئەمانە هاوڕێی نزیك و گیانی بە گیانی ئەون.

– نابینی ئەمڕۆ یەکێکیان کەمە؟

– تۆ پێت وایە کێ بێ؟

– ئەبو زەڕیان لە ناوا نابینم.

– لەوەیە کارێکی بووەو ڕۆییوە.

– نەت دیتووە کە پەیامبەر چەندی خۆش دەوێ و لە خۆی نزیکی دەخاتەوە.

– با، هەر کاتێ لەوێ بێ دەیدوێنێ‌و هەر کاتێکیش دیار نەبێ لێی دەپرسێت.

– جا بە ڕاستی شایستەی ئەو خۆشەویستیەیە، ئەبوزەڕ پیاوێکی پاکە.

– پێغەمبەری خوا لەبەر پارسایی و داوێن پاکی خۆشی دەوێ.

لەم بەینەدا بیلالی بانگبێژی پێغەمبەر لە کاتێکا گۆناکانی لە تورەییدا سوور هەڵگەرا بوو هات و سڵاوی کردو بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من و ئەبوزەڕ دەمەقاڵێکمان بوو و پێی گوتم: دایك سوورە! لەم کاتەدا ئەبوزەڕ هات بەسەراو پێغەمبەر بە تەشەرەوە گوتی:
ئەبوزەڕ بیستوومە کە تۆ ئەمڕۆ تانەت لە برایەکت داوە کە دایکی سوور پێستە؟!
ئەبو زەڕ: بەڵێ.
محەمەد: ئەبوزەڕ! هێشتا دەمارێکی جاهیلیەتت تیاماوە، سەرێ هەڵبڕەو تەمەشا بکە، چاك بزانە کە تۆ جگە لە کردەوەت بە هیچ شتێکی دی لە رەش پێست و سوور پێست زیاتر نیت! ئەبوزەڕ سەری داخست و ئارەقەی پەشیمانی نیشتە سەر تەوێڵی و هەستی کرد سەبارەت بە بیلال هەڵەو خراپەی کردووە. تورەیی پێغەمبەر لەرزی لێ هێنا بوو، لە ناکاو لە عاردی راکشاو دەموچاوی لە خۆڵەکە ناو گوتی: ئەی بیلال! وەرە پێ بخە سەر دەموچاوم! بیلال بەرەو لای ئەبوزەڕ تاوی دا، سڵاوی لێکردو لێی خۆش بوو، و ئەبوزەڕ بە هەمان دەقەوە کە نقومی بێدەنگی بوو بوو دانیشت و لە زۆر پەشیمانیدا سەری داخست.
محەمەد: ئەبوزەڕ بۆچی جنێوت بە هاوڕێکەت دا؟
ئەبوزەڕ: تورەی کردم.
محەمەد: ***هەر کاتێ تورە بووی، ئەگەر بە پێوە بووی دانیشەو ئەگەر دانیشتبووی پاڵدەوە.***
گفتوگۆیەك کەوتە بەینی خەڵکەکەوە، دیسان پێغەمبەر رووی کردە ئەبوزەڕو گوتی: ناتەوێ کارێکت فێر بکەم کە ئەنجامدانی سووك بێ و پاداشتی قورس؟
– بۆ نا ئەی پەیامبەری خوا.
– ئەو کارە بێدەنگی، خۆش خوویی و دەستبەردار بوونی ئەو شتەیە کە پەیوەندی بە تۆوە نیە.
ئاپۆڕاکە بەرە بەرە بڵاوەیان لێکرد، پێغەمبەرو ئەبوزەڕ بە دوو قۆڵی کەوتنە رێ تا گەیینە بازاڕ، سەیریان کرد خەڵکی سەرقاڵی بازرگانی و سەوداو مامەڵەی خۆیانن. پێغەمبەر رووی کردە ئەبو زەڕو فەرمووی: ئەبوزەڕ! من ئایەتێك دەزانم کە ئەگەر خەڵکی کاری پێ بکەن بەسیانە:
***[... هەر کێش لە خودا بترسێ، دەروویەکی لێدەکاتەوە، لە شوێنێکەوە بژێوی بۆ دەنێرێ کە بە خەیاڵیدا نایە.. سورەتی تەلاق، بەشێك لە کۆتایی ئایەتی دووەم و سەرەتای ئایەتی سێیەم].***
ئەبوزەڕ بێدەنگ بوو و پەیامبەریش خامۆش بوو، و هەر رێیان دەکرد، پێغەمبەر دیسان روویکردە ئەبوزەڕو گوتی: ئەبوزەڕ تۆ پیاوێکی داوێن پاکی، و بەو زووانە تووشی بەڵایەکی تووش دەبیت.
ئەبوزەڕ: لە پێناوی خوادا؟
محەمەد: لە پێناوی خوادا.
ئەبوزەڕ لە کاتێکا لەناخی خۆیدا شانازی بەو خەتەرو بەڵایە دەکرد کە لە پێناوی خوادا بەرەو پیری دەهات، بە دەنگێکی مکوم و ئەرخایەن گوتی: رازیم بە رەزای خوا.

# جودایی

پێغەمبەر نەخۆشیەکی قورسی گرت، رۆژێك کە وەهۆش هاتەوە داوای لە عایشە کرد ئەو یاوەرانەی کە لە مزگەوتن بانگ بکات، عایشە یەکێکی بە دوودا ناردن و ئەوانیش بە کۆمەڵ هاتن، ئەبوزەڕیانیش لەگەڵ بوو، سڵاویان کردو لە بەردەمیا دانیشتن. پێغەمبەر چاوە تا لێهاتووەکانی بڕی بووە ئەم داوێن پاكو وەفادارو دلێرانەی خۆیو بە قوڵی لێی دەڕوانین، فەرمووی: ئافەرین بۆ ئێوە، درودی خواتان لێ بێ، خودا لێتان خۆش بێ، خوا ئاگای لێتان بێ، خوا بژێویو رۆزیتان بدا، خودا خێرتان پێ بگەیەنێ، خوا هێزو تواناتان بداتێ، خودا بتان پارێزێ، ئامۆژگاریتان دەکەم کە پارسایی و پارێزگاری بکەن، من ئێوە بە خوا دەسپێرم، لەوتان دەترسێنم، لەوەتان دەترسێنم کە لە بەرانبەر خوادا شانازی بە خیانەت لە بەندەکانی خواو وڵاتانی ئیسلامی نەکەن. خودا پێی گوتم: *[ئێمە ماڵەکەی دوا رۆژن هەر بۆ ئەوانە دادەنێن، کە لەم عەرزە نایانەوێ خۆ بە زلتر بزانن و بەدفەڕی کەن، پاشەرۆژیش هەر بۆ خۆ پارێزەکانە. سورەتی قەسەس، ئایەتی ٨٣]*. پێغەمبەر بێدەنگ بوو، ئەوانی دیکەش بێدەنگ بوون، دووبارە فەرمووی: ئایا لە دۆزەخدا جێیەك بۆ خۆسەران نیە؟ و ئەوجا بێدەنگ بوو، بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا، یاوەران چاوانی رونکباری خۆیان بە کەسەرەوە بڕی بووە ئەو. ئەوجا فەرمووی:

– ماڵاوایی و جودایی نزیك بووەتەوە، کاتی گەڕانەوە بۆ لای یەزدان، بۆ جەنەتول مەئوا، بۆ لای سودرەتول مونتەها، بۆ لای دۆستی باڵاو جامی سەرڕێژو عەیش و نۆشی سازگارو گەوارا هاتووە. یەکێك لە ئامادە بووان گوتی:

– ئەی پێغەمبەری خوا کێ بت شوات؟

– پیاوێك لە ماڵباتەکەی خۆم، هەر کامێکیان لە منەوە نزیکترن.

یەکێکی دی گوتی:

– ئەی پەیامبەری خودا بە چ قوماشێك کفنت بکەین؟

– ئەگەر ویستتان هەر بەم جلانەوە، یا قوماشێکی میسری، یا پارچەیەکی یەمانی.

کەسێکی تر گوتی:

– ئەی پێغەمبەری خوا کێ نوێژت لەسەر بکات؟

خەم و پەژارە دڵی ئەبوزەڕی شەق کردو هەردووك چاوی پڕ بوون لە رونەك، زۆری لە خۆی کرد کە جڵەوی بێدەنگی و سەبر بەر نەدات، بەڵام نەیتوانی، لە پڕێکا ئەو گریەیەی کە ئەوکی گرتبوو،و لە نێو ئەو قسانەدا کە بۆنی مەرگیان لێدەهات، سات بە سات گەورەتر دەبوو، کرایەوەو بە دەنگی بەرز لە هۆڕژنی گریانی دا، لە کاتێکا کە بە کەسەرەوە چاوانی بڕی بووە سیمای پێغەمبەری خۆشەویست، دڵۆپە فرمێسکی دڕشت، بە گۆناکانیدا دادەخزین بە دەنگی بەرز دەگریا. یارانیش هەموو کەوتنە گریان، پێغەمبەریش کەوتە گریانو خەمو پەژارەو داخ و کەسەر خێوەتی هەڵداو بێدەنگیەکی مەرگبار ماڵەکەی داگرت، ئەبوزەڕ ئاگری تێ بەر بوو بوو،

کاتی جودایی و لێك دابڕان هاتبوو: هەستی دەکرد حەز دەکا بگری بەڵام چاوانی وشك بوو بوون و گرێیەك ئەوکی گرتبوو، سەری داخست و لە ژوور وەدەرکەوت.
خەڵکی لە مزگەوتا، لە دوای ئەبوبەکرەوە نوێژیان دەکرد، لە ناکاو پێغەمبەر، لە حاڵێکا کە پارچەیەکی بەسەریەوە پێچابوو خۆی بە مزگەوتا کرد، شەپۆلێکی خۆشی و شادی خەڵکەکەی گرت و بە دیتنی ئەو لە خۆشیا دڵیان کەوتە لەرزین. ئەبوزەڕ چاوی بە پێغەمبەر کەوت و لە خۆشیا سەراپای کەوتە لەرزین، لەسیمای دا تیشکی شادی و لە چاوانیا تروسکەی هێڤی دەبینرا، کە نوێژ تەواو بوو خەڵکەکە بەرەو پێغەمبەر هرۆژمیان هێناو بەوپەڕی خۆشی و شادی سلاویان لێکرد. ئەبوزەڕ بە هەشتاو چوو تاگوێی لە قسەکانی بێ، پێغەمبەر بۆ ماڵ زڤڕییەوەو خەڵکەکە لە حاڵێکا کە لە خۆشیا لە پێستی خۆ نەدەهێورین، دەوریان گرتبوو تا گەییشتەوە ماڵێ، پێغەمبەر وەژوور کەوت و خەڵکەکە زڤڕینەوە.
ئەبوزەڕ هێور بوو بووەوەو ئومێدێکی بە سەلامەتی پێغەمبەر پەیدا کردبوو، دڵشادو بەکەیف بەرەو ماڵی خۆی گەڕایەوە، ئەبوزەڕ نەیدەزانی کە ئەمە دوا دیدارەو بە یەکجاری لێك دیدار ئاخیرەت دەبن، ئەبوزەڕ گەڕایەوەو نەیدەزانی کە پێغەمبەری خۆشەویست بۆیە بۆ مزگەوت هاتووە تا ماڵاوایی لە خەڵکانێك بکات کە پاش عومرێك لە خەبات و هەوڵی ئەو، ئەمێستا بە سەرمایەیەکی ئەخلاقی زۆرەوە بە دەستی ئایندەیەکی گەورە دەسپێردرێن و ئەگەر هەقێکی ئەوانی لە گەردن بێ بیانداتەوەو بۆ دیداری پەروەردگاری ئامادە ببێ. ئەبوزەڕ ئەرخایەن و دڵشاد بۆ ماڵ زڤڕییەوەو نەیدەزانی کە پاش تاقە ئومێدو پەناکەی، محەمەد، چ بەڵایەکی بەسەر دێت و لە پێناوی ئەنجامدانی دەستووری رابەرە خۆشەویستەکەیدا کە فەرموو بووی: ***"هەق بڵێ هەر چەندە رەق و تاڵیش بێ، و لە پێناوی خوادا لە هیچ سەرزەنشت و گازاندەیەك مەترسە."*** چ ئازارو تەنگانەیەك دەبینێ، ئەبوزەڕ ئاسودەو سەر سووك رۆیی و نەیدەزانی کە چارەنووس چ داوێکی بۆ ناوەتەوەو چ پیلانێکی شومی داڕشتووە. لە کوێ دەزانێ کە خوا هەر بۆ ئەوەی تاقی بکاتەوە دەیخاتە چ گێژەڵوکەیەکی دژوارو چ شەپۆلانێکی ترسناکی رووداوانەوە. ئەبوزەڕ بەدەم رێوە یەکێك لە خزمەکانی بینی و پرسی:
– بۆ کوێ دەچووی؟
– بۆ لای تۆ.
– بۆچی؟
– ژنەکەت کیژێکی بووە.
ئەبوزەڕ کەمێك بێدەنگ بوو، کابرا گوتی: ***[هەر کاتێکیش مژدەی کچێك بۆ یەکێك لەمانە بچێ، روخساری رەش هەڵدەگەڕێ و لەبەر خۆی پیش دەخواتەوە. سورەتی نەحل، ئایەتی ٥٨ ].***
– نەوەڵڵا، بۆ مەرگ لە دایك دەبن و وێرانی ئاوەدان دەکەنەوە.. پەحا چەند خۆشەویستن ئەم دوو بێزراوە: مەرگ و هەژاری!

*　　　*　　　*

**لە پڕ دەنگی دڵتەزێنی شیوەن لە ماڵی پێغەمبەرەوە هەستا، خەڵکی بە ترس و دڵەڕاوکێوە بەرەو ماڵی پێغەمبەر غاریان دەداو بەلەز لە یەکتریان دەپرسی: "پەیامبەری خوا مردووە؟!... پێغەمبەری خودا مردووە!".**

**ناڵەی فاتیمە بەرز بووەوە، شیوەنی دەکردو پەیتا پەیتا هاواری دەکرد:**

**ابتاه یا ابتاه؟ .....ابتاه**

**اجاب ربا دعاه....یا ابتاه**

**الی جبریل ننعاه...یا أبتاه**

**جنه الفردوس ننعاه...یا ابتاه**

**من ربه ما ادناه...یا أبتاه**

**هاوارو شیوەنی خەڵکی لە مزگەوتا دەگەییە ئاسمان، ئەبوزەڕ وەکو باران روندکی دەباراندو ئۆقرەی نەدەگرت، هاواری دەکرد، نەیدەویست باوەڕ بەم هەواڵە گورچکبڕە بکات، تەنانەت لە وێناکردنیشی دەترسا، هەندێ لە یاوەرەکان لە بەینی یەکترا لەم بارەیەوە قسانیان دەکرد، بەڵام خەڵکەکە گوێیان نەدەگرت، دەگریان، ئاگرێك بەر بوو بووە گیان و مێشکیان حەجمانی لێ هەڵگرتبوون و نەیدەهێشت گوێ لە چ قسەیەك بگرن. عومەر چووە دیار سەری پێغەمبەر، سەری هەڵدایەوە، سەیری کرد هێمن و ئارامە، وایزانی غەیب بووە، بەهەشتاو بۆ مزگەوت هات و گوتی: "هەندێ کینە لە دڵ وا خەیاڵ دەکەن پێغەمبەری خوا مردووە، بە خودا نەمردووەو میناکی عیساو موسا بۆ لای پەروەردگار رۆییشتووە." کزە تروسکەیەکی ئومێد کەوتە دڵی خوێنینی ئەبوزەڕو خۆزیای دەخواست کە قسەکەی عومەر راست بێ و، محەمەد بۆ لەناو بردنی مونافیقان بگەڕێتەوە. بەڵام بە هاتنی ئەبوبەکر ئەم تروسکەیەش کوژایەوە، ئەبوبەکر گوتی: سەبرکە عومەر! خەڵکینە بێ دەنگ بن! ئەوەی محەمەدی دەپەرست محەمەد مردو ئەوەی خودای دەپەرست خودا زیندووەو نامرێ.**

**عومەر لە هۆڕژنی گریانی داو ئەرخایەن بوو کە پێغەمبەری خوا مردووە، ئەبوزەڕ بەدەم ئاهوناڵەوە هاواری دەکرد: *"هاوڕێکەم رۆ! پێغەمبەری خوا مرد، برای خێرخوازو دلۆڤانم رۆیی، بەخشندەی جوامێرم رۆیی، نێردراوی ئەمینی خوا رۆیی"*. ئەبوزەڕ بە دوای ئاوێکدا دەگەڕا کە ئەم ئاگرەی لە دڵیەوە بڵێسەی سەند پێ بکوژێنێتەوە، بۆ دەرمانێکی تەسەلابەخش دەگەڕاو جگە لە قورئان هیچ تەسەلا بەخشێکی نەدۆزییەوەو دەستی بە خوێندن کرد: *[... بە غەیرەز ئەو هەموو شتێ لە بەین دەچێ، فەرمان هەر فەرمانی ئەوەو هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە. سورەتی قەسەس، ئایەتی ٨٨].***

***[هەموو کەسێك تامی مردنێ دەچێژێ، رۆژی سەڵاش هەقی خۆتان دەنێنە مشت.. سورەتی ئال عیمران، ئایەتی ١٨٥].***

**نا ئومێدو خەمبار بە دەم رێوە ئەم رستەیەی دووبارە دەکردەوە: "قەسەم بەو کەسەی کە گیانمی بە دەستە پەیامبەری خوا مرد، رەحمەتی خوات لێ بێ ئەی پەیامبەری خوا!"**

* * *

گـەردو تـۆزی خـەم نیشـتە سـەر مزگەوتەکـەی پێغەمبـەرو ئایندەیـەکی ترسـناکی چـڕە رووداو هەڕەشــەی دەکــرد، عومــەرو ئەبوعوبەیــدەو ئــەبوزەڕو هــەموو موســوڵمانەکان وێســتا بــوون، شوێنەواری خەم و پەژارە بە رووی هەمووانەوە دیار بوو، پیاوێك لە رێگاوە هات و بە عومەری گوت: ئەنسار لـە سـەقیفەی بـەنی ساعیدە خڕبوونەتـەوە تـا سـۆزو دەنگ بـۆ خەلافـەتی سـەعدی کوڕی عیبادە بدەن! ئەبوزەڕ سەری سوڕما، چۆن ئەم خەڵکە سۆزو دەنگ بە کەسێکی غەیرەز عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەدەن؟ حەیران و سەرسام لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "عەلی شایستەترین کەسە بۆ ئەم کارە، یەکەمین کەسەکە باوەڕی بە پێغەمبەر هێنا، پس مامیەتی، زاوایەتی، ئیدی خەڵکی بۆ بیر لەوە دەکەنەوە کە سۆز و دەنگ بە غەیرەز ئەو بدەن؟!" ئەبوبەکر وەدەرکەوت عومەر پێی گوت نازانی ئەنسار لە سەقیفەی بەنی ساعیدە خڕ بوونەتەوەو دەخوازن ئەم کارە بە سەعدی کوڕی عیبادە بسپێرن؟

ئەبوبـەکرو عومـەر وئەبوعوبەیـدە بـە هەشـتاو بـەرەو سـەقیفە رۆییشـتن و ئـەبوزەڕیش بـە دوای ئەواندا رۆیی.

عەلی و عەباس و هەندێك لە بەنی هاشم مژولی کفن و دفنی پێغەمبەر بوون، عەباس هەستی کرد کـە ژێـراو ژێـر جـم و جۆڵێـك هەیـەو خـەڵکی بیر لـە جێنیشـنی پێغەمبـەر دەکەنـەوە، رووی کـردە عەلی و گوتی دەست بێنە با سۆزو بەیعەت بە تۆ بدەم، چونکە خەڵکی دەڵێن مامی پێغەمبەر دەنگی بە ئامۆزاکەی پێغەمبەر داوەو دوو کەسەکەی دیکەش دژایەتیت ناکەن.

عەلی: چما کەسی تریش تەماحی لەوەدا هەیە؟!

عەباس: بەو زووانە بۆت دەردەکەوێ.

لەم بەینەدا گوێی لێ بوو کەسێك بە توندی لە دەرکە دەدا.

عەلی رۆیی و گوتی: کێیە؟

– ئەبوزەڕ.

– دەنگ و باس؟

– خەڵکی سۆزو دەنگیان بە ئەبوبەکر دا!

عەلی دەرگای کردەوەو ئەبوزەڕ وەژوور کەوت.

عەلی: چۆن؟

ئەبوزەڕ: ئەنسار لە سەقیفەی بەنی ساعیدە بۆ دەنگدان بە سەعدی کوڕی عیبادە خڕ بوونەوە، ئەبوبەکرو عومەرو ئەبو عوبەیدەش چوون بۆ ئەوێ، ئەبوبەکر قسەی کردو لەبەرسڤیا گوتیان: "میرێك لە ئێمەو میرێك لە ئێوە". ئەبوبەکر گوتی: میللەتی عەرەب ئەمە قبوڵ ناکەن و میر دەبێ لە تیرەی قـوڕەیش بێتـە هەڵبـژاردن، بۆیـە دەبـێ ئـەمیر لـە ئێمـەو وەزیـر لـە ئێـوە بـێ، ئـەوجا عومـەر گوتی: "قەسەم بە خوا میللەتی عەرەب قەبوڵ ناکەن مادامێکی پێغەمبەرەکەیان لە ئێوە نیە، ئێوە حوکمیان بکەن، ئێمە عەرەب زۆر چاك دەناسین و هـەر کەسـێك لـە مەسـەلەی خەلافەتدا دژی ئێمـە کـە لـە خێڵـی محەمـەدین رابـێ، بـە گـومڕایی لـە قەڵـەم دەدرێ و گونـاهی کـردووەو کەوتووەتـە تالوکەوە".

هەنگێ عومەر گازی کرد: "ئەبوبەکر دەستت بێنە!" عومەر دەستی ئەبوبەکری گوشیو گوتی: مەگەر پێغەمبەر دەستوری نەداوە کە تۆ، ئەی ئەبوبەکرا پێشنوێژی موسوڵمانان بکەی؟ تۆ خەلیفەی پێغەمبەری خوایت و ئێمە بە سۆزو دەنگدان بە تۆ یەکێکمان هەڵبژاردووە کە پێغەمبەر لە هەمووان پتری خۆش ویستووە". ئەبوعوبەیدەش دەنگی داو گوتی تۆ زاناترین موهاجیرو یاری غاری پێغەمبەرو خەلیفەی پەیامبەری خودای، جا کێ بۆ ئەم کارە لە تۆ لە پێشترە!؟

ئەبوزەڕ بێدەنگ بوو، سەری داخست و لە فکران راچوو.

عەباس رووی تێکردو گوتی: من پێم نەگوتی؟ بە گوێت نەکردم!

امرتهم امري بمنعرج اللوي
فلم يستبينوا النصح الا ضحی الغد

عەلی: چار چییە؟

ئەبو زەڕ: پێویستە میقدادو سەلمانو عیبادەی کوڕی سامتو ئەبو هەیسەمو حوزەیفە و عەمار گاز بکەین بێن تا بزانین چ بکەین.

*　　　*　　　*

شەو داهات، تاریکی وەکو هەمیشە باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشا، بەلام ئەو شەوە لە شەوەکانی تر مەنگ ترو گەورەتر بوو، یەکەمین بەردی بناغەی حکومەتی ئیسلامی دادەنرا، ئەنسار لەبەر مزگەوتا خڕ بوونەوەو ئەبوزەڕ رووی تێکردن و گوتی: بێگومان عەلی شایستەترین کەسە بۆ خەلافەت و لە سەرمانە ئەم مەسەلەیە بخەینە بەردەم موهاجیران تا راوێژو شیرەتی لەسەر بکەنو پەیمانی سەقیفە هەڵوەشێننەوە.

یەکێکیان پرسی: چۆن؟

ئەبو زەڕ: ئەوان گوتویانە کە چونکە محەمەد لەوانە، لەم کارەدا لە ئەنسار لە پێشترن و لەبەر ئەمە ئەنسار فەرمانداری و پێشەوایی خۆیان بەوان (موهاجیران) سپارد، جا ئێمەش ئەو بەڵگەیە بۆ موهاجیرەکان دێنینەوە کە عەلی لە مەرگ و ژی دا نزیکترین کەسە لە پێغەمبەرەوە.

هەموو لە فکران راچوون، و کەوتنە راوێژو شیرەت تا بڕیاریان دا ئەم مەسەلەیە لە بەینی موهاجیراندا تاوتوێ بکرێ و راوێژی لەسەر بکەن. خۆری رۆژی دووەم هەڵهات، ئەبوزەڕ لە ماڵی خۆی وەدەرکەوتو بەرەو ماڵی فاتیمە، کیژی پێغەمبەر، بۆ لای عەلی کەوتە رێ.

لەوێ عەمارو زوبێرو میقدادو سەلمانی بینیو بەگەڵیان کەوت. لەم بەینەدا خالیدی کوڕی سەعید لە رێوە گەیی‌و رووی کردە عەلی و گوتی: بەزاتی خوا هیچ کەسێك بۆ شوێنەکەی محەمەد لە تۆ لە پێشتر نییە.

ئەبوبەکرو عومەر، هەواڵی ئەم کۆبوونەوەیەی ماڵی فاتیمەیان زانی، عومەر بۆ ئەوێ چوو، و داوای لە عەلی و هاوڕێکانی کرد کە لە ماڵ بێنە دەرو وەکو هەموو خەڵکی سۆزو دەنگ بدەن، لێ کەس داواکەی قبوڵ نەکرد. لەم کاتەدا ئەبوسوفیان هات و گوتی: بەزاتی خوا، شۆڕشێك دەبینم کە بە خوێن نەبێ دانامرکێتەوە! (ئەوجا رووی کردە عەلی و عەباس): هەی بێ دەمارینە! هەی

بیٚ دەسەڵاتینە (ڕوو دەکاتە عەلی)، دەست بێنە تا بەیعەت بە تۆ بدەم، ئەگەر بتەویٚ مەدینـە دژی ئەبو فوزەیل (ئەبو بەکر) لە پیادەو سوارە پڕ دەکەم.

عەلی قەبوڵی نەکرد، بەدەم ژارخەنێکی پڕ ماناوە بەم دوو بەیتە وەڵامی دایەوە:

ولایقیم علي ضیم یراد بە الا الاذلان عیرالحی و الوتد

هذا علی الخسف مربوط برمتە وذا یشج فلا یرقی لە احد*

*[* کەس زوڵم قەبوڵ ناکات تەنیا دوانی خوارو زەبوون نەبیٚ، یەك کەری خێڵ و دوو سینگەکەی، ئەویان بە زەبوونی بە پەتەکەی دەبەسترێتەوەو ئەمیان بەسەریا دەدریٚو کەس بۆی ناگری].*

ئەبوزەڕ بە ڕقەوە ڕوانیـە ئەبوسـوفیان‌و دەیزانـی کـە ئـەم قسـانە لـە دڵسـۆزییەوە بـۆ عـەلی ناکـات، بـەڵکو تـەنیا پەرێشـانی‌و نـا تـەبایی‌و نـاکۆکی موسـوڵمانانی گەرەکـە. ئێسـتاش هەسـتیاری و ناسکی کاتەکـەی بـە دەرفـەت زانیـوە، لێـوانی عـەلی کەوتنـە جوڵـە کـە قسـان بکـات، و ئـەبوزەڕ بـە پەرۆش و تاسەوە چاوی بڕییە زاری و قسـەگەلێکی ژنـەوت کـە تـەزووی شـادی و ئـارامی بـە دڵـی بەخشی، گوێی لیٚ بوو کە عەلی دەڵێت: ئەبوسـوفیان کینـەو زیـانی تـۆ سـەبارەت بـە ئیسـلام هـەر نەبڕایەوە! پێویستمان بە پیادەو سوارەی تۆ نیە. "٣".

# ئەبو بەکر

ئەبوزەڕ سەری نابووە سەر دەستی و هێدی هێدی هێدی روندك بە گۆناكانیدا دەهاتە خواری و بە قوڵی لە فكران راچوو بوو، بیری لە دۆستە لە دەست چووەكەی، لە محەمەد دەكردەوە، ئەو رۆژەی وەبیر هێنایەوە كە پێغەمبەر بەسەری پێچراوو جەستەی تێدارەوە، بەوپەڕی نەخۆشی بۆ مزگەوت هات و گوتی: "ئەی خەڵكینە، گوێڕایەڵی سوپای ئوسامە بكەن، ئێوە كە ئیعتراز لە فەرماندەیی ئەو دەگرن بەر لەویش رەخنەتان لە فەرماندەیی بابی دەگرت..." بیری لەمە دەكردەوەو لە خۆی دەپرسی: "ئایا ئەبوبەكر سوپای ئوسامە بۆ جەنگی قەزاعە دەنێرێت و بە گوێی ئەو یارانە دەكات كە پێیان وایە ئوسامە، سەرفەرماندەی سوپا، چونكە زۆر جەوانە، دەبێ بگۆڕدرێ؟ ئوسامە هێشتا نەگەییوەتە بیست ساڵان و دەبێ فەرماندە كەسێك بێ كە ئەزموونی رۆژگار قاڵی كردبێتەوە. بەڵام كەی لە ئیسلامدا تەمەن رێگر بووە لە بەردەم ئەوەی پیاو كارو ئەركی گەورەو گرینگ لە ئەستۆ بگرێ؟ مەگەر پێغەمبەری ئیسلام، عەلی قەبوڵ نەكردو بە خەلیفەی خۆی نەدەزانی؟ خۆ عەلی هەنگێ هەر چواردە ساڵان دەبوو. مەگەر پێغەمبەر نەیگوت كە ئیسلام بە دوو عومەر سەرفرازە، لە كاتێكا عومەر بیست و شەش ساڵان بوو؟ مەگەر سەعدی وەقاس نەبوو كە رابوو و بەرگری لە پێغەمبەر كرد، دەگەڵ كافران دا شەڕی كردو لە رۆژێكا هەزار تیری هاویشت؟ لە كاتێكا تەمەنی هەر هەڤدە ساڵ دەبوو. ئیسلام بەدەستی لاوان هێزی پەیدا كردو لەسەر شانی ئەوان دامەزرا، كەواتە خەڵكی چۆن ئیعتراز لە ئوسامە دەگرن، لەكاتێكا پێغەمبەر بەر لەوەی بگاتەوە لای دۆستەكەی خۆی (خوا)، ئەوی هەڵبژاردووە؟ جا ئەبوبەكر ناچارەو بە گوێرەی فەرمانی خوا، سوپاكەی ئەو دەنێرێ و لەمەی پتر چاوەڕوانی چ شتێكی دی لە ئەبوبەكر ناكرێت".

ئەبوزەڕ تەكانێكی داو پاشان هەمدیس بیری بەرەو لای پێغەمبەر فڕی و ئەو رۆژەی وەبیر هێنایەوە كە لەنك ئەو دانیشتبوو سەراپای بوو بوو بە گوێ و پێغەمبەر ئامۆژگاری دەكردو تەعلیمی دەدا. هەنگێ هەستاو بەرەو لای ئەبوبەكر وەدەركەوت. ژمارەیەكی زۆری موسوڵمانانی لەلا كۆ بوو بوونەوەو داوایان لێدەكرد كە حەرەكەتی لەشكرەكەی ئوسامە رابگرێ، بەڵگەو هەنجەتیان ئەمە بوو كە لە دوای مردنی محەمەد، بارودۆخەكان گۆڕاوەو كەس نازانێ كە ئەگەر هەواڵی مردنی پێغەمبەر بگاتە خێڵەكان چ روو دەدا؟ ئەبوزەڕ چاوەڕوان بوو كە وەڵامی خەلیفە بداتەوەو خۆی ساز دەدا كە بەو ئامۆژگاریە بكات كە پێغەمبەری خوا پێی گوتبوو: "هەق بڵێ هەر چەندە ناخۆش و رەقیش بێ، لە پێناوی خوادا لەسەرزەنشت و گازاندەی هیچ كەسێك مەترسە". ئەگەر خەلیفە دەستوورەكەی پێغەمبەر سەبارەت بە ناردنی سوپای ئوسامە جێبەجێ نەكات، بەتوندی هێرشی بكاتە سەر، بەڵام ئەبوبەكر قسەی دڵی ئەبوزەڕی كردو ئەبوزەڕ هێور بووەوەو دڵخۆش بوو.

ئەبوبەکر گوتی: "قەسەم بەو کەسەی گیانی ئەبوبەکری بە دەستە، ئەگەر سوور بزانم درِندان دەم رفێنن، وەکو چۆن پێغەمبەر فەرمانی داوە هەر ئوسامە ڤرِێ دەکەم، ئەگەر لە نێو هەر هەموو ئاوەدانیەکاندا تەنیا من بمێنم، ئەو شتە هەر جێبەجێ دەکەم".

ئەم قسەیە سوکنایی بە دڵی ئەبوزەرِ بەخشی و تروسکەی شادی و هیوا گیانی روناك کردەوە، لە پرِ سەیری کرد عومەر وا دێ، ئەبوزەرِ نیگەران بوو، چونکە دەیزانی عومەر یەکێکە لە بەرهەڵستکارە سەرسەختەکانی فەرمانەدیی ئوسامە،و لەلای ئەبوبەکر پایەیەکی بەرزی هەیەو لەوەیە ئەبوبەکر لە برِیارەکەی خۆی ژێوان بکاتەوە. چاوەرِوانی کرد تا بزانێ چ دەبێ؟ عومەر داوای کرد کە لەشکرەکەی ئوسامە رابگرێ. ئەبوبەکر گوتی ئەگەر سەگ و گورگانیش بمخۆن، فەرمانی پێغەمبەری خوا هەر ئەنجام دەدەم.

ئەبوزەرِ بەدڵێکی خۆش لەوێندەر وەدەرکەت و لە رێگەدا ژمارەیەك لە موسوڵمانانی بینی کە کۆبوونەتەوەو چاوەرِوانن ئەنجامی قسەکانی عومەر بزانن. لە جەم وان وەستا، کە عومەر گەرِایەوەو ئاپۆرِاکە زانیان ئەبوبەکر سوورە لەسەر ناردنی سوپاکەی ئوسامە، دیسان داوایان لێکرد کە پێشنیازی لابردنی ئوسامە بکات، چونکە ماقول نییە کە ئەم گەنجە فەرماندەی سوپایەك بێ کە باشترین یارانی پێغەمبەرو تەنانەت خودی عومەریش لەو سوپایەدا سەربازی سادەن.

عومەر بۆ لای ئەبوبەکر گەرِایەوەو گۆرِینی فەرماندەی سوپاکەی پێشنیاز کرد، ئەبوبەکر کە گوێی لەم پێشنیازە بوو هەڵچوو و تورِە بوو، بە رووی عومەرا هەڵشاخی و هاواری کرد:

– دایکت رۆرِۆت بۆ بکات و لە تازەیەتدا دانیشێت، ئەی کورِی خەتاب، پێغەمبەر دایناوەو تۆ بەمن دەڵێی لای بەرم؟

عومەر رۆیی، پێی سەیر بوو کە ئەو ئەبوبەکرە هێمن و نەرمە چۆن بەو جۆرە تورِە بوو؟ پەرێشان و خەمین، بۆ لای خەڵکەکە گەرِایەوە. هەمووان نیگەرانی و خەجاڵەتیان بە رووی کورِی خەتابەوە بینی و مەسەلەکەیان لە سیری تا پیازی خوێندەوە.

خەڵکەکە بە هەشتاو بەرەو رووی عومەر چون و لێیان پرسی کە چت کرد؟ عومەر هاواری کرد: برِۆن! مردووتان مرێ، مەگەر هەر خوا بزانێ خەلیفەی پێغەمبەری خوا لەسەر ئێوە چی پێکردم!

ئەبوزەرِ کەوتە رێ و شوکرانەی خوای کردو خۆی بۆ رۆییشتن لەگەڵ لەشکرەکەی ئوسامەدا ئامادەو تەیار کرد.

شەیپور لێدرا و سوپا کەوتە رێ و ئەبوزەرِیش لەو بەینەدا بە ئەرخایەنی و متمانە بە سیاسەتی ئەبوبەکر، بە نیازی جیهاد لە رای خوا کەوتە رێ.

ئەبوزەرِ بە درێژایی خەلافەتی ئەبوبەکر دەگەڵ هەموو سەربازان و جەنگاوەرانی دیکەی ئیسلامدا، لە شەرِەکاندا بەشداری دەکرد، خەباتی دەکردو لە بناغەدانان و دامەزراندنی شارستانیەتی مەزنی ئیسلامی و وڵاتگیریدا، فیداکاری فرەی نیشان دەداو داوێنی عیبادەت و پارسایی هەر بەر نەدا. ئەبوبەکریش کەسێکی پارساو دیندار بوو، لەم رووەوە هیچ کاتێك نەبووەتە بایسی رەخنەو نارەزایی ئەو گەرچی سات بە سات هێزو تواناو شکۆی ئیسلام لە

زیادی بوو، ئەبوزەڕ لەو پەڕی هەژاری و سادەیی دا دەژیا، لە رای خودادا شمشێری دەوەشان و سەرفرازی جەماوەرو سادەیی حکومەت و روحی ئیمان و جۆشی شۆڕشی لە کۆمەڵگەی زیندووی ئیسلامیدا کە لەسەر بناغەی باوەڕو جیهاد دامەزرا بوو، دەبینی و لەزەتی لە یەکسانی و برایەتی موسوڵمانان دەبینی.

# قفڵی فیتنه

**ئەبو بەکر نەخۆش کەوت و پێش ئەوەی بمرێ خەلافەتی بە عومەر سپارد***

***(* بە چ مەقێك و بە چ پێوەرو پێوانەیەك؟!).***

**ئەبوزەڕ هەواڵی مردنی ئەبوبەکری ژنەوت و خەمبار بوو. چەند رۆژێك لە مەدینە مایەوەو پاشان ژن و کیژەکەی هەڵگرت و بۆ شام رۆیی. لە شام، رۆژێ لە مزگەوت دانیشتبوو و خەڵکەکەش دەوریان دابوو و لە هەموو بارەیەکەوە قسانیان دەکرد. یەکێکیان گوتی: ئەی ئەبوزەڕ! ئایا تۆش میناکی ئەبوهورەیرە –کە بوو بە ئەمیری بەحرێن– پۆستێك وەرناگریت؟**

**ئەبوزەڕ گوتی: ئەمیریم بۆ چیە؟ رۆژی تۆزێ ئاو یان شیرو هەفتەی کیڵەیەك گەنم بەسە.**

**یەکێکی دی گوتی: ئاگاتان لێیە کە ئەمیری موسوڵمانان چی لە ئەبوهورەیرە کردووە؟**

**گوتیان: نە ء!**

**گوتی: عومەر سەروەت و سامانەکەی حیساب کردووەو پێی گوتووە: "کە تۆم بە حوکمرانی بەحرەین دانا جووتێ نەعلت نەبوو، کەچی خەبەرم پێ گەییوە کە بایی هەزارو شەش سەد دینار ئەسپ–ت کڕیوە"! ئەبوهورەیرە لە بەرسڤیا گوتویەتی: "ئەسپەکانی خۆم زاییوون و هەندێکی پێشکەشیشیان بۆ هێناوم". عومەر گوتویەتی: "من کە بژێوی و خەرجی ژیانم حیساب کردوویت، ئەمانە زیادەن، بیانگێڕەوە!" ئەبو هورەیرە گوتویەتی: "نایان گێڕمەوە" عومەر گوتویەتی: "بە خوا پشتت دەشکێنم" و هێندەی بە شەلاق کێشاوە بە پشتی ئەبوهورەیرەدا کە خوێنی لەبەر رۆییوە. ئەوجا پێی گوتووە: "کاکە ئەوانە بگێڕەوە!" ئەبوهورەیرە گوتویەتی: "لە رای خودادا دەیانگێڕمەوە!" عومەر گوتویەتی: "ئەگەر لە رێگەیەکی حەڵاڵەوە بە دەستت هێناباو بە ئارەزووی خۆت هێناباتەوە دروست بوو، ئاخر تۆ لەوسەری بەحرەینەوە هاتوویت و باج و خەراج بۆ خۆت وەردەگری نەك بۆ موسوڵمانان! دایکت جگە لە کەرەوانی هیچ کارێکی بە تۆ نەکردووە!".**

**ئەبوزەڕ: عومەر ئەوەی ئەنجامداوە کە خواو پێغەمبەر پێیان خۆش بووە، چونکە فەرماندار دەبێ بە قازانجی خەڵکی کار بکات نەك بۆ قازانجی خۆی.**

**گفتوگۆ لە نێو خەڵکەکە دەستی پێکرد، لەم کاتەدا نوێنەرێك لەلایەن حەبیبەی کوڕی موسلیمەی حوکمڕانی شامەوە، خۆی بە مزگەوتەکەدا کردو لە ئەبوزەڕ دەگەڕا، ئەبوزەڕی دۆزییەوەو گوتی: ئاغام سێ سەد دیناری داومەتێ تا بە تۆی بدەم و پێویستییەکانتی پێ جێبەجێ بکەی. ئەبو زەڕ گوتی: بیبەرەوە بۆ خۆی، مەگەر لە بەندەی خوا کەسێکی لە من عەزیزتری نەدۆزییەوە؟ من جگە لە کەپرێك کە پەنامان بدات و چەند سەر پەزێك و خزمەتگوزارێك کە لە هەقی خۆمان پێیان داوێن، چیترم پێویست نییە.**

* * *

ئەبوزەڕ موچەکەی وەرگرت و دەگەڵ عەبدوڵڵا سامیت و کەنیزێك دا لە ماڵ وەدەر کەوتن و بەرەو بازاڕ رۆییشتن. کەنیزەکە شتی بۆ ئەبوزەڕ دەکڕی و لە دواییدا چەند فلسێکی لێ مایەوەو دایەوە بە ئەبوزەڕ. ئەبوزەڕ هەمووی بەسەر هەژاراندا بەخشیەوە. عەبدوڵڵا سامیت گوتی:

– تۆ مەسرەفی ماڵت هەیە، میوانت دێن، هەق بوو هەڵت بگرتایە.

ئەبوزەڕ: خۆشەویستەکەم پێی گوتم هەر زێڕو زیوێك کە کۆبکرێتەوە دەبێتە ئاگرو بەردەبێتە خاوەنەکەی تا ئەو کاتەی کە لە رای خوا دەیبەخشێت.

*  *  *

عومەر بۆ سەردان و ئاگادار بوون لە وەزع و حاڵی خەڵکی سەفەری شامی کرد، خەڵکی بە دیداری شاد بوون و لە دەوری خڕبوونەوە. عومەر ئەبوزەڕی بینی و بە گەرمی دەستی گرت و گوشی.

ئەبوزەڕ: (بە سوعبەتەوە) دەستم بەر بدە ئەی قفڵی فیتنە!

عومەر: ئەبوزەڕ! قفڵی فیتنە چیە؟

ئەبوزەڕ: رۆژێك ئێمە لای پێغەمبەر بووین تۆش هاتی، مەجلیسەکە قەرەباڵغ بوو و تۆش نەتویست بەسەر خەڵکەکەدا رەت ببی و بێیتە نزیکی ئێمە، لە پاینی مەجلیسەکەوە دانیشتیت، هەنگێ پێغەمبەر، لە حاڵێکا کە ئاماژەی بۆ تۆ دەکرد، فەرمووی: ***"تا ئەم پیاوەتان لە ناوا بێ هیچ فیتنەیەکتان ناکەوێتە ناو"*** .

ئەبوزەڕ هەمیشە لەگەڵ عومەردا بوو، رۆژێ بینی کە عومەر دۆش داماوەو لە فکران راچووە، گوتی: پەشێوو خەمناکت دەبینم؟!

عومەر: "بەشەرم کرد بە ماموری باجی هەوازن و قەبوڵی نەکرد، دیتم و گوتم: بۆچی قەبوڵت نەکرد؟ مەگەر بە فەرمانی ئێمە ناکەی؟ گوتی: نا، بەڵام لە پێغەمبەری خوام بیستووە کە دەیفەرموو: هەر کەسێك کارێکی موسوڵمانان بگرێتە ئەستۆ، رۆژی پەسڵان، لەسەر پردی دۆزەخ رایدەگرن، ئەگەر خزمەتی کردبێ نەجاتی دەبێ و ئەگەر خیانەتی کردبێ، پردەکە دەڕوخێت و هەفتا ساڵ لە دۆزەخا دەبێ! تۆ بۆ خۆت ئەمەت لە پێغەمبەری خودا نەبیستووە؟

عومەر: نە!

ئەبوزەڕ: من گەواهی دەدەم لە پەیامبەری خودام بیستووە کە دەیگوت: "هەر کەسێك جڵەوی تاقە یەك نەفەر بگرێتە دەست، رۆژی پەسڵانێ دەیهێنن و لەسەر پردی دۆزەخی رادەگرن، ئەگەر خزمەتکار بووبێ نەجاتی دەبێ و ئەگەر خیانەتکار بووبێ پردەکە دەڕوخێت و بۆ ماوەی هەفتا دانە ساڵ لەوێندەر دەمێنێتەوە" جا ئێستا کیهە لەم دوو فەرموودەیە بە ئازار ترە؟

عومەر: هەردووکیان دڵیان هێنامە ژان، کەس هەیە کە ئەوەم (خەلافەت) بە هەموو شتێکەوە لێ وەربگرێت؟

ئەبوزەڕ: بەڵێ! کەسێك کە خواوەند کەپوی بڕی بێ و رووی لە قوڕ نابێ* بەڵام ئێستا جگە لە چاکە هیچی [* ***کینایەیە بۆ بەدبەختی و بەڵەنگازی کەسێك کە مەسئولیەتی میللەتێك لە ئەستۆ***

***دەگرێت]***. دی نابینین و ئەگەر خەلافەت بە کەسێك بسپێریت کە عەدالەت پیادە نەکات، لەوەیە بتوانیٚ لە گوناحی رزگار بیٚ.

عومەر بە کاروباری خەڵکی و وەزع و حاڵی حاکمان و کار بەدەستان رادەگەیی و کاری بۆ جێبەجێکردنی یەکسانی و برایەتی دەکرد. خەڵکەکە داوایان لە عومەر کرد کە دەستور بە بیلال بدات تا بانگ بدات. بیلال، بانگبێژی پێغەمبەری خودا، دوای مردنی ئەو زاری لێك ناو بانگە بە سۆزو گیان بزوێن و کاریگەرەکەی کە کاری لە قولایی گیانی موسوڵمانان دەکرد، خامۆش بوو بوو. موسوڵمانان بۆ تازە کردنەوەی یادگاری ئەو رۆژانەی کە پێغەمبەری خۆشەویستیان زیندوو بوو، حەزیان لیٚ بوو جارێکی دیکە گوێیان لە بانگی بیلال بیٚ. عومەر رووی کردە بیلال و گوتی: "بیلال بانگ بدە!" بیلال راوەستاو بە دەنگێکی خەمناك بانگی دا، بە دەنگێك کە سالانی ساڵ مەدینەی هێنا بووە لەرزەو موسوڵمانان خوویان پێوە گرتبوو، ئەم بانگە گڕی لە گیانی ئەبوزەڕ بەرداو مەلی بیری بەرەو مەدینە لە شەقەی باڵی دا. بە چاوی خەیاڵ پێغەمبەری لە مزگەوتەکەدا بینی کە دانیشتووەو یاوەرەکانی لە دەوری خڕ بوونەتەوەو ئەڵقەیان بەستووە. لە یادگارانێکی دڵتەزێن دا نقوم بوو بوو.

**اشهد ان محمدا رسول الله.... اشهد ان محمدا رسول الله.**

بیلال نەیتوانی لەسەری بڕوات.

ئەبوزەڕ کەوتە گریان. فرمێسك وەکو باران بە گۆنایدا دەهاتنە خواریٚ، بانگەکە بە نیوەچڵی مایەوەو بیلال بێدەنگ بوو، ئەبوزەڕیش لە بێدەنگییەکی خەمناکدا نقوم بوو بوو و بیری لە محەمەدی خۆشەویستی دەکردەوە.

# ئەبوزەڕی فەرموودەبێژ

هەژاران و بێ نەوایان لە دەوری ئەبوزەڕ خڕ دەبوونەوە. هەمیشە لەگەڵ ئەودا بوون. تاسەمەندی پاکی و بێگەردی و دینداری ئەو بوو بوون و شەوو ڕۆژ لای ئەو دادەنیشتن و فەرموودەکانی پێغەمبەریان لە زاری ئەوەوە دەبیست. ئەبوزەڕ بە یەکێك لە فەرمووده بێژه بەرجەستەکانی ئیسلام و بە فەساحەت و زمانڕەوانی زۆر چاك و بە نموونەیەکی تەواوی موسوڵمانێکی پارێزکارو دیندار دەژمێردرا،و لەبەر ئەمە بوو بوو بە سەرچاوەو مەرجەعی هەموو موسوڵمانان. ڕۆژێك وەکو هەموو جاران لە مزگەوتدا قسەی دەکرد، یەکێك لە نێو خەڵکەکەوە بە دەنگێکی حەسرەت ئامێزەوە گوتی: کاشکێ من پێغەمبەرم دیبوایە.

ئەبوزەڕ: پێغەمبەر فەرموویەتی: خۆشەویست ترین یارانی من لەلای من کەسانێکن کە یەکێکیان حەز دەکات خانەوادەو سەروەتی خۆی بدات تا من بدینێ. ئەبوزەڕ سەر لە نوێ لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆییشتەوەو چیرۆکی میعراجی لە زمانی پێغەمبەرەوە دەگێڕایەوە. لەم کاتەدا پیاوێکی غەوارەی بینی:

- کێی؟
- نافیعی تاحی.
- لە چ تایەفەیەکی؟
- خەڵکی عێراقم.
- عەبدوڵڵا عامیر دەناسیت؟
- بەڵێ.
- ئەو دەگەڵ مندا قورئانی دەخوێندو هەمیشە لەگەڵ مندا بوو، بەڵام هەوەس و کەڵکەڵەی حکومەت و دەسەڵاتی کەوتە سەر، هەر کاتێ بۆ بەسرە گەڕایتەوە بچۆ بیدینە. پێت دەڵێت: چ کارێکت هەیە؟ بێژه ئەبوزەڕ بۆ لای تۆی ناردووم، و سەڵاوی لێدەکردیو دەڵێت: "خۆراکی ئێمە خورمایەو شەرابمان ئاوەو وەکو تۆش دەژین".

لەم ماوەیەدا یەکێك لە هاوڕێکانی ئەبوزەڕ لە ڕێگاوە گەیی، سڵاوی کردو لەلایەوە ڕۆنیشت. ئەبوزەڕ پێی گوت:

- کەی لە مەدینە گەڕایتەوە؟
- ئەمڕۆ.
- خەبەرو باس؟
- عومەر بیستبووی کە ئەبوسوفیان لەلای معاویەی کوڕی (حوکمڕانی شام) گەڕاوەتەوە، وای هەست کرد کە معاویە، لە گەڕانەوەدا، ماڵو سامانێکی فرەی بە بابیا ناردووەتەوە. ئەبوسوفیان هاتو عومەر گوتی: "بەشەکەی ئێمەش بدە ئەبوسوفیان!" گوتی: "هیچ بە من نەبڕاوە تا بەشی تۆشی لێ بدەم". عومەر دەستی ئەبوسوفیانی راکێشاو ئەنگوستیلەکەی لە قامکی دەرێناو بۆ هندی ژنی ئەوی ناردو بە قاسیدەکەی گوت کە لە

زمانی مێردەکەیەوە پێی بڵێ: "بەم نیشانەیە، ئەو خورجینەی کە هێناومانە بنێرێ"
هێندەی پێ نەچوو کە قاسیدەکە بە خورجینەکەوە گەڕایەوە، خورجینەکە دەهەزار درهەمی تێدا بوو عومەر تەسلیم بە بەیتول مالی کرد.

ئەبوزەڕ: بە زاتی خوا سەرم سوڕدەمێنێ لەو سەحابانەی کە شەیدای دنیا دەبن و زێڕو زیوان بەشت دەزانن، ئەگەرچی لە پێغەمبەری خوایان ژنەوتووە کە دەیگوت: من و دنیا؟ چیرۆکی من و دنیا، وەکو چیرۆکی سوارێکە کە لە رۆژێکی گەرمی تاوساندا رێ دەکات و لە سێبەری درەختێکا لا دەدات و کەمێك پشوو دەدات و ئەوسا دەڕوات.

یەکێکیان گوتی: خوا فەرموویەتی: *(ماڵ و منداڵ زەنبەری ژینی دنیان... سورەتی کەهف، ئایەتی ٤٦)*.

ئەبوزەڕ گوتی: سەیرە! سەیر لەو کەسەیە کە باوەڕی بە جیهانی سەرمەدی هەبێ و ئەوجاش لە پێناوی ئەم جیهانە خاپینۆکەدا تێ بکۆشێت. خوای مەزن فەرموویەتی: *[... ئەو کارە چاکانەش کەوا دەمێننەوە، پاداشتەکەیان لەلای پەروەرێنتەوە هێژاترەو بێتریش جێگەگی هومێدن... سورەتی کەهف، ئایەتی ٤٦]*.

*            *            *

نافیع تاحی گەییشتەوە بەسرە، بەرەو ماڵی میری شار –عەبدوڵڵا عامیر– رۆیی، لێی وەژوور کەوت و سڵاوی کرد، عەبدوڵڵا لە پێویستی ئەوی پرسی، نافیع گوتی: من لە شام بووم و ئەبو زەڕم بینی، بۆ لای تۆی ناردوم.

عەبدوڵڵا کە گوێی لە ناوی ئەبوزەڕ بوو ئەو رۆژگارەی وەبیر هاتەوە کە دەگەڵ ئەم سەحابە داوێن پاك و خواناس و دیندارەی محەممەدا بە ساکاری و سادەیی و خواناسی دەژیان و نقومی مەعنەویات و پاکی و بێگەردی بوون. نافیع لەسەری رۆیی: سڵاوی لێدەکردیت و دەیگوت: "خواردنی ئێمە خورماو شەرابمان ئاوەو وەکو تۆش دەژین".

عەبدوڵڵا کە گوێی لەم قسەیە بوو، خەم و پەژارەو کەسەرێکی زۆر دایگرت، دوگمەکانی یەخەی خۆی کردەوە، سەری خستە بەرۆکییەوەو ئەوەندە گریا، هەموو یەخەو بەرۆکی تەڕ بوو.

# ئەبوزەڕی شۆڕشگێڕ

خەبەر گەییە شام کە ئەبولوئلوئەی ئێرانی –کە یەکێك بووە لەو کۆیلانەی کە لە کوفەوە بۆ مەدینەیان دەبرد– عومەری لە کاتی نوێژدا کوشتووەو عومەر خەلافەتی داوەتە دەست ئەنجومەنێك لە عەلی، عوسمان، عەبدوڕەحمانی عوف، سەعدی ئەبو وەقاس، زوبێر و تەڵحە، ئەبوزەڕ لە لـی خۆیدا گوتی: "خەلافەت هی عەلییە، بە خوا کەس بۆ خەلافەت لەو شایستەتر نییە."

بڕیاریدا بۆ مەدینە بڕوات و وەکو چۆن لە پاڵ پێغەمبەری خۆشەویستیا دەژیا، بەو ئاوایەش لەنزیکی عەلی بژی.

ژن و کیژەکەی هەڵگرت و لەگەڵ قافڵەیەکدا کە بۆ مەدینە دەڕۆیی کەوتە رێ، بە درێژایی رێگا بیری لە عەلی دەکردەوەو ئەو ئایندە درەخشان و روناکەی دەهێنایە بەرچاوی خۆی کە بە دەستانی توانای عەلی بینادەکرێت، و ئەو دادو عەدالەتو بەرانبەری و یەکسانیەی کە لە نێو موسوڵمانادا بەرپای دەکرد، لەبەر چاوی خۆی بەرجەستە دەکردو دڵی بەزی دەگرت، ئومێدەواری بە ئایندەی پرشنگداری ئیسلام، دڵنیایی ئارامیو ئۆخژنێکی خۆشی بە دڵ و گیانی بەخشی بوو. هەر دەڕۆییو بیری لە موسوڵمانانو سیاسەتوانی تازەی دلێرو دادوەرو داوێن پاکی موسوڵمانان دەکردەوە، لە رێگەدا تووشی کاروانێك بوو کە لە مەدینەوە بۆ شام دەهات، هەموو ئاوات و ئارەزوو و خەیاڵە شیرینەکانی ئەبوزەڕ لە شەقەی باڵیانداو ترس و خەم و پەژارەیەکی قورس نیشتەسەر دڵی. بیستی کە عوسمانی کوڕی عەفان بە خەلیفەی موسوڵمانان هەڵبژێردراوە! سەری داخست و لە فکران راچوو و نقومی بێدەنگییەکی خەمناك بوو، لەبن لێوانەوە دەیگوت: عوسمان؟ پیاوێکی بەدینە، گومان لەمە نییە، بەڵام ئەم پیرەمێردە ئەو شایستەییو تواناو دوور بینییەی، کە بتوانێ جێی عومەر بگرێتەوە، تیا نیە، ئاخر ئەو چۆن دەتوانێ جێی عومەر بگرێتەوە؟.

کاروان گەییە مەدینە،و ئەبوزەڕ لە رێوە چوو بۆ لای عەلی، سڵاوی کردو دانیشت و پاش ئەو گفتوگۆیەی کە لە نێوان ئەو دووەدا کرا، ئەبوزەڕ زانی کە عوسمان چۆن هەڵبژێردراوەو بۆچی عەلی لەسەر هەقی خۆی سوور نەبووە. ئەوجا رووی کردە عەلی و گوتی:

دیارە ئەمە ویستی خودا بووەو کەس بە خواستی خودا نارازی نیە، ئەبوزەڕ لە مەدینەدا مایەوە، بە چاوانی خۆی ئارەزوو مەیلی توندی عوسمانی بەلای بەنی ئومیەدا دەبینی و چڕی دەسەڵاتی ئەوانی لە ناو دەوڵەتی ئیسلامی دا بە چاو دەبینی، دەیبینی کە رژێمی خەلافەت گۆڕاوە بە رژێمی پاشایەتیو زەنبەرو تەشریفاتکاری پاشایی لە حکومەتی ئیسلامیدا دەرکەوتووەو شەهوەتپەرستیو دنیاداری دینداریو تەقوای سیاسی رژێمی ئیسلامیدا زاڵ بووە، دەیبینی گەلێك لە یارانی پێغەمبەریش وەزع و حاڵی خۆیان گۆڕیوە، زوبێر و تەڵحەو عەبدوڕەحمان عوف ***(ئەوانەی لە ئەنجوومەندا رایان بە عوسماندا)*** موڵك و ماڵێکی فرەیان بە دەست هێناوە، سەعدی

ئەبی وەقاس لە (عەقیق) خانوویەکی یەجگار جوانی، بە هۆڵ و ساڵۆنانی گەورەو حەساری بەرین و قاتی بەرزەو دروست کردووە، (٤)

ئەبوزەڕ ئەم لادان و کەچڕەویانەی دەبینی و جگە لە خەبات هیچ چارێکی تری نەبوو، راپەڕی و بێ ئەوەی زەرەیەك ترسی لە دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوای وەخت هەبێ، خەڵکی بۆ دینداری و خواناسی و یەکسانی هاندەداو بە توندی هێرشی دەکردە سەر عوسمان و رەفتاری ناحەزی عوسمان.

رۆژێ خەبەری زانی کە عوسمان هەموو قەڵای خەیبەرو پێنج یەکی باجی سەرانسەری ئەفریقای بە مامی خۆی مەروان حەکەم (ئەو کەسەی کە پێغەمبەر خۆی و بابی نەفی کردبوو و دوور خستبووەوە) بەخشیوە، سێ سەد هەزار درهەمیشی بە حەرسی کوڕی ئەبی عاس و سەد هەزار درهەمی بە زەیدی کوڕی سابت داوە!(٥) ئەبوزەڕ لە مزگەوت دانیشت و ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

***[... ئەو کەسانەی زێڕو زیو کۆ دەکەنەوەو لە رای خودا بەختی ناکەن، تۆ لەو ئازارە بەژانەی تووشی دێن ئاگاداریان کە. سورەتی تەوبە، ئایەتی ٣٤ ].***

مەروان بیستییەوە کە ئەبوزەڕ زۆر بە توندی هێرش دەکاتە سەر ئەوو عوسمان. مەسەلەکەی لە عوسمان گەیاند. عوسمان نائیلی خوڵامی خۆی بە دووی ئەبوزەڕدا نارد، ئەبوزەڕ وەژوور کەوت، عوسمان هێشتا بە تەواوەتی چاوی پێ نەکەوتبوو گوتی: ئەی ئەبوزەڕ، دەست لەو کارە هەڵگرە کە دەربارەی تۆم بیستووە!

– چت دەربارەی من بیستووە؟

– بیستوومە کە تۆ خەڵکیم لێ هاندەدەی!

– چۆن؟

– بیستوومە کە تۆ لە مزگەوتا جگە لە ئایەتی: ئەو کەسانەی زێڕو زیو کۆ دەکەنەوە.. هیچی تر ناخوێنی!

– ئایا عوسمان، خەلیفەی پێغەمبەری خوا، من لە خوێندنی کتێبی خواو دژایەتی ئەو کەسانەی کە دەستووری خوایان لە عاردی داوە، مەنع دەکات؟ قەسەم بە خودا پێم خۆشترو باشترە کە بە تووڕە کردنی عوسمان، خوا رازی بکەم، نەك بە رەزامەندی عوسمان، خوا تووڕە بکەم.

تووڕەیی نیشتە سەر چارەی عوسمان و هیچ وەڵامێکی نەدایەوەو بێدەنگ بوو، و بێدەنگییەکەی درێژەی کێشا تا ئەبوزەڕ بە عەزم و جەزمێکی توندترو بڕیارێکی بنجبڕترەوە لەنك وی هاتە دەرێ.

ئەبوزەڕو عەلی زۆر یەکتریان دەدی و سات بە سات هێرشی توندی ئەبوزەڕ بۆ سەر عوسمان و دام و دەزگاکەی توندتر دەبوو* ***[* لێرەدا لەوەیە نووسەر ویستبێتی تا رادەیەك عەلی بە هاندەری ئەبو زەڕ دابنێ]*** عوسمان بە دوای هەنجەتێکدا دەگەڕا، کە دووری بخاتەوەو لەم ئاژاوەچیە بخەلەسێ و ئەو خەتەرەی کە سات بە سات زیاتر دەبوو، لە کۆڵ بکاتەوە. رۆژێ ئەبو زەڕ چووە لای عوسمان، کەعوبول ئەحبار – رۆحانی جولەکە کە تا زەمانی عومەر هێشتا موسوڵمان نەبوو بوو و وەزیری شیرەتکاری عوسمان بوو– لەلای ئەو رۆنیشتبوو و پێکڤە

داخـاوتن. عوسمـان روويكـرده كـەعب و گـوتی: سـەبارەت بـە فـەرمانڕەوا دەشـێت داراییـەك وەربگرێت و هەر كاتیێ بوی بیداتەوە؟

ئەبوزەڕ: نەخێر، ناشێت.

كەعبول ئەحبار: قەیناكات.

ئەبوزەڕ (روو لە كەعب): جولەكەزادە! تۆ دینی خۆمان فێر دەكەی؟!

كەعب نیگایەكی گلەیی ئامێزی عوسمانی كرد. عوسمان گوتی:

– چەند ئازاری خۆم و هاوڕێكانم دەدەی!

گەنگەشـەو دەمەقڕەیـەكی توند لـە نێـوان ئـەبوزەڕو عوسمانـدا، روویـدا. عوسمان كە لەتوڕەییـدا دەنگی دەلەرزی گوتی:

– بڕۆرەوە بۆ شام.

# ئەبوزەڕی سوسیالیست

ئەبو زەڕ گەییشتەوە شام. معاویە کۆشکی کەسکی دروست دەکردو هەزاران کرێکار کاریان تێدا دەکرد. معاویە دڵشادو بە کەیف لەوێندەر وەستا بوو، ئەبوزەڕ بەوێدا ڕەت دەبوو، کە ئەو دیمەنەی بینی ڕووی تێکردو گوتی:

- معاویە! ئەگەر ئەم کۆشکە لە ماڵی خەڵکی دروست دەکەی ئەوا خیانەتەو ئەگەر لە ماڵی خۆت دروستی دەکەی ئەوا زێدە مەسرەفە!

معاویە لە شەرمانا سوور هەڵگەڕاو هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. ئەبوزەڕ بە ڕێی خۆیدا ڕۆیی تا گەییە مزگەوت و لەوێ دانیشت. دەستەیەك لە موسوڵمانان هاتنە لای و سکاڵایان لە معاویە کردو گوتیان کە مودەتێك ڕۆییوەو هێشتا مووچەکانی نەداون، ئەبوزەڕ کەمێك سەری داخست و ئەوسا یەکڕاست هەستاو لە بەردەم خەڵکەکەدا وێستاو گوتی: شتێك هاتووەتە ئاراوە کە من تا ئێستا سەرم لێدەرنەکردووە، بەزاتی خوا ئەم کارانە نە لە کتێبی خوادا هەن ونە لە ڕەفتاری پێغەمبەرەکەیدا هەبوون. بە خوایەتی خودا دەبینم هەق پایە ماڵ کراوەو نەهەقی و چرووك زندوو کراوەتەوەو ڕاستگۆیان بە درۆزن لە قەڵەم داوەو پەشێوی و پاشاگەردانی سەری هەڵداوە.

ئەی دەوڵەمەندان! دەگەڵ هەژاراندا یەکسانی بکەن: [.. ***ئەو کەسانەی زێڕو زیو کۆ دەکەنەوەو لە ڕای خوا بەختی ناکەن... ڕۆژێ کە ئەم زێڕو زیوە بە ئاگری جەهەندەم سوور دەکرێنەوە، توێڵ و کەلەکەو پشتیانی پێ داغ دەکرێ.. سورەتی تەوبە، بەشێك لە ئایەتی ٣٤ و بەشێك لە ئایەتی ٣٥***].

ئەی سەرمایەدار چاك بزانە کە لە هەر سەروەتێکدا سێ شەریك هەیە: یەکێکیان قەدەرو چارەنووسە کە لە فەوتان و نابووتی سەروەتەکەتا پرس بە تۆ ناکات، دووەمیان میراتگرە کە چاوەڕوان دەکات تاسەر بنەیتەوەو بیرفێنێ و تۆ لەبەر بارەگای خوادا قەرزاربار ببی و سێیەمیش خۆتی و ئەگەر توانیت لە دوو شەریکەکەی ترت بێ دەسەڵات تر مەبە! خودای مەزن دەفەرمووێ*: [* ***تا لەو شتەی کە ئێوە خۆشتان گەرەکە، نەبەخشن لە ڕێی خودادا، هەرگیز هیچ خێروو پێ ناگا... سورەتی ئالی عیمران، ئایەتی ٩٢***]. ئەی سەرمایەدار! چما نازانی کە مرۆڤ بمرێ ئیدی ناتوانێ هیچ کارێك بکات، مەگەر کەسانێك کە شوێنەوارێکی نەمر لە دووی خۆ بەجێ بێڵن کە خەڵکی هەمیشە لێی بەرخوردار بن، یان زانستێك کە سوودی بۆ هەمووان بێ یان فرزەندێکی دیندارو داوێن پاك کە یادی بکاتەوە، پێغەمبەر فەرموویەتی: ***"پەروەردگاری من گوتی ئەگەر دەتەوێ دەشتی مەککەت بۆ دەکەم بە زێڕ، گوتم نا، ئەی خودا، حەز دەکەم بە سکێ تێرو بە سکێ برسی بم، تا لە ڕۆژی برسیەتیەکەمدا لەبەر بارەگای تۆدا بپاڕێمەوەو لە ڕۆژی تێرییەکەمدا سوپاس و ستایشت بکەم."*** ئێوە قوماشی ئاوریشم و پەردەی حەریر بۆ خۆ هەڵدەبژێرن و بە قوماشی زبر بەدەنی ناسك و بەناز پەروەردەتان ئازاری دەگاتێ، لە کاتێکا پێغەمبەر بە خۆی لەسەر حەسیر دەنووست، ئێوە خواردنی هەمە جۆر دەخۆن و کەچی پێغەمبەری خودا لە نانی جۆیش تێر نەدەبوو!

ئەی سەرمایەدار! مەگەر نازانی کە هەموو ڕۆژێك دوو فریشتە دێنە سەری زەوی، یەکێکیان دەڵێت: "خودایە ئەو کەسانەی ماڵی خۆبەخت دەکەن پاداشتیان بدەوە!"و دووەمیان دەڵێت:"خودایە ئەو کەسانەی کە سەرمایە کەڵەکە دەکەن بیانکوژە".

خەڵکەکە گوێیان لە خوتبەکەی گرت، ڕەش و ڕووت و هەژاران دڵیان پێ کرایەوە، بەڵام سەرمایەداران لە ترسانا لەرزیان لێهات. چەندەبی کوڕی موسلیمەی فەهری خەڵکێکی فرەی لە دەوری ئەبوزەڕ بینی، لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەڵاو فیتنەیەکی گەورەیە". و ئەوجا یەکڕێ بۆ لای معاویە رۆیی و گوتی: "ئەبوزەڕ شامت لێ دەهاڕوژێنێ، ئەگەر شامت دەوێ فریای خەڵکی بکەوە!".

معاویە سەری داخست و لە فکران ڕاچوو: ئایا بەتوندی ڕەفتاری دەگەڵ بکات؟ نە، چونکە ئاگری ئەم فیتنەیە زیاتر بڵێسە دەسەنێ، ئایا لای عوسمان شکاتی لێ بکات؟ عوسمان چ دەڵێت؟ ناڵێت دەرەقەتی کەسێکی ڕەعیەتەکەی خۆی نایەت؟ باشتر وایە لە شام دووری بخاتەوەو بۆ یەکێك لە شەڕەکانی بنێرێ، چونکە لە ڕادەبەدەر ئاشقی شەڕە لە ڕێی خوادا، معاویە لەسەر ئەم بڕیارە گیرسایەوەو ناردی بە شوێنیا. ئەبوزەڕ هات، ئەبول دەزداء و شەدادی کوڕی ئەوس و عیبادەی کوڕی سامیت لەلای معاویە دانیشتبوون، ئەبوزەڕ لایان دانیشت و معاویە دەستی بە قسان کرد:

– من بۆ عومەرم، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەربارەی فەتحی قوبرس نووسی، کە لە ئاواییەکی حومسەوە خەڵکی گوێیان لە لورەی سەگ و بانگی کەڵەبابانی قوبرس دەبێ* و بەمجۆرە فەتحی قوبرسم لەبەر چاوی عومەر ئاسان کرد، بەڵام عومەر ڕەحمەتی خوای لێ بێ بۆ عەمری کوڕی عاسی نووسی کە "دیمەنی دەریاو کەشتیم بۆ وەسف بکە!".

*[* مەبەست لەوەیە کە قوبرس زۆر لە خاکی موسوڵمانانەوە نزیکە.]*

عەمر وەڵامی دایەوە: "دەریا ئافەریدەیەکی یەجگار مەزنە کە ئافەریدەیەکی یەکجار بچووکی بەناودا دەڕوات، جگە لە ئاوو ئاسمان هیچ شتێك بەرچاو ناکەوێ، لە کاتی ئارامیدا دڵ دەترسێنێ* و لە کاتی نا ئارامیدا ئەقڵ دەشێرزێنێ. ئومێد لەوێدا زۆر کەم دەبێ و ترس زیاد دەکات، ئەو کەسەی کە بە دەریادا سەفەر دەکات لە کرمێك دەچێت کە بەسەر دارێکەوە بێ، و هەرکە دارەکە خوار بێتەوە ئەو غەرق دەبێ و ئەگەر لە تۆفان ڕزگار بێ سەری سوڕ دەمێنێ".

*[* لەبەر ئەوەی کە لە کاتی ئارامی دەریادا کەشتیانی چارۆکەدار ناتوانن بجوڵێن].*

عومەر بۆی نووسییەوە: "قەسەم بەو کەسەی محەمەدی بە هەق ناردووە، ئامادە نیم تاقە یەك نەفەری موسوڵمان بۆ شوێنی وا بنێرم". بەڵام ئێستا وا داواکەی خۆم تازە کردووەتەوەو بۆ عوسمانم نووسیوەو جەختم لەسەر فەتحی قوبرس کردووەتەوەو ئەویش مەسەلەکەی داوەتە دەستی خەڵکەکە خۆیان. جا ئێستا ئێوە بەخۆتان سەرپشکن و چۆنتان دەوێ ئاوهای قەرار لێ بدەن.

ئەبوزەڕ گوتی: ڕۆژێك لە ڕێی خوا، لە هەزار ڕۆژ لە ڕێی کەسێکی تر باشترە، ئێمە بۆ جیهاد بانگ کراوین و تەنها قەبوڵ کردنمان لێدەوەشێتەوە. هەندێ سەحابەی دیکەش کە لەوێ بوون ڕازی

بوون. معاویە، عەبدوڵڵا قەیسی، هاوپەیمانی خێڵی بەنی فەزارەی کرد بە فەرماندەیان، کەشتیان ئامادە بوو، و فەرماندەی سوپا دەستووری پێشڕەوی دا.
سەوڵان کەوتنە کارو هێزی دەریایی ئیسلام بەرەو شەڕ بەڕێ کەوت. کەشتیان سینەی شەپۆلانیان شەق دەکردو دەچوونە پێشێ تا گەیینە ناوەڕاستی دەریا، دەریایەکی بێ سنوور، ئاوو ئاسمان، بێدەنگییەکی مەنگ و ترسناك، ئاسمان سنگی نابووە سەر دەریا، کەشتیانی چارۆکەدار درێژەیان بە رێی خۆ دەدا، لە پڕ بایەکی توند بە گڤو هوڕ لەوسەری دەریاوە هەڵیکردو هات، شەپۆلان بەدەم کەف چەرین و سەماوە، دەرەقسێن و ئالکاوو ئامبازی یەکتر دەبوون، لە تۆ وایە بادەی شێتییان خواردووەتەوە، دوور دەکەوتنەوەو نزیك دەبوونەوە، مردن لەبەر چاوی لەشکر بەرجەستە بوو، و زاری بۆ قوتدانیان بەش کردبووەوە.
تۆفان بەرە بەرە نیشتەوە، دەریا ئارامی گرت، شەپۆلانی سەر شێت دامرکانەوە، تۆفان رام بوو، ئەبوزەڕ زمانی کرایەوەو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ***[هەرگا لە ناو دەریایەدا تووشی فەرتەنەیەك هاتن، هانا بۆ هەر کەسێك بەرن، بەرپێوارە، بە غەیرەز ئەو... سورەتی ئیسرا، ئایەتی ٦٧ ].***
خواستی خوا بوو کە موسوڵمانان بە سەلامەتی لە خەتەر بخەلەسن و بگەنە قوبرس، جەنگ لە نێوان موجاهیدان و قوبرسییان دەستی پێکرد، شمشێران بە رق و تووڕەیی دا دەهاتنەوە پێك دەکەوتن و موسوڵمانان میناکی شێر دلێرانە ریزی دژمنیان دەشکاندو بەناو دوڕگەکەدا دەچوونە پێش تا رینگ وهۆڕی شمشێران کپ بوو و قوبرسییان دەستیان لە شەڕ هەڵگرت و تەسلیم بوون.
دوژمنی هاوبەشی دەرەکی و بێگانە شکستی هێناو ئیدی کارێك نەما تا ئەبوزەڕ لەوێندەر وەمێنێ، بۆ شام زڤرییەوە تا لە نوێ دەست بە خەباتی ناوخۆیی بکاتەوە، معاویە هەراسان بکات و دەوڵەمەندو سەرمایەداران شپرزەو پەرێشان بکات. عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء* زانی کە ئەبو زەڕ بۆ شام گەڕاوەتەوە، ئەو لەلایەن گرانی ماڵباتی پێغەمبەرو لە شیعەیانی عەلی بوو و خەڵکی دژی عوسمان و کار بەدەستانی عوسمان هان دەدا. چوو بۆ لای ئەبوزەڕ و گوتی: ***[* عبداللەی کوڕی سبأ، دەڵێن لەجولەکەکانی یەمەن بووەو موسوڵمان بوو بوو، کە هەمیشە خەلافەت لە چالاکی و چەلەنگییە کودەتاییەکانی ترساوەو لە سەرانی شۆڕش دژی عوسمان بوو. خۆشەویستی ئەو بۆ عەلی بووە بایسی ئەوەی کە لە ژێر کاریگەریی باوەڕی یەهودیەت دا ئەو بە خوا بزانێت و عەلی لەسەر ئەمە نەفی کردو عەلی پەرستەکانی تری لە ئاگردا سووتاند (ملل و نحل شهرستانی). ئەمە کەسایەتیەکی گومان لێکراوەو بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی تەها حوسەین و ئاغای عەسکەری مێژوونووسی هاوچەرخی ئیسلامی دەستکردو دروستکراوی سەیفی کوڕی عەمری درۆسازی دەرباری ئومەویە (بروانە الفتنە الکبری و عبدالله سبأ).***
– ئەی ئەبوزەڕ! ئەرێ بەراستی سەرت لە معاویە سوڕ نامێنێ؟ دەڵێت ماڵ ماڵی خودایە، چما هەموو شتێك هەر هی خوا نیە؟ پێدەچێت بیەوێ سەروەت و سامانی خەڵکی بە هی خودا دابنێ و ناوی موسوڵمانان بسڕێتەوە.
ئەبوزەڕ: تۆ دڵنیایت ئەم قسەیەی کردووە؟

**کوڕی سەبەء: بەڵێ، لە هەموو خوتبەو گوتارەکانیا ئەوە دەڵێت.**

**ئەبوزەڕ: بە زاتی خوا ئیعتیرازی لێ دەگرم.**

**ئەبوزەڕ یەکراست هەستاو بە هەشتاو رووی کردە کۆشکەکەی معاویە، مۆڵەتی وەرگرت و وەژوور کەوت. معاویە بە روو خۆشیو گەرمی پێشوازی کرد، بەڵام ئەبوزەڕ بێ ئەوەی گوێ بەم شتانە بدات بە تورەیی گوتی ئەی معاویە! تۆ مەبەستت چیە کە ئێستا ماڵ و سامانی موسوڵمانان بە ماڵ و سامانی خوا ناو دەبەیت؟**

**معاویە (بە زەردەخەنەوە): رەحمەتی خوات لێ بێ ئەبوزەڕ... چما ئێمە بەندەی خوا نین؟و ماڵ ماڵی خوا نیە؟**

**ئەبوزەڕ: تۆ ئەمە مەڵێ، بڵێ ماڵی موسوڵمانان***

***[* لە جیهاندا لایەك خودایەو لایەکەی تر هەر شت و هەر کەسێکە جگە لە خوا. بەڵام لە کۆمەڵگەدا لایەك خواو خەڵکییەو لایەکەی تر تاك یان گروپێن دژە خەڵکی، مۆنۆپۆل خوازانن. لەم زەمینانەدا هەمیشە دەتوانرێ لە جیاتی خوا، خەڵك دابنرێ چونکە مانای خەڵك دەدا: لله الحکم، الارض لله، المال لله، في سبيل الله... یانی دەسەڵات و حوکم، زەوی و سەرمایە هی خەڵکە واتە هی تاك نیە (نەك هی خوا نیە) معاویەکان دەڵێن هەموو شتێك هی خوایە واتە هی خەڵکی نیە، هی نمایندەی خوایە، واتە هی ئەوانە،و ئەبوزەڕ دەڵێت خەڵکی نمایندەی خوان. قورئان هەمیشە لەم شوێنانەدا ناوی خودا لە جیاتی ناوی خەڵکی دێنێ: ئەگەر ئێوە وامێ رەوا بەخودا رەوا ببینن، چەند قات پێتان ئەداتەوەو لە گوناهانوو خۆش دەبێ، هەر خودا بۆ شوکر دەبێو لەسەرخۆیە. سورەتی تەغابون، ئایەتی ١٧ ].***

**معاویە: زۆر باشە، لەمەدوا دەڵێم ماڵی موسوڵمانان.**

**ئەبوزەڕ ویستی بڕوات، معاویە گوتی: ئەی ئەبوزەڕ، چ شتێك تۆی واهی لێ ورووژاندین؟**

**ئەبوزەڕ: تاڵانی، ماڤ موسوڵمانانەو تۆ بۆت نیە هیچی بۆ خۆت لێ هەڵگریو کۆی بکەیتەوە، بەڵام تۆ بە پێچەوانەی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرەوە بۆ خۆت و بۆ بەنی ئومیەت کۆکردووەتەوە.**

**معاویە: ئەبوزەڕ! بە پێچەوانەوە، من هیچ سامانێکم خڕ نەکردووەتەوە، بەڵکو زەخیرەم کردووە بۆ عەوامی خەڵکی خەرج بکەم، من خەڵکیم لە سەروەت بێ بەش نەکردووەو لە هەر شوێنێ پێویستی کردبێ لەو شوێنەم سەرف کردووە.**

**ئەبوزەڕ: تۆ بەم حەتەمیەت و بەخششەت رەزامەندی خوات مەبەست نیە، بەڵکو دەخوازی کە خەڵکی بە بەخشندەت ناو بەرن. وەکو وایان کردووە، ئەی معاویە دەوڵەمەند تۆ دەوڵەمەندو هەژار تۆ هەژارت کردووە!.**

**معاویە: ئەی ئەبوزەڕ دەست لەم کارەت هەڵگرە، تۆ خەڵکی بۆ شۆڕش دندە دەدەی، شۆڕشێك کە جگە لە خوای زانا کەس ئاقیبەتی نازانێ.**

**ئەبوزەڕ: قەسەم بە زاتی ئەو کەسەی گیانمی بەدەستە، دەستبەردار نابم تا ئەو کاتەی کە دەوڵەمەندان سەروەت و سامانان دابەش نەکەن.. ئەوجا بە تورەیی پشتی تێکردو وەدەرکەوت.**

معاویه سەری داخست و لە فکران راچوو، دەبێ چ لەگەڵ ئەم پیرەمێردە سەر سەخت و لاسارەدا بکرێ؟ هەستا، بە دەم بیرکردنەوەیەکی قوڵەوە بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. ئەوجا دەستووری دا و کیسەیەکیان هێنا کە سێ سەد دانە دیناری تیا بوو، یەکێك لە پێشخزمەتەکانی گاز کردو گوتی: خۆت بگەیەنە ئەبوزەڕ و ئەم کیسەیەی بدەیە، کابرای خوڵام بە غار دووی کەوت و کە لە رێگا پێی گەیی گوتی معاویە ئەمەی بۆ تۆ ناردووە.

ئەبوزەڕ نیگایەکی ئەو دەستەی کە کیسە پارەکەی هەڵگرتبوو، کردو گوتی: ئەگەر ئەمە مووچەی ئەمساڵی خۆمە کە منیان لێ بێ بەش کردووە وەری دەگرم، بەڵام ئەگەر بەخششە من پێویستم پێی نییە.

پێشخزمەتەکە بەو دەقەوە وەستا بوو و کیسەکەی بە دەستەوە بوو و دەیڕوانیە ئەبوزەڕ تا شایەت قەبوڵی بکات.

ئەبوزەڕ بە توندی گوتی: بیبەرەوە بۆ خۆی! من پێویستم پێی نیە... ئەوسا لە حاڵێکا کە سەراپای لە ئاگری توڕەییدا دەسووتا، خۆی بە مزگەوت دا کرد، خەڵکەکە، بە تایبەتی ئەو چینە هەژارو رەش و رووتەی کە لە تاو ستەم و گوشاری معاویە پەنایان وەبەر ئەبوزەڕ هێنا بوو، بەرەو رووی هاتن.

ئەبوزەڕ بە دەنگێکی رەسا هاواری کرد: ئەی سەرمایەداران ئەوەی خوا پێی داون لێی ببەخشنەوە! با ژیانی ئەم دنیایە فریوتان نەدات، سەروەت و سامانتان هەقی هەژارانیشی تێدایە: پەیامبەری خودا فەرموویەتی: " ئادەمیزاد دەڵێت: ماڵی من، ماڵی من. مەگەر تۆ جگە لەوەی دەیخۆیت و فڕێی دەدەیتەوە، جگە لەوەی دەیپۆشیت و کۆنە دەبێ و جگە لەوەی دەیبەخشیت و بۆت دەمێنێتەوە ماڵێکی ترت هەیە؟" ئەی گەلی دەوڵەمەندان، یەزدانی مەزن سەرمایەداری قەدەغە کردووە، پەیامبەری خوا فەرموویەتی: نەمێنێ زێڕ! نەمێنی زیو!" ئەم قسانە چەند لە شانی ئێوە گرانە لەبەر دڵی یارانی ئەویش ناخۆش بوو، لە دڵی خۆدا دەیانگوت: "ئەدی چ ماڵێك-مان هەبێ؟"

عومەر پێی گوتی: "من ئێستا بۆچوونی پێغەمبەرتان بۆ دێنم." چوو بۆ لای پێغەمبەرو گوتی: یارانت ئەم قسەیەیان لەبەر گرانەو دەڵێن ئەدی چ ماڵێك-مان هەبێ؟" پێغەمبەری خۆشەویست گوتی: ***"زمانێکی شوکرانە بژێر، دڵێکی سوپاسگوزارو ژنێك کە لە کاروباری ئیماندا یارمەتیتان بدات."*** ماڵی تالانی هەقی خەڵکە بەڵام معاویە هەمووی سەرەفی شکۆو تەشریفاتی دامو دەزگاو زێڕەڤان و گاردی دەربارو خزمەتگوزارانی خۆی دەکات، معاویە ئەوەی لە بیرکردووە کە جگە لە دوو دەست جل (دەستێکی زستانەو دەستێکی هاوینە) و هەزینەی زیارەتی ماڵی خواو خەرجی خۆراکی خۆی و خانەوادەکەی چ شتێکی تری پێ رەوا نیەو ئەویش دەبێ وەکو یەکێك لە ئەندامانی قورەیش بژی. نە لە هەموو کەسێك دەوڵەمەندترو نە هەژار تربێ. عومەر وای دەکرد، ئەدی معاویە بۆ چاو لەوی ناکات؟ ماڵی تالانی ودەسکەوت دەبێ وەکو زەمانی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەر بە یەکسانی بەسەر هەموو خەڵکیدا دابەش بکرێ. موڵك و ئەپارتمانێکی فرە دەکڕێ و هەزاران دینار بۆ رازانەوەیان سەرف دەکات و موسوڵمانان پشت گوێ دەخات. عومەر

چووە حەج و بە چوون و هاتنەوە شازدە دینار خەرجی سەفەرەکەی بوو، ئەوجاش بە کوڕەکەی گوت: ***"لەم سەفەرەدا دەست بڵاویمان کرد!"*** عومەری پێشەوای موسوڵمانان لە سەفەری حەجەکەیدا شازدە دینار خەرج دەکات و هێشتاش بە زیادی دەزانێ، بەڵام معاویە هەزاران دینار بە بەنی ئومەیە دەبەخشێت و هێشتا بە کەمی دەزانێ...!

لەو کاتەدا کە ئەبوزەڕ لە گەرمەی خوتبە ئاگرینەکەی خۆیدا بوو، یەکێك لەوانەی کە تەنانەت لە بیستنیشی دەترسان، بە ئەسپایی بەگوێیدا چپاند: "زۆرت هێرش کردە سەر معاویە، ئاگاداربە!"

ئەبوزەڕ رووی تێکردو گوتی: خۆشەویستەکەی من، محەمەد، ئامۆژگاری کردوم کە ***"هەق بڵێم هەر چەندە رەق و تاڵیش بێ و لە ڕای خوادا لە سەرزەنشت و گازاندەی کەس نەترسم"*** . من ئەو دوعایە دەڵێمەوە کە ئەو هەمیشە دەیخوێند: "خودایا لە ترسنۆکیم بپارێزە، خودا یا لە رژدی و بەغیلیم بپارێزە، لە نزمترین قۆناغی ژیاندا پەنا وەبەر تۆ دەبەم و لە فریوی ژیان و ئەزابی مەرگ بم پارێزە." کابرا خەفە بوو و ئەبوزەڕ، بێزار لەم موسوڵمانە ترسنۆکانە، دیسان درێژەی بە قسەکانی خۆی دا:

– ئەمانە لە خواردنی خۆدا رازانەوەکاری و تەشریفاتێکی زۆر دەکەن، هێندەی خواردنی رەنگاو رەنگی تێ دەترێنن کە مەجبورن بۆ هەرسکردنی دەرمانێکیش بخۆن، کەچی پێغەمبەر تا لە دنیادا بوو تاقە رۆژێ نەبوو کە دوو جۆرە خواردن بخوات، ئەگەر رۆژێ خورمای خواردبا نانی نەدەخوارد. خانەوادەی محەمەد هیچ کاتێك رێك نەکەوتووە کە سێ رۆژی دوا بەدوای یەك بەیانی و ئێوارە لە نانی جۆ تێر ببن، هەیڤان دەبورین و ماڵباتی پێغەمبەری خودا ئاگریان نە بۆ نان و نە بۆ چێشت لە ماڵدا نەدەکردەوە!

یەکێك لە ئامادە بووان بە سەرسامی پرسی: ئەدی بەچی دەژیان؟

ئەبوزەڕ: بە خورما و ئاو! پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: "بەشەر قاپێکی پڕ نەکردووە کە لە ورگی خراپتر بێ، مرۆڤ ئەو خواردنەی کە لە بەردەمیایە بەسە" هەروەها فەرموویەتی: "خۆ لە زۆر خۆری بپارێزن، چونکە لە نوێژا تەمەڵتان دەکات، جەستە دادەوەشێنێ و بۆ نەخۆشی زۆر خراپە. لە سەرتانە کە لە خواردنا میانڕەوبن، چونکە هەم لە زێدە مەسرەف بە دوورەو هەم بۆ بەدەن بە سوودەو هەم بۆ خواپەرستیش گورج و گۆڵتر دەبن." وا خەیاڵ نەکەن کە یارانی پێغەمبەر چونکە هیچیان نەبووە خەرجی بکەن، بۆیە پارساییان دەکرد، نەخێر، بەڵکو تەنیا بۆ رەزامەندی خواو بە ئومێدی ئەو بەڵێنانەی کە خودا پێی دابوون پارێزگارییان کرد بوو بەپیشە.

حەفسە* پاش ئەوەی سەروەت و سامانێکی فرە لە وڵاتانی فەتح کراوەوە بۆ مەدینە هێزاو دەوڵەتی هەژاری ئیسلامی دەوڵەمەند بوو بە عومەری گوت: "باوکە! هەقە جلێکی نەرمتر لەبەر بکەی و خواردنێکی باشتر لەمەی ئێستاش بخۆی، خوا ئێستا رزق و رۆزی فراوان کردوین."

*(* حەفسە، ژنی پێغەمبەر وکچی عومەر بوو.)*

عومەر گوتی: "من خۆت دەکەم بەقازی، ئایا لە بیرت چوو کە پەیامبەری خوا لە ژیانیا چ دژواری و تەنگانەیەکی تەحەمول دەکرد، هەروەها ئەبوبەکر چۆن دەژیا؟..."

**عومەر هێندەی لەم نموونانە لە ژیانی ئەوان بۆ هێنایەوەو بیری خستەوە تا خستیە گریان‌و گوتی: "ئامان! بەزاتی خودا منیش دەبێ لە دژواری ژیاندا شەریکایەتیان بکەم تا بەڵکو بگەمە ئەو ژیانە خۆشەی ئەوان. پەیامبەری خودا پێنج یەکی دەسکەوتانی وەر دەگرت، نەهیچی لێ پاشەکەوت دەکردو نەکۆی دەکردەوە، بەڵکو هەرچیەکی وەردەگرت دەیبەخشی‌و هیچی بۆ خواردنی خۆی گل نەدەدایەوە. عایشە رۆژێ بەبرسێتی بینی‌و لە حەژمەتاندا کەوتە گریان‌و گوتی: "ئەی پێغەمبەری خودا بۆچی داوا لە خواناکەی کە خواردنێکت بداتیٚ؟" پێغەمبەر گوتی: "ئەی عایشە! سوێند بەو کەسەی کە گیانم بەدەستیەتی ئەگەر داوام لە پەروەردگارم کردبا کە کێوانی دنیام بۆ بکات بە زێرو بۆ هەرکوێ بڕۆم لە گەڵمیا بنێرێ، بۆی دەکردم، بەڵام من برسیەتی جیهان بەسەر تێرییداو هەژاریی بەسەر دەوڵەمەندییداو خەمی بەسەر شادییدا پەسند دەدەم. ئەی عایشە! دنیا بۆ محەمەدو خانەوادەی محەمەد بەکەڵك نایەت. خودا تەنیا بە سەبری گەورە پێغەمبەران دەرهەق بە ناشیرینی‌و جوانی جیهان رازی دەبێ‌و دڵخۆش دەبێ. وەکو ئەوان داوای لە منیش کردووەو فەرموویەتی: "تەحەمول‌و سەبرت بێ وەکو پێغەمبەران بوویانە." بەزاتی خوا هیچ چارێکم نیە جگە لە ملکەچی‌و گوێڕایەڵی، قەسەم بەخوا میناکی ئەوان تا بتوانم سەبر دەکەم، کە تواناو هێز تەنیا هی خوایەو لە خواوەیە."**

* * *

**رۆژێ جەلامی کوڕی جەندەب، حوکمڕانی قنسرین، بۆ لای معاویە دەچوو، لەبەر کۆشکەکەی معاویەدا پیاوێکی بینی، باڵا بەرز، پشتی کەمێك چەماوە، گۆناکانی زەق و گەنم رەنگ‌و رەقەڵە، کە بە توڕەیی هاوار دەکات: "باری ئاگرتان بۆ هات "خودایە نەحلەت‌و نەفرەت لەو کەسانە بکە کە دەستبەرداری نەهی لە خراپە دەبن! خودایە نەحلەت و نەفرەت لەو کەسانە بکە کە دەستبەرداری ئەمر بە چاکە دەبن!" معاویە رەنگی بزڕکاو لە ترسانا لەرزی لێهات و رووی کردە جەلام و بە سیمایەکی پڕ ژان و خەمگینەوە گوتی: ئەم پیاوەی کە هاوار دەکا دەناسیت؟**
**جەلام: نە ء**
**معاویە: (بە دەنگێکی ناچاری): "کێ من لە دەستی جەندەبی کوڕی جنادە دەخەڵەسێنیٚ؟ هەموو رۆژێ ئەم کاتانە دێت و ئەوەی کە گوێت لێ بوو بە دەنگی بەرز دەڵیٚ"!!**
**ئەوجا رووی کردە دەوروبەرەکەی و گوتی: بچن بۆمی بێنن. ئەبوزەڕیان لە دەرێی کۆشکەکەوە بە راکێش راکێش بۆ لای معاویە هێناو لە بەردەمیا بە پێوەیان راگرت!**
**معاویە: ئەی دژمنی خواو پێغەمبەر! هەموو رۆژێ ئەم وەختانە دێیت و ئەم کارە دووبارە دەکەیەوە! ئەگەر بمتوانیبا بەبێ مۆڵەتی عوسمان یەکێك لە یارانی پێغەمبەر بکوژم، ئەو یەکە تۆ دەبووی. بەڵام بۆ کوشتنی تۆ دەبێ مۆڵەت لە عوسمان وەربگرم.**
**ئەبوزەڕ: من دژمنی خواو پێغەمبەر نیم، تۆو بابت دژمنی خواو پێغەمبەر بوون کە بە رواڵەت موسوڵمان بوون لە ناخا هەر کافرن*.**
***[* طبقات ابن سعد ]***

## دوور خستنەوە

***نە ئاسمانی کەوە سایەی خستووەتە سەر پیاوێکی راستگۆتر لە ئەبوزەڕو***
***نە زەوی لێڵ و تاریک وێنەی ئەوی لە خۆگرتووە.***

***پێغەمبەر ( ٦ )***

ئەبوزەڕ درێـژەی بـە خـەباتی خـۆی دەداو سـات بـە سـات هێرشـەکانی بـۆ سـەر دەوڵەمەنـدان‌و سـەرمایەداران تونـدتر دەکـرد، و نـەی لـە سـەرمایەداری دەکـردو داوای لـە دەوڵەمەنـدان دەکـرد یارمـەتی هـەژاران بـدەن و داوای یەکسـانی‌و بەرانبـەری و دابەشـکردنی سـەروەت و سـەرمایەی بەسـەر هـەموو خەڵکیـدا – وەکـو لـە رۆژگـاری پێغەمبـەرو عومـەرو ئەبوبـەکرا چۆن بـوو– دەکـرد. بانگەشەو بانگەوازی شۆڕشگێڕانەی ئەبوزەڕ کۆشکی کەسکی هێنابووە لەرزەو ئاگری کینەیەکی وای لـە دڵ و سـینەی هـەژاران و بێنـەوایان هەڵگیرسـاند بـوو کـە تـرس و ئەگـەری ئـەوە هـەبوو هـا ئێستا بنەماڵەی بەنی ئومەیـە بسـووتێنێ و دەورودوکـانی چەوسـانەوەو ستەمیان بپێچێتەوە ها نەختێکی تر.

هـەژاران پـەیان بـە مـاڤ لـە دەسـت چـووی خۆیـان بردبـوو ودژی دەوڵەمەنـدان و سـەرمایەداران و کۆیلەفرۆشـان کەوتبوونـە خـەبات. دەوڵەمەنـدان هەسـتیان کـرد شـۆڕش سـات بـە سـات نـزیکتر دەبێتەوە، دەستەو دامێنی معاویە بوون، ولە ترسی خەتەری ئەو بانگەوازو بانگەشانەی کە ئەبو زەڕ، یاری دلاوەرو دینداری پێغەمبەر، هەراسانی کردبوون پـەنایان وەبـەر ئـەو بـرد. سکاڵایان لـە ئەبوزەرش کـرد. معاویـە بـە دووی ئەبوزەڕیا نـارد، لێبڕابـوو کـە کارەکـە یـەك لایـی بکاتـەوەو ئـەم ئاگرەی کـە ئـەو لـە شـام هەڵیگیرسـاندووە هـەموو رۆژێ گـرو بڵێسـەی داوێـنی ئەشـرافانی کـۆن و تازە دەوڵەمەندان دەگرێت، بتەمرێنێ و ئەو شۆڕشەی کە جەرگـەی سـەڵتەنەت و پاشـایەتییەکەی ئـەو دەسـوتێنێ و بناغـەی روحانیەتەکـەی لـەق دەکـات و هیـواو ئاواتـەکانی بـە بـادا دەدات دابمرکێنێتەوە.

ئەب زەڕ، بە باڵای باریك و زراڤیـەوە، لـە حاڵێکا کـە شـوێنەواری عـەزمێکی بتـەوی نـەگۆڕ لەسـەر سیمای گەنمڕەنگیا نـەخش بوو بوو، وەژوورکـەوت، معاویـە بـەرزە پـێ هەسـتاو بـە هەشـتاو لێـی چووە پێشێ‌و بەرێزو حورمەتێکی فرەوە لای خۆیەوە دای نیشاند، ئەوجا خولامانی دەنگ دا کە خواردن بێنن، سفرەی شاهانە راخراو باشترین خۆراکی رەنگاو رەنگیان، کە هەرگیز چاوانی ئەبو زەڕ نـەی دیبـوو، لـە بـەردەمیا دانـا، معاویـە تکـای کـرد کـە نـان بخـوات، ئـەبوزەڕ قـەبوڵی نـەکردو گوتی: "خواردنی من لە زەمـانی پێغەمبـەردا هەفتـەی کێلەیـەك* جـۆ بـوو، و قەسـەم بـە خـوا هـیچ شتێك لەوە زیاد ناکەم تا بە دیداری ئەو نەگەم".

*[* کێلە، نزیکەی کیلۆیەکە].*

ئەوسا روویکردە معاویەو بە کەسەرێکی فرەوە گوتی: "گۆڕاوی!! ئێستا ئێوە جۆتان بۆ دەبێژرێ و جاران وا نەبوو، نان دووجا برژ دەکەن‌و دوو شلە دەخۆن، خواردنتان هەمە جۆر بووە، بەیانی

جلیّ لەبەر دەکەی‌و شەو جلێکی دی، لە کاتێکدا کە لە زەمانی پێغەمبەری خودادا شتی وا نەبوو".

معاویە: ئیدی ئەو رۆژگارە رۆیی، ئێمە ئێستا لە ولآتانی بێگانە داین، وئەگەر لە بەردەمیاندا بە شکۆو شەوکەت رەفتار نەکەین بە سووك و خوارمان دەژمێرن(٧).

ئەبوزەڕ: ئامان! من هەرگیز وەزع و حالّی خۆم ناگۆڕم بەڵکو لەو دنیا لە هەمووتان نزیکتر دەبم لە پێغەمبەری خواوە. من بە خۆم لە پێغەمبەرم بیستووە کە دەیگوت: "لە رۆژی پەسلآندا نزیکترین کەس لە منەوە، کەسێکە کە دنیا تەرك بکات وەکو ئەو رۆژەی کە من ئەوم لە جیهاندا بەجیّ هێشت". و بە زاتی خوا جگە لە من هیچ یەکێك لە ئێوەگەل وانیە.

معاویە: ئەبوزەڕ دەوڵەمەندان سکالآیان لێکردویت و دەڵێن کە تۆ هەژارانیان لیّ دەهاڕوژێنی.

- من لە سەرمایەداریان دوور دەخەمەوە.

معاویە: بۆ؟!

ئەبوزەڕ: چونکە قسەی خوایە کە: ***(ئەو کەسانەی زێڕو زیو کۆ دەکەنەوەو لەرای خودا بەختی ناکەن* تۆ لەو ئازارە بەژانەی تووشی دێن ئاگاداریان کە... سورەتی تەوبە، ئایەتی ٣٤).***

***[* انفاق=بەختکردن (نفق= قوّرت) بەمانای پڕکردنەوەی قۆرتو چاڵ و بۆشاییەو لێرەدا چاڵی کۆمەڵایەتی مانای جیاوازی چینایەتی دەگەیەنیّ].***

معاویە: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەهلی کیتاب* دابەزیوە.

***[* ئەهلی کیتاب: پەیڕەوانی کتێبێن ئاسمانی بەر لە قورئان، جولەکەکان، مەسیحیەکان، زەردەشتیەکان‌و....].***

ئەبوزەڕ: نا، هەم دەربارەی ئێمەیەو هەم درەبارەی ئەوانیشە.

معاویە: من فەرمانت پیّ دەکەم کە دەستبەرداربە.

ئەبوزەڕ: بە زاتی خودا هەر خەڵکی بۆ دینداری و سڵکردنەوە لە سەرمایەداری هاندەدەم و مژدەی عەزابی بەژان بە سەرمایەداران دەدەم.

معاویە: قازانجی تۆ لەمەدایە کە واز لەم کارە بێنی.

ئەبوزەڕ: بە زاتی خودا خەباتی من تا ئەو کاتەی کە سەروەت و سامانان بە یەکسانی بەسەر هەموو خەڵکیدا دابەش دەبیّ هەر بەردەوام دەبیّ.

معاویە بە تۆنێکی هەڕەشە ئامێز گوتی: ئەبوزەڕ! ئەم کارە بەینی من‌وتۆ نایەڵێت، جا ئاگاداربە!

ئەبوزەڕ: (بەخوێنساردی): ***(بێژە: بێژگە ئەوەی خودا بۆی نووسیبێ تووشمان نایە، هەر ئەو سەروەری ئێمەیەو گەرەکە خاوەن باوەڕان هەر خۆ بە خودا بسپێرن. سورەتی تەوبە، ئایەتی ٥١).***

معاویە، ئەبوزەڕی لە کۆشکەکەی وەدەرناو دەستووری دا کەس هاونشینی نەکات. ئەبوزەڕ یەکڕاست روویکردە مزگەوت، دەست نوێژی شت و دانیشت و سەر لە نویّ دەستی بە قورئان خوێندن کردەوە، لەم ماوەیەدا کیژە چکۆڵەکەی لە حاڵێکا کە پەڵاسێکی لەبەر بوو و

سەبەتەیەکی بە دەستەوە گرتبوو، بە گۆنای قۆپاو و رەنگی زەردەوە هات و لەبەردەم ئەبوزەڕدا وەستاو گوتی: باوکە، موڵکداران و سەرمایەداران دەڵێن: ئەم فلسەی تۆ لە دەرامە تت زیادە.

– کچەکەم، دای بنە، بابی تۆ، بە لوتفی خودا، لە سپی و رەش جگە لەو چەند فلسەی نیە.

کیژەکەی ئەبوزەڕ گەڕایەوە، معاویە بە دەست و پێوەندێکی زۆرەوە کە دەوریان گرتبوو، وەژوور کەوت.

جارچی خەڵکی بۆ نوێژی هەینی بانگ کرد، معاویە چووە سەر مینبەرو روو لە خەڵکەکە گوتی: ماڵ ماڵی ئێمەیە، دەسکەوت وتاڵانی، دەسکەوت و تاڵانی ئێمەیە، کێمان بوێ دەیدەینێ و کێمان نەوێ بێ بەشی دەکەین.

پیاوێك لە نێو ئامادەبووانەوە لەبەرانبەریا هەستاو بە دەنگی بەرز، دلێرانە گوتی: هەرگێز! ماڵ بە ماڵی ئێمەیەو دەسکەوت و تاڵانی، دەسکەوت و تاڵانی ئێمەیەو هەر کەسێك بێ بەشمان بکات لێی، لەبەر بارەگای خوادا بە شمشێرەکانمان دادگایی دەکەین.

معاویە سەری داخست و بۆنی قسەکانی ئەبوزەڕی لەو قسانە کردو بە ئەرخایەنی زانی کە ئەم کارە کاری ئەبوزەڕەو جگە لەو کەسی دی هانی نەداوە. ئایا بە توندی رەفتار دەگەڵ ئەم پیاوە گۆساخەدا بکات؟ ئایا وەهای بکوتێ کە بۆ ئاژاوەچیان و تۆڵە ئەستێنان ببێ بە پەندو عیبرەت؟ ئایا زۆرو گوشار لەم پیاوە نابێتە هۆی گەشانەوەو هەڵایسانی ژیلەمۆی ئەم شۆڕشە؟... معاویە ئەم سیاسەتوانە بە هۆش و زیرەکە، بیری کردەوەو زانی کە باشترین چارەسەر، رواڵەتبازی و نەرمی و ئاقڵی و خەڵك فریودانە.

پاش ئەوەی نوێژ کۆتایی هات، یەکێکی بە شوێن ئەو موسوڵمانە ئەبوزەڕییەدا ناردو بە خەڵکەکەی گوت: ئەم پیاوە منی زندوو کردەوە، خوا دەست بە باڵییەوە بگرێ، لە پێغەمبەری خوام بیستووە کە دەیفەرموو: "لە دوای من بەرپرسانێك دێن کە کەس زاتی ئەوەی نابێ لە روویان بوەستێ، ئەمانە وەکو مەیموون بە هەشتاو خۆیان بە ئاگرا دەدەن"!

نوێژی هەینی تەواو بوو، معاویە بۆ کۆشکەکەی خۆی زڤڕییەوە، لە داخ و تورەییدا ددانەکانی لێکدی دەسوو، دەی نەڕاندو هەڕەشەی دەکرد، چەند کەسێك لە خوێشانی خۆیان بە ژوورەکەیدا کردو سەیریان لێهات، یەکێکیان پرسی: چییە؟

– ئەبوزەڕ کۆڵەی کوتاوم، بە زاتی خوا فریای نەکەوین خەڵکیمان لێ هار دەکات.

– وەڵڵاهی من لە دەستیت رزگار دەکەم.

– زۆر هیچ کارێکی تێ ناکات.

– بە چیا دیارە؟

ئەو پیاوە بە هەشتاو بەرەو ماڵی ئەبوزەڕ رۆیی، بە توندی و لەزێکی ترسناکەوە لە دەرگای دا، دەرکە کرایەوە، ئەبوزەڕ چاوی پێی کەوت و نەیناسی، بەڵام شوێنەواری شەڕی لە روویا خوێندەوەو گوتی: خێرە!

– نە ئەبوزەڕ! شەڕە ئەگەر دەست لە دژایەتی معاویە و هاندانی خەڵکی لە معاویە هەڵنەگری، ئیدی لەمڕۆوە جارەکی دی بەسەر زەویدا ناڕۆی.

– من نه له مەرگ دەترسمو نه باکم پێی هەیه.

– ئەبوزەڕ! دەست لەم کاره هەڵگرەو معاویه توڕه مەکه، مەسڵحەتی خۆته!

– توڕه کردنی معاویه بۆ من باشتره له توڕه کردنی خودا.

– خۆت مەخه تالوکەوه، دڵی خەڵکیمان لێ پڕ مەکەو دەست لەم بانگەوازەت هەڵگره.

– به زاتی خوا تا سەروەتو سامان بەسەر جەماوەری خەڵکدا دابەش نەکرێ دەستبەردار نابم.

– بەخوا دەزانین تۆ شێوەن بۆ کێ دەکەی، وەڵلاهی ئەگەر دەستبەردار نەبی، شەلاقی عەزابت تیا دەخەینه کار.

– به خودا تا نەگەڕێنەوه سەر کتێبی خوا دەست له خەبات هەڵناگرم.

کابرا سەری داخستو ناچار بێدەنگ بوو، چی لەم ئەبوزەڕه بکات؟ هەڕەشه بچووکترین کاریگەریی نیه، تەماحی بخاته بەر، لەوەیه ئەم پیاوەی که به هەڕەشه نایەته ڕەدا، لەم ڕێگەیەوه بگیرێت.

– ئەی ئەبوزەڕ، هەی دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات، عەلی نەدەتوانێ قازانجێکت پێ بگەیەنێو نه زیانێکت لێ دووربخاتەوه، بەڵام معاویه که سەروەتو سامانەکەی دەڵێی دەریای به پێلو شەپۆلانه، لەخزمەتی تۆدایه.

– من پێویستم به سەروەتی ئەنگۆ نیەو جگه له ڕەزامەندی پەروەردگارمو ئەوەی لەلای ئەوه هیچ تەماحێکی ترم نیه.

– ئیدی من پێم گوتیت، تۆ بەپێی خۆت بۆ قەتڵگه دەڕۆیت.

– بۆ من مردن لەم ژینه چاتره.

شەپۆڵی تەنگانەو بەلا له هەموو لایەکەوه ئەبوزەڕی گەمارۆدا بووو پەیتا پەیتا ئازارو عەزابی بەنی ئومەیەی پێ دەگەیی، مووچەکەیان بڕی بووگوشاری دامودەزگای ئومەویان ڕۆژ بەڕۆژ پتر دەبوو، بەڵام ئەبوزەڕ نەك بۆ ساتێك له خەبات خاو نەبووەوەو بێ توانایی نیشان نەداو بۆران و تۆفانی ڕووداوو واریقاتی ڕۆژگار نەیلەرزاند، بەڵکو خەباتی خۆی دژی دەوڵەمەندان توندتر کردو به ئاشکرا جنێوی به معاویه دەداو چەکی ئاینی له جەنگی حکومەتی عوسمان دەردەهێناو پەردەی دینداری له ڕوویان هەڵدەماڵی. ڕۆژێك له بەردەم خەڵکیدا وەستاو گوتی:

– بەنی ئومەیه هەڕەشەی هەژارکردنو کوشتنم لێ دەکەن، من هەژاریم له دەوڵەمەندی پێ خۆشترەو له ژێر خاکا باشتر دەنووم تا له سەر خاك. ئەی چینی دەوڵەمەندان سەروەتی خودا بۆ بەندەکانی خودا بگێڕنەوەو نەڵێن دەستی خودا بەستراوەو خودا هەژارەو ئێمه دەوڵەمەند:

***(ئەو داراییو منالأنەی هەتانن، مایەی ئەزموونن. پاداشتێ که لای خودایه، ئەو هێژایه. دەبێ له خودا بترسن تا دەتوانن، گوێ ڕادێرو به فەرمان بن، ماڵ له ڕای خودا ببەخشن، بۆتان چاکەو، ئەو کەسانەی له ڕژدی خۆ دەپارێزن، ئەوانه ڕزگارەکانن، ئەگەر وامێ ڕەوا به خودا ببینن، چەند قات پێتان ئەداتەوەو له گوناهانوو خۆش دەبێ. هەر خودا بۆ شوکر دەبێو لەسەر خۆیه. له پەنامەکیو خۆیایان ئاگاداره، به دەسەلأتو کارزانه. سورەتی تەغابون، ئایەتێن ١٤–١٨).***

ئەو ڕۆژە ئەبوزەڕ درێژەی بە هێرشی خۆ دژی سەرمایەداران داو داوای لێکردن سەروەتی خۆ بەسەر جەماوەری خەڵکیدا، بەسەر ڕەمەکی مەرم دا دابەش بکەن، تا بوو بە شەوو بەرەو ماڵی خۆی وەرێ کەوت، لە ڕێگە بیری هاتەوە کە کیژە نەخۆشەکەی لەماڵەوە بەجێ هێشتووەو نەخۆشییەکەی کوشندەیەو ئەو لە بەیانییەوە تا نهو خەریکی بانگەشەو خەباتی خۆی بووەو ئەم کچۆڵەیەی فەرامۆش کردووە، لەناکاو هەستیکرد لە ناخی دڵییەوە دەنگێك ڕابووەو بەردەوام ئەم ئایەتەی بەگوێدا دەدا: *(ئەو دارایی و منالآنەی هەتانن، مایەی ئەزموونن... ئەو دارایی و منالآنەی هەتانن، مایەی ئەزموونن)..*

ئەم بانگەوازە ئارامە پەیتا پەیتا بەرزتر دەبوو تا گەییە سەر زمانی و لە گوێیدا دەنگی دایەوەو بە باشی گوێی لێ بوو. ئەبوزەڕ سەری کز کردبووو چوو بووە ژێری تا گەییەوە ماڵی خۆی، بە هەشتاو وەژوورکەوت، کیژەکەی بینی کە لەجێدا کەوتووەو پارچەیەك سەراپای پۆشیوە، دایکی بە دیارییەوە کڕوکپ دانیشتووەو خەمی جگەر سووتان نیشتووەتە سەر چارەی، و چاوانی، تەژی رونـدك کردووە، کە هاوسەرەکەی بینی گریی ئەو خەمەی ئەوکی گرتبوو کرایەوەو هاوارێکی کردو لە هۆڕژنی گریانی داو ئەشك وەکو باران لە هەردوو چاوییەوە داباری، ئەبوزەڕ بەدەم هزرینەوە سەری داخستو چاوی توند نوقاندو لە بن لێوانەوەو بە ئەسپایی گوتی: "ئێمە هی خواینو بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە."

ئەوجا لە سوچێکا ڕۆنیشتو سەری داخست، بێدەنگیەکی خەمناك باڵی بەسەر ماڵەکە دا کێشا بوو. ئەبوزەڕ کەوتە یادی ئەو ڕۆژەی کە بەر لە ئیسلام بوونی قورەیش، دەگەڵ پێغەمبەرا لە مەدینە بوو و بەرە بەیانێك لە شەبەیخونێکدا کە ڕێگرانی قوڕەیش کردیانە سەر مەدینە، کوڕەکەیان کوشتو هەڵاتنو پێغەمبەری خۆشەویستی دڵی دەدایەوە، ئەوجا لەبن لێوانەوە گوتی: "هێزو توانا هەر بۆ خوایە، بۆ مەرگ لە دایك دەبن و بۆ وێرانی ئاوەدان دەکەن".

ئەبوزەڕ سەر لە نوێ دەستی بە هێرشە توندەکانی خۆی کردەوە، مژدەی ئەزابێکی بە ژانی بە سەرمایەداران دەداو دام ودەزگای دەسەڵاتی معاویەی لەق کردبوو. معاویە بیری لە چارەیەك دەکردەوە کە چۆن خۆی لە و بخەلەسێنیو بە چ ڕێگەیەك ئەم ئاژاوەگێڕە ترسناکە لە نێو ببات؟ ئەنجام وای بە بیرا هات کە ئەم پیاوە، کە زۆر بە توندی دژی سەرمایەداران و زێڕ کۆکەرەوان دەخەبتیو هێرش دەکاتە سەر سەرمایەداران و زێڕ کۆکەرەوان، لەکەدار بکاتو ئەگەر بتوانێ بۆ خەڵکەکەی بسەلمێنێ کە ئەم پیاوە بە خۆی زێڕو زیوی کۆکردووتەوە، چونکە تەقواو پارسایی تاقە چەکی موجاهیدەو بوختانو تۆمەت تاقە چەکی ریاکارو رووبین و مونافیقە، چۆن ئەمە پراکتیزە بکات؟ معاویە بیری کردەوە تا ڕێیەك هەڵبژێرێ، کارێکی گرینگ بۆ دامو دەزگای بەنی ئومەیە هاتبووە پێشێو خەتەرێکی گەورە هەڕەشەی لە چینی حوکمڕان دەکرد، معاویە لە بەردە ئەستێی بیرکردنەوەی خۆی دەدا بەڵکو تروسکەیەکی لێ هەستێ و ئەو دەوروبەرەی کە بانگەشەکانی ئەبوزەڕ لێی تاریك کردبوو، رووناك بکاتەوە، لە ئەنجامدا ڕێگەیەکی ئەرخایەنی دۆزییەوەو وای دەزانی کە بە و زووانە بە ئاواتی خۆی دەگات، قەراری خۆی دا، یەکێك لە پێشخزمەتەکانی گازکردو هەزار دیناری دایەو بە ناو جەرگەی شەودا بۆ لای ئەبو زەڕی نارد،

ئەو شەوە بوری و بەیانی پاش ئەوەی معاویە نوێژی تەواو کرد، قاسیدەکەی گازکردو گوتی: "بڕۆ بۆ لای ئەبوزەڕ، پێی بڵێ کە معاویە ئەوەندەی دارکاری کردووم کە ئازای لەشم زامە، چونکە دوێ شەو منی بۆ لای کەسێکی تر ناردبوو و من بە هەڵە پارەکانم بۆ تۆ هێنا بوو" قاسید رۆیی، ئەبوزەڕی بینی و قسەکانی معاویەی وەکو خۆی بۆ گێڕایەوە. ئەبوزەڕ گوتی: "کوڕی من! پێی بڵێ، قەسەم بە خوا تاقە دینارێك لەو پارەیەی تۆ، ئەو شەوە لای من رۆژی نەکردۆتەوە، سێ رۆژم مۆڵەت بدە تا کۆی بکەمەوە". معاویە زانی ئەبوزەڕ کە هەزار دینارەکەی وەرگرتووە یەکسەر بەسەر هەژارانیا دابەش کردووەو تەنانەت بۆ تاقە شەوێکیش لای خۆی هەڵی نەگرتووە، ئیدی دڵنیا بوو کە ئەو هەرچییەك دەڵێت و دەکات، بێ سوودەو نیشان ناپێکێ.

معاویە ویستی بە نەرمی دەگەڵ ئەبوزەڕدا رەفتار بکات، فایدەی نەبوو، ویستی زۆر بەکار بێنێ سەری نەگرت، ویستی بە پارە بیکڕێ نەیتوانی و هیچ چارەیەکی نەما ئەمە نەبێ کە لە شام وەدەری بنێت. بۆ عوسمانی نووسی: "ئەبوزەڕ لەگەڵ خەڵکانێکدا کۆدەبێتەوە کە تەنگی بە من هەڵچنیوەو کارەکانی لێ قورس کردووم، من دەترسم کە ئەوانە لە تۆ هان بدات، جا ئەگەر پێویستیت بە خەڵکی شام هەیە، ئەو لێرە دوور بخەوە".

عوسمان وەڵامی دایەوە: "شۆڕش ددانی خۆی دەرخستووەو چی وای نەماوە کە بڵێسە بسەنێ، تۆ سەری ئەم زامە مەکەوە، ئەبوزەڕ سواری چەموشترین وڵاخ بکەو بە کەسێکا کە بە توندی رەفتاری دەگەڵدا بکات، بۆ لای منی بنێرەو جڵەوی خەڵکەکە بگرە، بە خۆتیش تا دەتوانی بە سەبرو خوێنسارد بە، ئەگەر هەقت بەسەر خەڵکییەوە نەبێ ئەوانیش کاریان بە کاری تۆ نابێ".

نامەی میری باوەڕداران! عوسمان، بە معاویە گەیی، خەڵکی بە دوور خستنەوەی ئەبوزەڕیان زانی، هەژاران و بێنەوایان بە دوورکەوتنەوەی پێشەوای خۆشەویست و ئەمەکداریان زۆر خەمبار بوون و بە چاوانی تەژی روندکەوە ئەڵقەیان لە دەور بەست. ئەمانە لە ترسی دام و دەزگای معاویە پەنایان وەبەر ئەم پەناگە مکوم و بەرەنگارە دلێرو داوێن پاکەی خۆیان هێنا بوو، لێ ئەمێستا هەست دەکەن کە ئەبوزەڕ دەڕوات و ئەوان بە یەخسیری لەبەر دەستی کۆشك نشینانی سەوزدا بەجێدێڵێ، ویستیان رێ لە رۆییشتنی ئەو بگرن. ئەبوزەڕ نیگای تەژی خۆشەویستی خۆی بڕییە ئەوان و گوتی:

- "خەڵکینە! من ئامۆژگارییەکی بە سوودتان دەکەم، من خوازیاری ئاژاوەو رووبینی نیم، خەڵکینە! سوپاسی خودا بکەن (خەڵکەکە بە گوێدێری و ملکەچی: سوپاس بۆ تۆ خودایا)، شایەتی دەدەم خوا یەکەو نابێ بە دوو و محەمەد بەندەو پەیامبەری ئەوە (خەڵکەکە لەگەڵیا وتیانەوە). خەڵکینە! من گەواهی دەدەم کە پەسڵان راستە، بەهەشت راستە، دۆزەخ راستە، دۆزەخ راستە، هەر چیەك لەلای خواوە بێت دانی پێدا دەنەم، ئێوە هەمووتان بە شایەت بن (ئامادەبووان، شایەدین*) هەر کەسێك بەم باوەڕەوە بمرێ، مادامێکی یاری گوناحکارو یاوەری ستەمکار نەبێت مژدەی لێ بێ کە بەر رەحمەتی خواو پێغەمبەر دەکەوێ. خەڵکینە! هەر کاتێ خیانەتیان کرد، ئێوە وەکو چۆن *[* ئەم قسانە، بانگەشەکانی دام و دەزگا دژی ئەبوزەڕ نیشان دەدات]*

نوێـژ دەکـەن و ڕۆژوو دەگـرن تـوڕەبن! نەکـەن بـە تـوڕە کردنـی خـودا، ڕەزامەنـدی سـەران و فەرمانڕەوایان و ئەنجوومەنی دەسەڵاتداران بە دەست بێنن، ئەگەر خیانەتێکیان کرد لێیان دوور بکەونەوە، ئەگەر ئەشکەنجەو دوورخستنەوەشتان بێتە ڕێ، تا خودا ڕازی بکەن، خودا باڵاترو مەزنترو شایستە ترە، ڕەوا نیە لەبەر خاتری ڕەزامەندی بەندە، خودا برەنجێ و توڕە بێ.."

ئەبوزەڕیان سواری وشترێك کرد، کە پاڵانێکی داریـنی ڕەقـی بەسـەرەوە بـوو و پێـنج کۆیلـەی دڕندەو ترسناکی ئەوروپایی نەژادی (سیسیل)یان بەگەڵ خست کە بیبەن. ئەمانە بە گوێرەی دەستووری معاویە زۆر بە خێرایی دەیانبرد و نەیاندەهێشت لە ڕێگەی شام و مەدینەدا کەمێك ئیسراحەت بکات، تا ڕانەکانی پێستیان هەڵداو مردنی بە چاو دەبینی. خەمێکی توند دای گرتبوو، ڕەفتاری زبری ئەم سپی پێستانە، ڕەنج و ئەزابی ئەم سەفەرەو لە هەموو ئەمانەش خراتر ئەو شەپۆلی گەندەڵییەی کە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا هەستا بوو و هەموو ئەو هێم و بنەما بتەوو قایمانەی کە محەمەد سەبارەت بە یەکسانی و برایەتی دای ڕشتبوو، ریشەکێش دەکرد، هەموو ئەمانە یەکیان گرتبوو و ئەبوزەڕیان خەمبارو نا ئومێد دەکرد. پیرە وشتر وەکو کەشتی بەلەز بیابانی دەبڕی و ئەبوزەڕ، خاموش و هزربار، شوێنەواری خەم و ماندوویەتی زۆر بە ڕوویەوە دیار بوو، هەستی کرد کە ئەم هەموو دژواری و نارەحەتیە بۆیە دەبینێ چونکە پەیڕەوی دەقی کتێبی خودا دەکات و خەڵکی بۆ چاکە هاندەدا، ئەوجا ئەوەی وەبیر هێنایەوە کە ڕۆژێك لە مەدینەدا دەگەڵ پێغەمبەردا ڕێیان دەکرد پێغەمبەر پێی گوت: "لە دوای من زوو بە زوو بەڵایەکت بەسەر دێ". و لێی پرسی: "لە ڕای خودایا؟" و وەڵامی دایەوە: "لە ڕای خودایا" و گوتی: "ڕازیم بە ڕەزای خوا" دڵی پڕ بوو لە دڵنیایی و خۆڕاگری و ئەو هەورە توندو تاریکەی خەم و نا ئومێدیەی کە نیشتبووە سەر ڕووی لاکەوت و ئاسودەیی ڕوحی داگرت و لە پڕێکا هەستی کرد توانایەکی زیاتری بەرگەگرتنی ڕەنج و ئەزابی ئەو ڕێگایەی کە گرتبوویە بەر، لەلا پەیدا بوو.

ئەبوزەڕیان، بێ ئەوەی دەقیقەیەك مۆڵەتی بدەن، بەلەز دەبرد، ئەویش هەموو ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەی کە دەی بینی لە ڕوحی پڕ شکۆی خۆیدا دەیسڕییەوە، دڵی بەخودا سپارد بوو، بیری لەو خەباتەی دەکردەوە کە دژی دەزگای ئەشرافی عوسمان و کۆشکی کەسکی معاویە، گرتبوویە بەر، بیری لەوە دەکردەوە کە چینێك سەرمایەیەکی یەکجار مۆڵیان کۆکردبووەو چینێکیش لە هەر بەهرەو سوودێکی ژیان بێ بەش کراون، بیری لە ئایندەی ترسناکی ئیسلام، لە مەحرومیەتی بنەماڵەی محەمەد، لە پایەماڵ کردنی هەقی عەلی و چارەنووسی تاڵی خۆی دەکردەوە. سیمای خۆشەویستی محەمەدی لە کلکەی ئاسۆدا دەبینی کە لە نێو هەورێن خەمینەوە، بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە ڕەزامەندییەوە لەو دەڕوانێ. ئەم هزرانە بە جۆرێ ئەبوزەڕیان مژول کرد بوو کە نە هەستی بە توندو تیژی ئەم کێویانەو نە بە ئازاری دامو دەزگای گەندەڵی عوسمان و معاویە نەدەکرد، یادی محەمەدو زیندوو کردنەوەی ئەو یادگارە شیرینانەی کە لەگەڵ ئەم دۆست و ڕابەرە ئازیزەیدا هەی بوو برین و ژانی گیان و جەستەی بێ توانای سارێژ کرد.

تەنگی ئێوارە بوو، مەدینە لە دوورەوە بەدیار کەوت، سەدای شادیبەخشی گیانپەروەری بانگی ئێوارە ئەبوزەڕی وە ئاگاهێنایەوە، لە بناری کێوی سەلع دا، کۆمەڵێکی بینی کە لە دەوری یەکدی دانیشتوون، لە دوورەوە چەند جارێك هاواری کرد:

"مژدە بەخەڵکی مەدینە بدەن کە پەشێوی و پاشاگەردانیەکی گەورەو جەنگێکی مێژوویی بەڕێوەیە!"

سوار لە بناری کێوەکە نزیك بووەوە.

عوسمان و عەلی و چەند کەسێکی دی.

عوسمان: خودا هیچ چاوێك بە دیداری تۆ روون نەکات ئەی جوندوبۆك!

*[* جوندوبۆك: سوکەڵەناوی جەندەبەو بۆ تەوهین بەکار هاتووە.]*

ئەبوزەڕ: من جەندەبۆکم، بەڵام پێغەمبەری خوا ناوی نام عەبدوڵڵا، من ئەو ناوەی کە پێغەمبەر بۆی هەڵبژاردم، بەسەر ناوەکەی خۆمدا پەسند دەدەم.

عوسمان: بۆچی خەڵکی شام ئەمەندە لە نێشی زمانت بە گلەیین؟

ئەبوزەڕ: چونکە سەروەت و سامانیان خڕەکردەوەو منیش مژدەی داغی ئاگرینم دەدانێ.

عوسمان: تۆ لات وایە ئێمە دەڵێین دەستی خوا بەستراوەو خودا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین؟

ئەبوزەڕ: ئەگەر وا وێنا ناکەی، سەروەتی خودا بەسەر بەندەکانی خودادا دابەش بکەن، تۆم ئامۆژگاری کرد بەخاینت لە قەڵەم دام، هاوڕێکەتم ئاموچیاری کرد بە خاینی ژماردم!

عوسمان: درۆ دەکەی، تۆ شۆڕش و ئاژاوەت گەرەکە، تۆ شامت لێ وروژاندوین

ئەبوزەڕ: چاو لە رژێمی دوو هاورێکەی ترت بکە با کەس کاری بە کاری تۆوە نەبێ.

عوسمان: تۆ هەقت بەم کارانەوە چیە؟ بێ دایك!

ئەبوزەڕ: بەزاتی خودا جگە لە ئەمر بەچاکەو نەی لەخراپە ناتوانی هیچ بیانوویەکی ترم لێ بگری.

عوسمان تووڕە بووو هاواری کرد: پێم بڵێن من چی لەم پیرمێردە درۆزنە بکەم؟ لێی بدەم؟ بیکوژم؟ یەکێتیی موسوڵمانانی شێواندووە، لە مەملەکەتی ئیسلام وەدەری بنەم؟...

عەلی: من قسەکەی پیاوە باوەڕدارەکەی ئال فیرعەون بە تۆ دەڵێمەوە:

***".. ئەگەر دەڵێن: درۆ دەکا، وەباڵی درۆی بە ئەستۆی خۆی. ئەگەریش قسەی راست دەکا، لەوانەی ئەو پێتان دەڵێ، هێندێکیانوو هەر بەسەر دێ، چونکە خودا مرۆی لە ڕادە لادەری درۆزن شارەزا ناکا. سورەتی غافیر، بەشێك لە ئایەتی ٢٨"***

عوسمان بە درشتی وەڵامی عەلی دایەوەو ئەبوزەڕی بەوە تاوانبارکرد کە دەگەڵ عەلی دا هاودەستە. عەلی لە و توندترو زبرتر بەرسڤی دایەوەو لێیان بوو بە گەنگەشەو دەمەقاڵێ، خەڵکی کەوتنە بەینەوەو هەردووکیانیان هێور کردەوە. عوسمان لە ئەخیرا گوتی: من هاونشینی و گفتوگۆی خەڵکی لەگەڵ ئەبوزەڕا قەدەغە دەکەم. ئەبوزەڕ لەلای عوسمان رۆیی، خەڵکەکە بە پێچەوانەی دەستورەکەی ئەوەوە بە جۆرێك لە دەوری خڕ بوونەوە دەتگوت تا ئەو رۆژە نەیان

دیتبوو، بە تاسەوە گوێیان بۆ قسەکانی ئەو رادەدێرا، عوسمان دەستوری دا بوو چ کەسێك داوای فتوای لێ نەکات، بەڵام فتواکانی ئەبوزەڕ لێکدا لێکدا بڵاو دەبوونەوە.
رۆژێك لە مزگەوتا دانیشتبوو، پیاوێك هاتو لێ پرسی: کار بە دەستانی باجی عوسمان، باجیان زیاد کردووە، ئایا بۆ ئەوەی باجی زیاد نەدەین، هەندێ لە ماڵو سامانەکانمان بشارینەوە؟
- "نە، ماڵەکەت بخە بەردەستو بڵێ ئەوەی هەقە بیبەنو ئەوەی هەق نیە وازی لێ بێنن،و ئەگەر بێ ئینسافیان دەربارەت کرد، لە قیامەتدا بۆت دەنووسرێت. "لەم بەینەدا لاوێکی قورەیشی گوتی: ئەی ئەبوزەڕ! مەگەر میری باوەڕداران تۆی لە فتوادان قەدەغە نەکردووە؟
- چما تۆ خەفیێو شۆفاری؟ قەسەم بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە، ئەگەر شمشێر بخەنە سەر ئێرە (ئاماژە بۆ گەردنی دەکات)و پێم وابێ ئەو قسەیەی کە لە محەمەدم بیستووە دەتوانم بیڵێم، بەر لەوەی سەرم ژێکەنەوە ئەو قسەیە هەر دەکەم. ئەبوزەڕ سەر لە نوێ دەستی بەبانگەشەو بانگەوازی خۆی کردەوەو هێرشەکانی بۆ سەر دەوڵەمەندانو کۆیلەداران توندتر کرد،و خەڵکی بۆ یەکسانیو لابردنی جیاوازی چینایەتیو دابەش کردنی سەروەت سامانان بەسەر خەڵکیدا، هان دەدا. عوسمان دەستوری دا کە خۆی لە خوێندنی ئەو ئایەتو فەرموودانەی کە هەژاران لە دەوڵەمەندان هان دەدا، بپارێزی، لێ ئەبوزەڕ گوێی نەدایێو بە هەمان نەفەسەوە لە پێناوی ئازادی کۆیلانو یەکسانیو دابەشکردنی سەروەتدا، هێرشی دەکردە سەر دامو دەزگاکەی عوسمان. رۆژێ عوسمان بیستی کە ئاپۆڕایەکی زۆری لە دەور خڕبووەتەوەو ئەویش زۆر بە توندی هانیان دەدا، بەدوایا نارد، ئەبوزەڕ هاتو کەعبول ئەحبارو ژمارەیەکی تری لەوێندەر بینی. عوسمان گوتی:
- ئەی ئەبوزەڕ! کەی دەست لەم کارەت هەڵدەگری؟
ئەبوزەڕ: هەر کاتێ دادی هەژاران لە سەرمایەداران وەربگیرێ. عوسمان (روو لە ئامادە بووان):
بەڕای ئێوە کەسێك کە زەکاتی ماڵەکەی دەرکرد، ئیدی هەقی کەسی تری بەسەرەوە دەمێنێ؟
کەعبول ئەحبار: نەخێر میری باوەڕداران! کە زەکاتی ماڵەکەی دا، ئەگەر خانوویەك دروست بکات کە خشتێکی لە زێڕو یەکێکی لە زیو بێ، هیچ حەقێکی لەسەر نیە. ئەبوزەڕ دار عاساکەی بە سینگی کەعبدا کێشاو گوتی: درۆ دەکەی ئەی جولەکە زادە! ئەوجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:
***(کاری چاك هەر ئەوە نیە روو دە رۆژهەڵاتێ بکەن یان رۆژاوا. چاك ئەمەیە باوەڕیتان بە خواو رۆژی سەڵایەو فریشتانو کتێبو پێغەمبەرانی خودا هەبێو لەو سامانەی-هەرچەند زۆریشو خۆش دەوێ- بەشێ بدەن بە خزمانو هەتیوانو هەژارانو ڕێونگانو پارسەکانو عەبدانی پێ بکڕنەوەو نوێژ بکەنو زەکات بدەن، هەرگاش پەیمانێك دەبەستن نەی شکێنن، لە نەداریو گرفتاریو تەنگانەدا خۆڕاگر بن .مرۆی بە ڕاستی ئەوانەنو دیارە لە خوا دەترسن. سورەتی بەقەرە. ئایەتی ١٧٧).***
نابینی جیاوازی لە نێوان زەکات دانو دانی ماڵ بە خزمان، هەتیوان، هەژارانو کۆیلان داناوەو ئەمانەی پێش زەکات خستووە؟ نابینی کە نەی لە ماڵ کۆکردنەوە کردووەو ئەمری بە بەخت کردن لە ڕێی خێرو چاکەدا کردووە؟

عوسمان: ئاخر ئەبوزەڕ! ناكرێ بە تۆبزی خەڵكی ناچار بە تەقواو پارسایی بكرێن، ئەركی من ئەوەیە كە بەپێی یاسای خوایی كار بكەمو خەڵكی بۆ میانڕەوی هان بدەم.
ئەبوزەڕ: ئێمە لەگەڵ دەوڵەمەندانـدا نامـانكرێ تـا نەكەونـە خێـرو چاكە، تـا دەگـەڵ دراوسـێ‌و برایانیاندا نەكەونە چاكەكاری‌و تا سیلەی رەحم بەجێ نەیەنن.
كەعب: كەسێك كە زەكاتی ماڵەكەی دا ئیدی هیچی لەسەر نیە.
ئەبوزەڕ: دیسـان داری عەساكەی كێشـا بـە سـینگی كەعبـداو بـە تونـدی گـوتی: "ئەگـەر پیاوێك سەروەتی خەڵكی داگیر بكات‌و بە نە هەق حەقیان ببـات‌و هـەنگێ زەكاتەكـەی دەربكـات، تـۆ ئـەوە بە موسڵمانێك دەزانی كە ئەركەكانی خۆی بەجێ هێناوە؟" ئەمەی گوت‌و بەتوڕەیی وەدەركەوت:
عوسمان بۆ ئەوەی دڵی بداتەوە خۆڵامێكی بە دوو سەد دینارەوە بۆلای ناردو گوتی: بـە ئەبوزەڕ بڵێ ئەم دوو سەد دینارە وەربگرەو بیدە بە لایەنگرەكانی خۆت.
ئەبوزەڕ: ئایا عوسمان ئەمەندەی بە هەموو موسوڵمانێك داوە؟
خولام: نەخێر.
ئـەبوزەڕ: جـا منـیش نەفـەرێكم لـە موسـوڵمانان، چـەند بـەر مـن بكـەوێ ئەوەنـدەش بـەر ئـەوان دەكەوێ.
خولام: عوسمان گوتی ئەم پارەیە هی خۆمەو بە زاتی خوا هیچ پارەیەكی حەرامی تێكەڵ نەبووە، منم پارەیەك حەلاڵ نەبێ بۆ تۆی نانێرم.
ئەبوزەڕ: پێویستم پێی نیە، من ئەمڕۆكە دەوڵەمەندترین كەسم.
خولام: خوا عافوت كا، ئێمە لە ماڵی تۆدا لە كەم و زۆر هیچ شتێك نابینین؟!
ئەبوزەڕ: ئەم سەبەتەیە كولێرەیەكی جۆی لە ژێر دایەو چەند رۆژ ماوەتەوە، ئیدی مـن بـەم پارانـە چی بكەم؟ بیگێڕەوە!
عوسمـان چـەندین كـەرەت ئـەم كـارەی دووبـارە كـردەوەو هـیچ فایدەیـەكی نـەبوو، رۆژێـك سـەد دینـاری بـە كۆیلەیەكدا بـۆ نـاردو گـوتی: ئەگـەر ئـەبوزەڕ ئـەم پارەیـەی لـێ وەرگرتـی ئـیتر تـۆ بـڕۆ ئازادی! خولامەكە پارەكەی بۆ ئەبوزەڕ هێنا، قەبوڵی نەكرد، خولامەكە وتی: رەحمەتی خـوات لـێ بێ، ئەم پارەیە وەربگرە چونكە ئازادی من بەندە بە وەرگرتنی ئەم پارەیەوە.
ئەبوزەڕ: كۆیلایەتی منیش بەندە بە وەرگرتنییەوە.

*　　　　*　　　　*

رۆژێ میراتەكـەی عەبـدورەحمانی كـوڕی عۆفیـان هێنایـە لای عوسمـان و لـە بـەردەمیا كەڵەكـەیان كرد. ئەوەندە زۆر بوو كە لەمپەرو دیـوارێكی بـەرزی لـە بـەینی عوسمـان‌و ئـەو پیـاوەدا كـە وەسـتا بوو دروست كرد(٨) عوسمـان گـوتی: ئومێدەوارم خـوا خێـر بێنێتـە رێـی عەبدورەحمان، چونكە سەدەقەی دەكرد، میوانداری دەكردو ئێستاش ئەمەی كە دەی بینن بەجێهێشتووە.
كەعب: راست دەفەرمووی ئەی میری باوەڕداران، حـەلاڵی بەدەسـت هێنـان و حـەلاڵی خـەرج كـردو حەلاڵی بە جێ هێشتووە، خوا خێری دنیاو پەسلانی پێ داوە.

ئەبوزەڕ ئەو واریقاتەی بیستەوە، بە توڕەیی لە ماڵ وەدەرکەوت، کۆڵانەکان بە دووی کەعەب دا دەگەڕا، چوون شێرێکی توڕە، لە ڕێگەدا لولاقی وشترێکی دۆزییەوە، هەڵیگرت و کەوتە سۆراغی کەعەب، سەراپای لە ئاگری توڕەییدا دەسوزا، کەعەب بیستیەوە ئەبوزەڕ بە دوایدا دەگەڕێ، لە ترساندا خۆی گەیاندە عوسمان، ئەبوزەڕیش دوا بە دوای ئەو خۆی بە ژوورا کرد. کەعەب هەر کە چاوی بە ئەبوزەڕ کەوت، هەستاو خۆی دایە پشتی عوسمان، ئەبوزەڕ لولاقە وشترەکەی بەرز کردەوەو بە جۆرێ بۆ کەعەبی داهێنایەوە کە سەری شکاندو خوێن فیچقەی کرد، ئەوجا هاوای کرد:

– ئەی جولەکە زادە! تۆ بە کابرایەك کە مردووەو ئەم هەموو سەروەتەی لە پاش خۆی بەجێ هێشتووە دەڵێی خودا خێری دنیاو قیامەتی داوەتێ؟ تۆ ڕێ بە خودا نیشان دەدەی؟!

پێغەمبەر ڕۆژێ بەرەو ئوحد دەڕۆیی، من لەگەڵی بووم، گوتی: "ئەی ئەبوزەڕ" گوتم: "بەڵێ پێغەمبەری خودا"، گوتی: "سەرمایەداران لەو دنیا هەژارن" پاشان گوتی: "ئەبوزەڕ!" گوتم: "بەڵێ پەیامبەری خودا داك و بابم بینە قوربانت". گوتی: "گەر بە ئەندازەی کێوی ئوحد سەروەت لە ڕای خودادا بەخت بکەم حەز ناکەم، کە مردم بە ئەندازەی دوو قیراتم لێ بمێنێتەوە*" گوتم: *[*قیرات: پاژێك لە سی و شەش پاژی مسقال].* "ئەی پەیامبەری خوا دوو قنتار*؟" گوتی: "نە، دوو قیرات!" *[* قنتار سەد مسقال].*

ئەوجا گوتی: "ئەی ئەبوزەڕ تۆ زۆرت گەرەکەو من کەم". پەیامبەری خوا واهی دەوێ و تۆش ئەی یەهودی زادە دەڵێی ئەوەی عەبدورەحمانی کوڕی عۆف بەجێی هێشتووە حەڵاڵە؟ پێم بێژە عەبدورەحمان ئەم ماڵەی لە کوێ هێناوە؟ خودا لە ئاسمانەوە بۆی ناردووە؟ یان لە ماڤ ئەم خەڵکەو بەری ڕەنجی میللەتی کۆکردووەتەوە؟ قەسەم بە خودا خاوەنی ئەم سامانە ڕۆژی پەسلانێ خۆزیا دەخوازێ کە بریا ئەم داراییانە دووپشك بوایەن و بە بەندی دڵی ئەویانەوە دەدا، پێغەمبەر دەڵێت: "هەر ماڵ و داراییەك، زێڕ یان زیو، کە بەڕژدی کۆ بکرێتەوە، ئاگرێکەو بەر دەبێتە گیانی خاوەنەکەی تا ئەو کاتەی کە لە ڕای خوادا دەیبەخشێت" ئەوجاش تۆ دەڵێی عەبدورەحمان لەم پارانە بەر پرس نیە؟ کەعەب! بە خودا درۆ دەکەیت و هەر کەسێکیش بەم دوعایەی تۆ بڵێ ئامین درۆی کردووە.

عوسمان داوای لە کەعەب کرد کە ئەم ڕەفتارەی ئەبوزەڕ بە هەند نەگرێ. ئەوجا ڕووی کردە ئەبو زەڕو بە توڕەیی گوتی: چەندم ئازار دەدەی، لاکەوە بەولاوە با نەتبینم، بە خودای من و تۆ پێکەوەمان ناکرێ، ناتوانین لە یەك جێدا بین، بچۆ دەرێ.

ئەبوزەڕ: عوسمان هێدی بە! مەگەر تۆ پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرت نەبینی؟ تۆ وەکو ئەوان ڕەفتار دەکەی؟ تۆ وەکو ستەمکارێك تەنگ بەمن هەڵدەچنی.

عوسمان (بە مکوڕی و توڕەیی): بڕۆ دەرێ! لە وڵاتی ئێمەو هاوسێیەتی ئێمە بچۆ دەرێ!

ئەبوزەڕ: ئۆف! چەند لە هاوسێیەتی تۆ بێزارم، باشە بۆ کوێ بڕۆم؟

عوسمان: بۆ هەر کوێیەك دەڕۆی بڕۆ!

ئەبوزەڕ: بۆ مەکە دەڕۆم.

عوسمان: نه به خوا نابیّ.

ئەبوزەڕ: یانی تۆ قەدەغەم دەکەی لەوەی بۆ ماڵی پەروەردگارم بڕۆم و تا مردن بیپەرستم؟

عوسمان: ئەریّ، به خودا.

ئەبوزەڕ: کەواته بۆ شام که سەر زەمینی جیهاده دەڕۆم.

عوسمان: نه وەڵلا، تۆ شامت ویّران کردبوو بۆیەم بۆ ئیّره هیّنایت، ئیّستا جاریّکی دی بۆ شامت بنیّرمەوە؟

ئەبوزەڕ: بۆ عیّراق دەڕۆم.

عوسمان: نه، نابیّ، تۆ نابیّ بۆ عیّراق بڕۆی، خەڵکی عیّراق له هەموو کەس گۆساختن دەربارەی خەلیفەو کار بەدەستانی دەوڵەت.

ئەبوزەڕ: بۆ میسر.

عوسمان: نەوەڵلا، جگه لەم شارانەی گوتت سەرپشك به(٩)!

ئەبوزەڕ (که تاقەتی چوو بوو): نه به خوا، جگه لەو شویّنانەی که نیّوم بردن بۆ هیچ شویّنیّکی تر ناڕۆم، ئەگەر به دەستی خۆم دەبوو لەم مەدینەیه دەمامەوەو بۆ هیچ شویّنیّکی دی نەدەڕۆیشتم، جا ئیّستا بۆ کویّ حەز دەکەی دوورم بخەوە.

عوسمان: نەفی بیابانت دەکەم.

ئەبوزەڕ: یانی پاش شارنشینی، ببمەوە به عەرەبی بیابان نشین؟!

عوسمان: بەڵیّ.

ئەبوزەڕ: زۆر چاکه، کەواته بۆ بیابانی نەجد دەڕۆم.

عوسمان: نه، دەبیّ له رۆژهەلاتاو بۆ شویّنیّکی دوور هەرچی دوورتریش بڕۆی، بڕۆ!
دەبیّ لەمڕۆوە بکەویته ریّ، بۆ رەبەزەت دەنیّرم. (روو له دەرباریان) ئەبوزەڕ لیّره وەدەرنەن! سواری وشتریّکی دەکەن که پالانیّکی دارینی بیّ رووپۆشی پیّوه بیّو بەوپەڕی زبری و توندی تا رەبەزەی بەرن، لەویّ نابیّ کەس هاونشینی بیّ، تا بزانین خودا چی دەویّ.

مەروان و هەموو دەرباریه مەرایی کەرو ریابازەکانیش ئەبوزەڕیان به تیّلا له کۆشکەکەی عوسمان وەدەرنا.

## له ڕەبەزەدا

***بەتەنێ دەژی، بە تەنێ دەمرێ‌و بە تەنێ زندوو دەبێتەوە.***

***" محەمەد"***

عوسمان، مەروانی ڕاسپارد تا ئەبوزەڕ بۆ ڕەبەزە ببات‌و دەستووری دا کە هیچ کەسێك بەڕێی نەکات‌و لە سەفەرەکەیدا هاوڕێیەتی نەکات.

ئەبوزەڕو مەروان سوار بوون‌و بە ڕێکەوتن‌و خەڵکیش بە دەستووری عوسمان لێی دوور کەوتنەوە. ئەبوزەڕ نیگا قوڵەکانی بە دەوروبەردا دەگێڕاو دوعاخوازی دەکردو بە چاوی خۆی ئەو بیدعەت و گۆڕانکاریانەی کە لە هەر گۆشەو کەنارێکی ئەم شارەدا دەبینی کە لە زەمانی پێغەمبەر بە دواوە هاتبوونە ئاراوە. بیرەوەری‌و یادگاران هێرشیان بۆ هێنا، سەری داخست‌و نقومی بیرێکی قوڵ و بە ئازار بوو. گفتوگۆیەك کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە نێوان ئەو و محەمەدی خۆشەویستیا ڕووی دابوو. لە گوێیدا زرینگایەوە: "دوای من زوو بە زوو بەڵایەکت بەسەردا دێت".

- "لە ڕای خوادا؟"
- "لە ڕای خوادا"
- "ڕازیم بە ڕەزای خوا".

ئەبوزەڕ سەری هەڵبڕی، ڕێگەی بیابانی دەبڕی. ئاسۆی خوێنین جارێکی دی ئەم پیرەمێردەی لە بیاباندا دەبینی کە لە ژێر چاودێری مامۆرێکا بەرەو تاراوگە دەبرێ. خۆر داوێنی زێڕینی خۆی لەسەر چیاو بیابانەکان کۆکردەوەو ئاسۆ پێڵوە خوێنینەکانی خۆی لێك نان.

عەلی لە دوورخستنەوەو نەفی کردنی ئەبوزەڕ ئاگادار بووەوە. بە کوڵ گریاو بە کەسەرەوە گوتی: چ لەگەڵ یاری ئەمەکداری پێغەمبەردا دەکەن؟! هەنگێ بە خۆی لەگەڵ حەسەن و حسەین و عەقیلی برای‌و عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرو عەماری کوڕی یاسردا کەوتنە دوای ئەبوزەڕ و لە شار دەرچوون، بە هەشتاو خۆیان گەیاندە ئەو، عەلی چووە بەردەم ئەبوزەڕ تا قسەی دەگەڵ بکات. مەروان هات و بەردەمی گرت و گوتی: ئەی عەلی، میری باوەڕداران بەڕێکردن‌و هاوڕێیەتی ئەبو زەڕی قەدەغە کردووە، ئەگەر نەت زانیوە، بیزانە.

عەلی گوێی نەدایێ‌و بەرەو ئەبوزەڕ چووە پێشێ، مەروان هەمدیس بەردەمی عەلی گرت، عەلی شەلاقێکی بەسەری وشترەکەیدا کێشاو گوتی: بڕۆ دواوە! خودا بتخاتە دۆزەخ.

مەروان کە بینی عەلی توڕەومکوڕە، ڕووی وشترەکەی وەرگێڕاو ئەبوزەڕی لای ئەوان بەجێ هێشت‌و خۆی بۆ شکات بۆ شار گەڕایەوە، عەلی‌و هاوەڵەکانی دەگەڵ ئەبوزەڕدا وەڕێ کەوتن تا گەییشتنە ڕەبەزە، لە چارەوێکانی خۆیان دابەزین و دانیشتن‌و پێکەوە کەوتنە گفتوگۆ. کاتی جیا بوونەوە هات‌و عەلی هەستا، ئەبوزەڕ هەستی کرد کە گرێی خەم ئەوکی دەگوشێت‌و خەریکە دڵی شەق ببات، شانەکانی عەلی گرت و لە حاڵێکا کە نیگا حەسرەتبارەکانی لە سیمای ئەو نەدەگواستەوە باوەشی پێدا کردو بە خۆوەی گوشی. عەلی هەستی بە گەرمی ڕوندکەکانی ئەبو

زەڕ. ئەم یارە ئەمەکدارو دەم بە خەندەیەی محەمەدو ئەم پەنایەی هەژارانی بەسەر گوناکانی خۆیەوە کرد، لێی جیا بووەوە.

بارانی عەسر لە دوو چاوی ئەبوزەڕ دەباری‌و دەتگوت نیگا تامەزرۆ وتینووەکانی بە دیداری عەلی‌و حەسەن‌و حسەین پاراو دەکات، بە دەنگێکی خەمناك‌و گریاناوییەوە گوتی: "ئەی خانەدانی رەحمەت، خودا بە رەحمەتتان بکات، ئەی عەلی، هەر جاریٚ چاوم بە تۆو دوو فرزەندەکەت دەکەویٚ پێغەمبەرم وەبیردێتەوە، من لە مەدینەدا جگە لە ئێوە هیچ دڵخۆشییەکم نەبوو، من لە مەدینەو لە شام باریٚ بووم بەسەر شانی عوسمان‌و معاویەوە، عوسمان نەیویست من لە نزیکی ئەوو کوڕە خاڵەکەیەوە، معاویە وەمێنم، نەوەك ئەوێندەری بەسەرا بڕوخێنم، منی بۆ جێیەك نارد کە جگە لە خوا هیچ یارو یاوەرێکم نیە.

عەلی کە دەی بینی دەبیٚ ئەم دۆستە بە تەمەن و ئەمەکدارە لەم سارایەدا بە تەنیٚ بەرەڵلا بکات‌و بە دەستی چارەنووسی شوومی بسپێریٚ، زۆر خەمناك بوو، گوتی: "ئەی ئەبوزەڕ تۆ لەبەر خاتری خودا توڕە بووی. کەواتە بە تەمای ئەو کەسە بە کە توڕەیی تۆ لە پێناوی ئەودا بوو، ئەمانە لەبەر دنیایان لە تۆ ترسان‌و تۆ لەبەر دینت لەوان ترسایت، ئەوەی کە لەسەری لە تۆ دەترسان بۆ خۆیان‌و ئەوەی کە لەسەری لێیان دەترسایت بگرە.

ئەوان زۆریان پێویست بەو شتەیە کە تۆ لێت قەدەغە دەکردن، تۆ هەرگیز پێویستت بەوە نییە کە لێیان قەدەغە دەکردی! زوو بە زوو بۆت بە دیار دەکەویٚ کە سبەی رۆژیٚ چ کەسێك قازانجتری کردووەو بە چ کەسێك بەغیلی دەبەن، ئەگەر هەموو دەرگاکانی ئاسمان‌و زەوی لە بەندەیەك ببەستریٚ‌و ئەو بەندەیە لە خوا بترسێت، خودا دەرویەکی هەر لێدەکاتەوە، ئەبوزەڕ جگە لە هەق ئولفەت بە هیچەوە مەگرە، جگە لە نە هەق لە هیچی تر مەترسە، تۆ ئەگەر دنیای ئەوانت قەبولٚ بکردایە، خۆشیان دەویستی و ئەگەر بتویستایە، کە بەشێك بگەی کاریان بەسەرتەوە نەدەبوو"(١٠).

ئەوجا روویکردە حەسەن‌و حسەین و گوتی: "کوڕەکانم دوعا خوازی لە مامتان بکەن، عەقیل! مالٚاوایی لە برایەکەت بکە" لە حاڵێکا کە بێدەنگی‌و خەمێکی رەش هەموو لایەکی داگرتبوو، دوعاخوازیان لە ئەبوزەڕ کردو گەڕانەوە.

ئەبو زەڕ، بە نیگا قوڵ‌و پڕ کەسەرەکانی، تا ئەو کاتەی کە ئەوانی لەو بیابانەدا دەبینی، بەڕێی کردن...

مەروان لای عوسمان شکاتی لەم رەفتارو هەڵوێستەی عەلی کرد، عوسمان بە توڕەیی هەستاو گوتی: ئەی گەلی موسوڵمانینە کەسێك چاری من لەگەڵ عەلی دیاری بکا، لە کاتی ئەنجامی ئەرکدا سووکایەتی بە مامۆرەکەم کردووە، دارکاری کردووە، دەستووری منی ژێر پیٚ ناوە، بە زاتی خوا هەقی لە مشتی دەنەم.

عەلی بۆ مەدینە گەڕایەوە، خەڵکەکە رایانکردە پێشی‌و گوتیان: "میری باوەڕداران، لەسەر ئەوەی ئەبو زەڕت بەڕیٚ کردووە، لێت توڕە بووە"!

عەلی (بە زەردە خەنەیەکی تەوسامێزەوە) توڕەیی ئەسپ هی لغاوەکەیەتی!

بوو بە شەو، عەلی بۆ مزگەوت هات و عوسمان گوتی: چ شتێك وای لێکردی بەو جۆرە ڕەفتار دەگەڵ مەرواندا بکەی؟ چ شتێك تۆی لێ گۆساخ کردووم؟ بۆچی بە گژ مامورەکەی منا چوویت، بۆ دەستووری منت شکاندووە؟.

عەلی: مەروان یەکەمجار بەگژ منا هات و منیش دامە دواوە، سەبارەت بە دەستووری تۆ، من نەم شکاندووە.

عوسمان: باشە ئاگادارنیت کە من بەڕێ کردنی ئەبوزەڕم قەدەغە کردووە.

عەلی: "یانی هەر دەستوورێك، ئەگەر پێچەوانەی هەق و تاعەتی خواش بێ، بە ئێمە بدەی دەبێ جێبەجێی بکەین؟ بە خوا هیچ کاتێك کاری وا ناکەین."

عوسمان: قەرەبووی مەروان بدەوە!

عەلی: چ قەرەبوویەك؟

عوسمان: تۆ شەلاقت بە تەختی تەوێڵی وشترەکەیدا کێشاوە!

عەلی: ئەمە وشترەکەی من، ئەگەر دەیەوێ با بێ من چۆنم لە وشترەکەی ئەو داوە، ئاوا لێی بدات، بەڵام من، با ڕێك و ڕاست پێت بڵێم ئەگەر ئەو جنێو بدات، جنێو بە تۆ دەدەمەوە.

عوسمان: "بۆچی تۆ جنێو بەو بدەی و ئەو جنێو بە تۆ نەدات؟! بە خودا تۆ لە لای من لە مەروان باشتر نیت*"

***[* مەروان لەلایەن پێغەمبەرەوە دوور خراوەتەوەو پێغەمبەر دەربارەی ئەو گوتویەتی: سووسەماری کوڕی سووسەمارو مەلعونی کوڕی مەلعون.]***

عەلی (بە تووڕەیی): تۆ ئەم قسەیە بە من دەڵێی؟ من بە هاوتای مەروان دەزانی؟ بە خودا من لە تۆ باشترو زیاترم، باوکم لە باوکت و دایکم لە دایکت باشتر و زیاترن!

عوسمان لە تووڕەییدا سوور هەڵگەڕا، هەستاو بۆ ماڵ ڕۆییشتەوە، عەلیش بۆ ماڵی خۆی ڕۆییشتەوەو ژمارەیەك لە ئەنسارو موهاجیران لە دەوری عەلی خڕبوونەوەو هەوڵیاندا تا هێوری بکەنەوە. بەیانی ڕۆژی دووەم، خەڵکی چوونە نك عوسمان و عوسمان گلەیی لە عەلی کردو گوتی: هەمیشە ئیرادم لێدەگرێت و پشتیوانی ئەو کەسانە دەکات کە ڕەخنەم لێدەگرن.

خەڵکەکە وازیان نەهێنا تا ئاشتیان کردنەوە، و لە ئەنجامدا عەلی بە هێمنی ڕووی کردە عوسمان و گوتی: من تەنیا بۆ ڕەزای خوا ئەبوزەڕم بەڕێ کردووە.

*　　　*　　　*

دوور خستنەوەی ئەبوزەڕ کارێکی خراپی کردە سەر دڵان، ئەبول دەردا کاتێ هەواڵی دوورخستنەوەی ئەبوزەڕی بیست گوتی: "بە خودا ئەگەر دەستێك یان ئەندامێکی بەدەنی بڕیبام ئەوەندەم ئازار پێ نەدەگەیی، چونکە لە پێغەمبەرم بیستووە کە: ***نە ئاسمانی کەوە سایەی خستووەتە سەر پیاوێکی ڕاستگۆتر لە ئەبوزەڕو نە زەوی لێڵ و تاریك وێنەی ئەوی لە خۆ گرتووە"***.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود– یاوەری گەورەی پێغەمبەر – لە کوفە خەبەری دوورخرانەوەی ئەبو زەڕی بیست، بە کینایە لە گوتەیەکدا گوتی: ***(لە دوای ئەوەش هەر خۆتان بوون کوشتارووو لە یەکتر دەکرد، بە پیشتیوانی خەڵکی تر– بە تاوانی و دەستدرێژی هێندێ کە هەر لە خۆتانن، لە وڵاتیان وەدەدەرنێن... سورەتی بەقەرە، ئایەتی ٨٥).***

وەلیدی حاکمی کوفە خەبەری بە عوسمان داو عوسمان دەستووری دا بۆ پایتەختی بنێرن، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود کە بۆ مەدینە هێنرا، چووە مزگەوت، عوسمان بە خوڵامە ڕەشەکەی گوت ئەم پیاوە لە مزگەوت وەدەرنێ، ئەویش کوڕی مەسعودی هەڵگرت و لە دەرێی مزگەوتەکەدا دای بە عاردیداو لە ماڵەکەی خۆیدا حەپسی کردو هیچی نەدایێ تا مرد!

معاویە هەواڵی زانی کە عوسمان ئەبوزەڕی بۆ ڕەبەزە دوور خستووەتەوە بڕیاری دا کە ژنەکەشی بۆ لای ئەو دوور بخاتەوە. داکی زەڕ (ژنی ئەبوزەڕ) چووە دەرێ و کیسە پارەیەکی بە دەستەوە بوو، معاویە رووی کردە ئەوانەی دەوروبەری و کیسەکەی پێ نیشانداندو بە تالیقەوە بۆ ئەبو زەڕ گوتی: ئێوە بڕواننە ئەو کەسەی کە لە دنیادا پارسایی و زوهد دەنوێنێ بزانن چی هەیە؟

داکی زەڕ: بە خودای ئەمە نە درهەمێکی تیایەو نە دیناری، ئەمە چەند پولێکی ڕەشە کە هەر جارێ مووچەکەیان دەدایێ بۆ خەرجی ژیانمان وردی دەکردەوە.

داکی زەڕ گەییە ڕەبەزەو سەیری کرد مێردەکەی لەو بیابانەدا خەریکە مزگەوت دروست دەکات.

ڕۆژێك نەعیمی ریاحی هاتە ڕەبەزەو لە داکی زەڕی پرسی: – ئەبوزەڕ لە کوێیە؟

– لەوێندەر، لەسەر زەرعاتەکەیەتی.

نەعیم چاوەڕوانی کرد تا ئەبوزەڕی بینی خەریکە دێت و دوو وشتران بە دووی خۆیدا رادەکێشێت و مەشکەیەکی بە ملی هەر یەکێکیاندا کردووە. ئەبوزەڕ مەشکەکانی لە عاردی داناو نەعیم لێی چووە پێشیٰ و گوتی: ئەی ئەبوزەڕ لە ناو خەڵکیدا کەسێك نەبووە کە بە ئەندازەی من بە دیدارت هەم شاد ببێ و هەم خەمگین! ئەبوزەڕ: ڕەحمەتی خوا لە بابت، ئەم دووانە چۆن پێکەوە کۆ دەبنەوە؟

نەعیم: من لە سەردەمی جاهیلیەتدا کیژەکەمم زندە بە چاڵ کردووە، جا من لەم دیدارەی تۆدا بە هومێد بووم کە ئەگەر دەرفەتی تۆبە وچارەیەك هەیە، پێم بڵێ و لەوەش نیگەران و خەمگین بووم کە بڵێی تۆبەی تۆ قەبوڵ نیە.

ئەبوزەڕ: ئایا ئەمە لە ڕۆژگاری جاهیلیەتدا بووە؟

نەعیم: بەڵێ.

ئەبوزەڕ: خواوەند لە رابردوو خۆش بووە.

* * *

وەرزی حەج هات، هاتوچۆی خەڵکی بە ڕەبەزەدا زیادی کرد، ڕێبوارانی حەج کە لە ڕەبەزەوە ڕەت دەبوون، لە مزگەوتەکەی ئەبوزەڕا نوێژیان دەکردو پاشان لە نك وی دادەنیشتن و دەگەڵ ئەم

سەحابە گەورەیەی پێغەمبەرا قسانیان دەکرد. ڕۆژێك ژمارەیەك لە حەجاجان هاتنە ڕەبەزەو بینیان ئەبوزەڕ لە نوێژا وەستاوە، چاوەڕوانیان کرد تا نوێژ تەواو بوو، و ڕووی بەلای ئەواندا وەرگێڕاو گوتی: بەرەو لای برا خێرخوازو میهرەبانەکەتان لەزێکەن! ئەوجا کەوتە گریان و گریانەکەی زیادی کردو گوتی: تاسەی ئەوەی کە پێی ناگەم کوشتمی!

– ئەوەی کە پێی ناگەی کامەیە ئەبوزەڕ؟

– ئارەزووی درێژ.

خەڵکەکە لە دەوری دانیشتن و هەندێکیان بۆ دڵخۆشی ئەو کەوتنە قسە گوتن بە عوسمان، بەڵام ئەبوزەڕ لەم کارەی قەدەغە کردن، هەستاو دەگەڵ خزمەتکارەکەیدا ڕۆیی. مەغروری کوڕی سوید ئەبو زەڕی بینی کە جلکێکی کتومت وەکو جلکی خزمەتکارەکەی لەبەر کردووە، سەیری لێهاتو هۆی ئەوەی لە ئەبوزەڕ پرسی، ئەبوزەڕ گوتی:

– پێغەمبەری خودا بە منی فەرمووە: "خزمەتکارەکانتان، براتانن‌و خوا خستوونیە ژێر دەستتان، کەسێك کە براکەی لە ژێر دەستیا بێ دەبێ لە خواردنەکەی خۆی بداتێ‌و لە جلکەکەی خۆی جلکی بۆ بکات‌و کارێك کە خۆی نەتوانێ بیکات، بەوی نەکات و لە کاری قورس دا یارمەتی بدا".

ئەبوزەڕ ڕۆیی تا گەییە چادرەکەی، لەبەر چادرەکەدا لەسەر جەواڵێك ڕۆنیشت، پیاوێك کە ژنەکەی ئەبوزەڕی بە ڕەنگ و ڕووی سیسەڵەو چرچەڵەو ڕەش داگەڕاوو تۆزایەوە بینی بوو، هاتە لای ئەبوزەڕو دانیشت‌و ڕووی تێکردو لە ڕووی دڵسۆزییەوە گوتی: "تۆ پیاوێکی‌و هیچ فرزەندێکت بۆ نەماوە*"

*[* ئەمە یەکێکە لەو خاڵە نادیارو نا ڕوونانەی ژیانی ئەبوزەڕ کە ڕای جیاوازی لەسەرە].*

– سوپاس بۆ خوا کە لە دنیای فانی بردنەوەو لە سەرای بەقادا وەکو زەخیرە هەڵی گرتن.

– ئەی ئەبوزەڕ باشتر وابوو ژنێکی دیکە بێنی.

– ژنێ بێنم کە بچووکم بکات باشترە لە ژنێ کە سەربەرزم بکات.؟

– باشتر نەبوو ڕایەخێکی ڕەنگین تر لەمە هەڵبژێری؟

– خوایە تۆبە!.... هەر چیت بە دەستەوە هات شوکر بە!

حەجاجەکان ڕۆییشتن و ئەبوزەڕ و ژنەکەی لە ڕەبەزە مانەوە. چەرخی ڕۆژگار دەسوڕاو ئەم ڕووداوانەی لەگەڵ خۆدا بۆ خەڵکی ئایندە دەبرد. ئەبوزەڕ شەوو ڕۆژی بە سوپاس و ستایشی خوا ڕادەبواردو لە ساراو بیابانی بەرین و خامۆشا، زیاتر هەستی بە نزیکی خوا، لە خۆی دەکرد، مۆڵەتی لە عوسمان وەرگرت بۆ زیارەتی ماڵی خواو بەرەو مەکە جما تا گەییە کابەو لە بەرانبەریا وێستاو هاواری کرد:

– ئەی خەڵکینە! من جوندوبی غیفاریم، وەرنە لای برای خێرخوازو دلۆڤانی خۆتان.

خەڵکەکە ئەڵقەیان لە دەوری بەست و ئەوجا گوتی: ئایا بە باوەڕی ئێوە ئەگەر یەکێکتان بۆ سەفەر ێ بڕوات، توێشوویەك کە بە کەڵکی بێ لەگەڵ خۆی هەڵناگرێ؟

– ئەدی مانای چی.

- سەفەری ڕێی قیامەت لەوە دوورترە کە وێنای دەکەن، ئەو شتەی بە کەڵکتان دێ لەگەڵ خۆتانی بەرن!
- چ شتێك بە کەڵکمان دێ؟
- بۆ ئەنجامدانی کارێن گرینگ وەرنە زیارەتی ماڵی خودا، بۆ ڕۆژی حیساب لە ڕۆژانی گەرما ڕۆژوو بگرن، بۆ ڕەوانەوەی ترسی گۆڕ لە جەرگەی تاریکی شەودا دوو ڕکات نوێژ بکەن، بۆ ڕۆژی گەورەی پەسڵانێ قسەی هەق بکەن و لە قسەی ناهەق و چرووکدا بێدەنگ بن، لە ماڵ و داراییتان ببەخشن ڕەنگە لە بارگرانیەکەی ئاسودە بن، دنیا بکەن بە دوو بەشەوە، بەشی یەکەمی بۆ تاقیبی حەڵاڵ و بەشی دووەمی بۆ داوای قیامەت تەرخان بکەن، سێیەمیان زیانتان پێ دەگەیەنێ و بێ سوودە، وازی لێ بێنن، سەروەت و سامان بکەن بە دوو بەشەوە، نیوەی یەکەمی خەرجی خانەوادەکانتان بکەن و نێوەکەی تری بۆ ئەو دنیاتان بنێرن، سێیەمیان زیانتان پێدەگەیەنێ و بێ سوودە، وازی لێ بێنن.

ئەبوزەڕ حەجەکەی تەواو کردو بۆ مونا ڕۆیی، خەبەریان دایێ کە عوسمان لە سەفەرا چوار ڕکات نوێژی کردووە، توڕەیی نیشتە سەر سیمای و هێرشێکی ناخۆشی کردە سەر عوسمان و ئەوجا گوتی: من دەگەڵ پێغەمبەری خوادا، لەسەفەرا نوێژم کردووە، ئەو دوو ڕکاتی دەکرد، هەروەها دەگەڵ ئەبوبەکر و عومەریشا بە هەمان شێوە نوێژم کردووە، عوسمان چۆن نوێژی تەواو دەکات؟!

ئەوجا وەستاو خۆیشی چوار ڕکاتی کرد. ژمارەیەك لە ئامادەبووان، سەریان لەم دیمەنە سوڕما، کە نوێژ تەواو بوو گوتیان: خۆ تۆ ئەمەت لە میری باوەڕداران بە عەیب گرت، چۆن خۆت وا دەکەی؟

- نیفاق خراپترە!

ئەبوزەڕ بۆ ڕەبەزە گەڕایەوە، لێرەوە دیمەنێکی خەمناکتر لە ژیانی ئەو دەست پێدەکات، دەستکورتی و تەنگی گوزەران زۆری ئازار دەدا، برسێتی تەواو تەنگی بە ژن و کچ و کوڕەکەی* هەڵچنیوەو بێ تاقەتی کردوون، *[* ئەم بابەتە بە بەراورد لەگەڵ مردنی کوڕەکەی ئەبوزەڕا کە بەر لەم مێژووە لە جەنگا ڕوویداوە، نا دروست دێتە بەرچاو، لەوەیە ئەمە کوڕێکی تری ئەو بێ. هەواڵی جیاواز دەربارەی کەسایەتیانی گەورەی مێژوو، بەڵگەی گەورەییانە].*

ئەبوزەڕ لە هەنبەر ئەم هەموو ئەزاب و ئازارانەدا تەنیا یەك ماکی دڵخۆشی هەبوو، ئەویش ئەمە بوو کە لای ئەسەح بوو ئەم هەموو پەرێشانیە لە ڕای خواو لە پێناوی ئازادی خەڵکی هەژارو بێنەوادا تەحەمول دەکات. گیانی خۆی کردبوو بە قەڵغان و سپەری هەر بەڵاو نسیبەتێك و خۆی بۆ تەحەمولی هەر سەختی و دژوارییەك ئامادە کردبوو، ئەو چەند سەرە پەزەشی کە هەیان بووو بە شیرەکەی دەژیان یەك لە دوای یەك مردار بوونەوەو زایە بوون. هەژاری و برسێتی گوشاری دێناو ژیانی لێ تەنگترو زەحمەتر دەکردن تا لە ئەنجامدا کیژەکەی لە پێ کەوت و لەبەردەم بابە پیرەکەیدا لە برسانا گیانی سپارد، بەڵام گورگی هەژاری و برسێتی بە خواردنی ئەم یەکە تێر نەبوو، پەلاماری کوڕەکەشی دا، ئەبوزەڕ ترسا کە ئەگەر کوڕەکەشی لەم بیابانەدا لە برسا گیانی

بسپێرێ گوناحبار ببێ، هەستاو ملی رێگەی مەدینەی گرت و یەکڕاست بۆ دەرباری پڕ تەختشان و پەخشانی عوسمانی خەلیفەی پێغەمبەری خوا رۆیی. بە بالآیەکی بەرز، پشتی چەماوە، جلكو بەرگێکی کۆنی شڕۆڵە کە لێی هاتبوو، بە سیمایەکی رەشتاڵەوە کە جێ پێی خەم و واریقاتی رۆژگاری بەسەرەوە دیار بوو، بە قژو موویەکی سپییەوە کە دەبریقایەوەو بە جووتێ چاوی تیژەوە کە خۆراگریو باوەڕو پاکی لێ دەخوێنرایەوە، خۆی بەلای عوسمان و دەستو پێوەندە ریابازو زمانلوس و زێڕ کۆکەرەوەکانیا کرد، لە هەموو لایەکەوە نیگایانی ئاوێتە بە ترس و بەزەیی و حورمەت و رێزی تێ بڕدرا، لە لای دەرگاکەوە، بەرانبەر بە عوسمان وێستاو نیگایەکی قولێ و پڕ مانای بڕییە چارەی ئەوو بە دەنگێکی گڕوگیراوو توند گوتی:

– عوسمان! تۆ منت لە ماڵەکەم هەڵفڕاندو بۆ شوێنێکت ناردووم نە خواردنێکی لێیەو نە روەکێك، جگە لە چەند سەرێك پەز کە هێشتا نەهاتوونەتە شیر، هیچی ترم نیە، جگە لە ژنەکەم هیچ خەمخۆرو خزمەکارێکم نیە، لەوێ لەو بیابانەدا تاقە سابات و سێبەرم درەختێکە، عوسمان! خزمەکارێك و چەند سەرێك مەڕم وێدە تا بتوانم پێیان بژیم.

عوسمان، وەك ئەوەی لە بنی گوێی لە قسەکانی ئەبوزەڕ نەبووبێ، رووی وەرگێڕا، ئەبوزەڕ دیسان چووە ئەو دیوو لە بەرانبەریا وەستاو قسەکەی خۆی لە بەردەمیا دووبارە کردەوە.

حەبیبی کوڕی موسەلەمە کە لە دەربارییانی عوسمان بوو، دڵی بە حاڵی سووتاو گوتی: تۆ هەزار درهەمو پێنج سەد سەر پەزو خزمەتکارێکت لای من هەیە!

– پارەو پەزو خزمەکارەکەت بدە بە یەکێك کە لە من ئاتاجتر بێ، من ئەو مافەم دەوێ کە قورئان پێی رەوا بینیوم.

لەم بەینەدا عەلی وەژوورکەوت.

عوسمان: (روو لە عەلی) ئەم گێلە پیاوەی خۆتمان لە کۆڵ ناکەیەوە؟

عەلی: کام گێلە پیاو؟

عوسمان: ئەبوزەڕ.

عەلی: ئەبوزەڕ گێل و ئەبلە نیە، بە زاتی خوا بە خۆم گوێم لە پێغەمبەر بووە کە گوتوویەتی:

***"سەلاری و شەرمو خواناسی و پارسایيو بێ فیزی ئەبوزەڕ وەکو عیسای کوڕی مەریەمە."***

ئەبوزەڕ لە دوای ژنەوتنی قسەکانی عوسمان، بە تووڕەیی مەجلیسەکەی بەجێ هێشت و هەر چەند بانگیان کرد وەڵامی نەدایەوەو هەمدیس بۆ ماڵەکەی خۆی بۆ بیابانی رەبەزە گەڕایەوەو کاتێ گەییە لای چادرەکە سەیری کرد ژنە بەلەنگازەکەی بە دیار جەنازەی کوڕەکەیەوە – کە دیار بوو تازە لە برسانا گیانی سپاردبوو– دانیشتووەو دەگری، ئەبوزەڕ تێ گەیشت کە برسیەتی کوڕە ئازیزەکەشی کوشتووە.

بۆ ساتێك چاوەکانی لێك ناو بۆ ئەوەی ئەم ئازارە جەرگ بڕە فەرامۆش بکات، خۆی بە خوا سپاردو رەزامەندی ئەوی کرد بە هەوێنی تەسەلای خۆی و دامرکاندنەوەی ئەم داغە گورچکبڕە، لە پڕ زاتی وەبەر خۆی دا چاوەکانی کردەوەو ئەو روندکانەی سڕی کە نیشتبوونە سەر

گۆناکانی‌و بە مکوڕی جەنازەی کوڕەکەی هەڵگرت و لە کاتێکا بڵێسەی ئاگر دڵی دەسووتاندو سینەی دەخوارد، کفنی کردو بە خاکی سپارد.
ئەبوزەڕ تا زیاتر دژواری و سەختی دەبینی، لە خودا نزیکتر دەبووەوە. لەم ساتەدا هەستیکرد کە لە هەموو کاتێك زیاتر خۆی لە خوداداو خودا لە خۆیدا دەبینیٚ.
تاوێك بەدیار گۆڕی فرزەندەکەیەوە وێستاو بە مەحەبەتێکی باوکانەوە دەستی بەسەر ئەو خاکە رەشەدا ماڵی‌و بە زەحمەت ئەم قسانەی کرد.

- کوڕەکەم! جگەر گۆشەکەم! خوا بتبەخشێت، چاکە کار بووی، دەگەڵ داك و بابە پیرەکەتدا میهرەبان بووی! فرزەندی ئازیزم، من بە مردنی تۆ، لە مەرگی تۆدا، لە ناخدا بە هەست بە زەبوونی‌و بچووکی خۆم ناکەم، من جگە لە خوا پێویستم بە کەسی دی نیە، قوسورم بۆ نەکردیت، بۆیە لە مردنتدا خەمناك نەبووم کوڕەکەم! ئەگەر لە یەکەمین رۆژی مەرگ نە ترسابام، حەزم دەکرد لە جێی تۆم بمرم، کوڕەکەم، بریا دەمزانی تۆ لەم هەوەڵین دادگاییەدا چیت گوتووەو چییان پێت گوتووە؟ خودایا! کۆمەڵێك مافت بەسەر ئەوا واجب کرد، بۆ منیش کۆمەڵێك مافت خستە گەردنی ئەو، خودایا من لە ماف و هەقەکانی خۆم خۆش بووم، تۆش لەو مافانە خۆشبە کە بەسەر ئەوەوە هەتە، تۆ لە من بەخشندەتریت.

لەسەر گۆڕی فرزەندەکەی هەستا، برسیەتی هێشتا هەر دەستبەردار نەبوو، ئەم دوو یارە ئەمەکدارەی پێغەمبەر، ئەبوزەڕ وداکی زەڕ، ئەم ژن و مێردە قارەمانە رۆژیان بە برسیەتی رادەبواردو بە جدی بە چاوەڕوانی مەرگەوە دەژیان.
بیابان چۆڵ و خامۆش بوو، عەرزو ئاسمانی رەبەزە دەتگوت دەیانڕوانیە ئەم دوو قارەمانە رۆژە رەشە. ئاه! دەستی تاوانباری زۆر و زێڕ چ دیمەنگەلێکی دڵتەزێن دێنێتە ئارا؟ مەرگ نزیك بوو بووەوە، ئەبوزەڕ روویکردە ژنەکەی‌و گوتی: هەستە با بچینە سەر ئەم گردانە بەڵکو لە بەری ئەم گیایانە شتێك پەیدا بکەین و تۆزیٚ برسێتی خۆمانی پیٚ بشکێنین.
لە چادرەکەیان هاتنە دەریٚ. با، وەکو بڵێی لەم دیمەنە توڕە بوو بوو، دیلوراندو بە توندی هەڵیدەکرد، پەیتا پەیتا فیکەی دەکێشا دەتگوت دەیەویٚ تەبیعەت‌و سروشت لەم بەسەرهاتە ترسناکە ئاگادار بکاتەوە.
پیرەژن ومێرد، مودەتێك کەوتنە گەڕان، هیچیان نە دۆزییەوە، ئەبوزەڕ تەواو کەسیرەو بیٚ تاقەت بوو، ئارەقەی مەرگ نیشتە سەر تەوێڵی. گەڕانەوە، باو بۆران بە گڤ وهوڕ دەهات وخێوەتە شڕەکەیانی، کە لەو بیابانەدا بەدار خورمایەکیانەوە بەستبوو، لەم لاوە بۆ ئەو لا دەبردو مەشکەژەنێی پێدەکرد.
ئەبوزەڕ، ئەژنۆکانی سست بوو بوون، سەری بەسەر سینگی دا بەر بوو بووەوە، دەتگوت هەڵۆیەکەو هەردوو باڵیان شکاندووە. ژنە شوێنەوارو ماکی مەرگی لە رووی شووەکەیدا خوێندەوەو سەیری کرد چاوانی ئەبوزەڕ سپی بوون. ئەبوزەڕ نیگای شەکەت و حەسرەتباری، کە نیشانەی ستایش و رەزامەندیی لە ئەمەکداری ژنەکەی پێوە دیار بوو، بڕییە سیمای ئەو:

- جیا بوونەوەو فیراق نزیك بووەتەوە.
- ئەوە ئەمڕۆکە چیتە؟
- بەزاتی خوا، دەبێ بەم زووانە دەست لەم جیهانە خاپینۆکە بەردەم و بە پەلە بگەمە سەرای هەرمان.

بورایەوە، ژنەکەی تاقەتی چوو، جڵەوی ئەو هەموو سەبرو حەوسەڵەیەی کە هەی بوو لە دەست بەربوو، کەوتە گریان وەکو یاران بەکوڵ فرمێسکی دەڕشت، ئەبوزەڕ چاوی کردەوە، سەیری کرد ژنەکەی بە کوڵ دەگری و روندك دەڕێژێ، گوتی: - بۆچی دەگریت؟

- بۆچی نەگریم، لە حاڵێکا کە دەبینم تۆ وا لەم بیابانەدا دەمریت و من ناتوانم هیچ کارێکت بۆ بکەم و نە من جلێکم هەیە کە بەشی کفنەکەت بکات نە تۆ.

ئەبو زەڕ دڵی بە حاڵی ژنە بەلەنگازەکەی سووتاو دڵخۆشی دایەوە:

- مەگری، مژدەت لێ بێ، من بە خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە کە فەرموویەتی: "هەر پیاوو ژنێکی موسوڵمان کە دوو یا سێ منداڵیان بمرێ و سێبوری خۆیان بدەنەوەو لە رێی خوادا حەساوی بکەن، هەرگیز ئاگرو دۆزەخ نابینن". مەگەر سێ منداڵمان نەمردن، سەبرمان نەکردو لە رێی خودامان حەساو نەکرد؟!

ئەوجا بێدەنگ بوو. ژنەکەی هەمدیس دەستی بە گریان کردەوە .ئەبوزەڕ لەم حاڵەدا کە بیری لە محەمەدی خۆشەویستی دەکردەوەو هەروەها لە تەسەلاو سوکناییەك بۆ خۆی و بۆ ژنەکەی دەگەڕا، گوتی:

- گوێم لە پێغەمبەر بوو کە بە کۆمەڵێکی، کە منیش یەکێك بووم لەوان، گوت: "یەکێك لە ئێوە لە بیابانێکدا دەمرێت و دەستەیەك لە باوەڕداران لە مەرگیا ئامادە دەبن"و هەر هەموو ئەوانە جگە لە من لە ئاوەدانیا مردوون و دیارە من ئەو کەسەم کە لە بیاباندا دەمرێت. قەسەم بە خوا نە من درۆ دەکەم و نە درۆشیان لەگەڵ مندا کردووە، رابە تەماشایەکی رێگا بکە!
- سەیری کوێ بکەم؟ حەجاجان رۆییشتوون و رێگە داخراوە،
- تەماشا کە!و ئەگەر کەست نەبینی ئەم عەبایەم بەسەردا بدەو لەسەر رێگاکە دام بنێ و بە یەکەم قافڵە کە بە ئێرەدا رۆیی بڵێ: ئەمە ئەبوزەڕ، یاری پێغەمبەرە کە لێرە مردووە، وەرن لە کفن و دفنەکەیدا یارمەتیم بدەن.

ژنە جار جارێ بەو گردەدا سەر دەکەوت و نیگای تا قوڵایی بیابان بەرەڵڵا دەکرد، لێ کەسی لەو بیابانە خامۆشەدا نەدەبینی و هەمدیس دەگەڕایەوە. ئەبوزەڕ بەوپەڕی دڵنیاییەوە کە کەسێك هەر پەیدا دەبێ تا بینێژێ، پێی دەگوت کە بڕوات و سەیری رێگاکە بکات، ژنەکەی تەنیا لەبەر رەزای خاتری ئەو، هەر چەند لە پەیدا بوونی کەسێك لەو سارایە نا ئومێد بوو، بە گردەکەدا هەڵدەگەڕاو دەگەڕایەوە، لە ناکاودا لە دووری دوورەوە چاوی بە چەند تارماییەك کەوت کە وەکو دالاش لە کلکەی بیابانەکەوە، بە هەشتاو رێیان دەکرد، داکی زەڕ، جلەکەی هەڵتەکاند، سوارەکان بەلەز بەرەو ئەو هاتن*

*[* سوارەکان بریتی بوون لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، حەجەری کوڕی عودەی، مالیکی کوڕی حارس، ئەشتەرو لاوێك لە جماعەتی ئەنسار. فەرهەنگی دەهخودا. ]*

– چ کارێکت هەیە ئەی کەنیزەی خودا؟

– پیاوێکی موسوڵمان خەریکە دەمرێ، بە خێری خوا کفنی بکەن.

– کێیە؟

– ئەبوزەڕە.

– یاری پێغەمبەر؟

– بەڵێ.

– داك و بابمان بە فیدات ئەبوزەڕ!

بە هەشتاو بەرەو خێوەتەکە ڕۆییشتن، ئەبوزەڕ هێشتا روحی تیا مابوو، سڵاویان لێکرد، ئەبو زەڕ بە دەنگێکی ئارام و خەمناك گوتی:

– ئەگەر من خۆم یا ژنەکەم پارچەیەکمان هەبوایە کە بەشی کفنەکەی کردبام، بە کارم دێنا. بە خودا سوێندتان دەدەم ئەگەر هەر کامێکتان قاسیدی دەوڵەت، سەرۆك، سەرپاسەوان، یان خەڤ و شۆڤارن کفنم مەکەن.

هەموو بە سەرسامی روانیانە یەکدی، چونکە هەر یەکێکیان خاوەنی یەکێك لەو پۆستانە بوون، تەنیا لاوێك لە جماعەتی ئەنسار نەبێ کە گوتی:

– هاپۆ گیان! من تۆ یا لەم جلکەدا کە لە بەرمە یان لە جلێکا کە دەست ڕێس و دەست چنی دایکمە کفن دەکەم.

– تۆ کفنم بکە.

ئەبوزەڕ، کە لە کاری کفن و دفنەکەی خۆی ئەرخایەن بوو، بە ئارامی و دڵنیایی چاوەکانی لێك نان و کۆتایی بە چیرۆکی خەمگین و پڕ شانازی ژیانی هێنا، شۆردیان و کفنیان کردو نوێژیان لە سەر کردو، لە پاڵ بەردێکا، لە ژێر قومەڵانێکی نەرمی بیاباندا بە خاکیان سپارد. لاوە ئەنسارییەکە بە دیار گۆڕەکەیەوە وەستاو گوتی:

– "خودایا! ئەمە ئەبوزەڕی یاری پێغەمبەرەو بەندەی تۆ پەرستە، لە رای تودا دژی کافران جیهادی کرد. خودایا! ئەبوزەڕ باوەڕو ئیمانی خۆی نەگۆڕی، بەڵکو مونکەری بینی و بە دڵ و بەزمان دژی وەستا، تا ئەزیەتیان داو دووریان خستەوەو بێ کەسیان کردو بە تاقی تەنیا لە غوربەتدا مرد. خودایا! ئەو کەسەی کە ئەبوزەڕی بێ بەش کردو لە ماڵی خۆی وحەرەمی پێغەمبەر ئاوارەی کرد لە ناو بەرە"*

*[* ئەبوزەڕ لە ساڵی ٣٢ی کۆچیدا مردو سێ ساڵ لەوە دوا هەرای مەدینەو کوشتنی عەجیبی عوسمانی لە پاڵ ژن و مناڵەکەیدا هاتە دی!! ]*

لەم کاتەدا، ڕێبوارەکان، لەو شوێنەی بیاباندا، دەستیان بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو بە گەرمی و ملکەچی، لە ژێر لێوەوە گوتیان: ئامین.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بەدەم گریانەوە گوتی:

راستت فەرموو ئەی پەیامبەری خودا:

***"بە تەنێ دەژی، بە تەنێ دەمرێ، و بە تەنێ زیندوو دەبێتەوە".***

# جارێکی دی ئەبو زەڕ

لە زوڵمەتی سەرانسەری شەوی زوڵما، سەحەر مژۆلی هەڵاتنی هەتاوێکی دی بوو و جیهان لە بێدەنگی بەر لە بۆران و تۆفان دا، و مێژوو لە بیری شۆڕش و یاخی بوونێکی گەورەدا بوو دژی خوداوەندانی زەمینو، سایەو ئایەکانیان: خودایانی ئاسمان. شیرك!

لە قوڵایی ئەو ویژدانانەی کە سایەی خواستی خوایی (مەشیەت)یان دەکەوتە سەر و لە قوڵایی ئەم سروشت و فیترەتانەی کە دەتگوت دەگەڵ یاساو رێساکانی بووندا خزمن، گۆڕانکارییانی سەیرو لە وەسف نەهاتوو رووی دەداو روحە تەنیاکان – کە وەکو حاسەی نهێنی باڵندانی کێوی، کە پێشوەختە هەست بە تۆفان دەکەنو بە پەلە لەسەر زەمینی خۆ دەڕەڤن،و یان وەکو غەریزەی راز ئامێزی ئەو ئەسپانەی کە بەر لە بوومەلەرزە، دەشڵەژێنو هەوسار دەپچڕنو ماڵی خێو،بەبێ زین و بەبێ سوار، بە جێ دێڵنو بەرەو سەحراو بیابانان سەر هەڵدەگرن– هەستیان دەکرد کە "خەبەرێك هەیە، خەبەرێکی گەورە!".

هەندێ جار یەکێك، یەك جیهانە بۆ خۆی،وهەندێ جار تاکێك، یەك کۆمەڵگەی سەربەخۆیە*.

[* ***رەنگە مەبەست یان یەکێك لە ماناو مەبەستەکانی ئەم گوزارشتە جوانەی قورئان]: (کان ابراهیم امه واحده!)*** ئەمە بێ، ئیبراهیم بە خۆی، یەك کۆمەڵگەی سەربەخۆیەو جوندوب، کوڕی جنادە، عەرەبی سارانشین، لە خێڵی غیفار، خێڵێکی هەژار، لە رەبەزە، بیابانێکی نێوان مەکەو مەدینە، لەسەر رێگەی کاروانانی بازرگانی قورەیشو زیارەتی کابە، دەگەڵ پیاوانی بوێرو ئازادا، لە بەرانبەر دابو نەریت و یاساو رێسایاندا هەموو بێ باك، لە ئەنجاما، لە چاوی ئەوانەدا کە لە پەنای ئەم نەزم و نیزامەدا دەژینو لە نیعمەتو تەناهیو ئاسایش بەرخوردارن، بەدناو، بێ موبالات، شەڕانیو ئەخلاق گەن! کە ئەخلاق لێرەدا، دەکاتە مداراکردنو رەچاوکردنی دابو نەریت و پەیڕەوی لە یاساکان،و ئەمانە هەموو شورەو حەسار بوون بە دەوری قازانج و بەرژەوەندیو ئیمتیازاتەوە: هەق و هقوق! نەزم و تەناهی!و هەموو ئەمانەش لەبەر خاتری ئەوەی کە ئەم پیاوە، لەسەر سفرەی رەنگین و چەوریا، لە نێو کۆمەڵێك برسیدا، بتوانێ باش و خۆش "بخوات!".

غیفار، خێڵێکی بەدناو، چەتەو رێگر! رێگری کاروانانی بازرگانی کاڵاو کۆیلە، "بێ موبالات، بە رادەیەك تەنانەت حورمەتی مانگە حەرامەکانیش ناگرن". ئەمن و ئاسایشی جەزیرە لەم چوار مانگەشدا دەشێوێنن، کاروانی بازرگانیو تیجارەت – کە لەم مانگانەی زیارەتدا، لەسایەی ئایندا لە بەینی رۆم و مەکە و ئێرانا لە جم وجۆڵدان– کە لە خەتەرگەی رەبەزە تێ دەپەڕن* هێشتاش کاتێ بەخۆ دەزانن شمشێرانی غیفار لە بۆسەکانی خۆیانەوە بەسەریاندا دادەبارێن!

***[* تیجارەت و زیارەت لە مێژوودا دوو رووی یەك سەرن و سەری یەك بەدەنن: بەدەنی ئابووری، ئەمەیە نهێنی دڵبەندی ئاینیی قورەیش بە کابەوە، ئەمەیە رۆڵی بتەکانی کابە، رەمزو رواڵەتێن وابەستەیی شیرکی مەزەبیو، شیرکی چینایەتی و قەومی، و ئا لێرەدایە کە پێویستە رۆڵی شۆڕشگێڕانەی یەکتاپەرستیو تەوحید دەرك بکرێ].***

پیاوانی غیفار، ئەم هەژارە گوناحکارو شەڕانیانەی کە لەسەر ڕێگەی کاروانی بازرگانیدا، لە جیاتی ئەوەی بە کاسەی گەداییەوە دەست بگرنەوە، شمشێرەکانیان بە ئاغایان نیشان دەدەن!
و کوڕەکەی جنادە یەکێکە لە مانەو هەر لەبەر ئەمەشە کە پاشان دەبێ بە (ئەبوزەڕ)ش سەری لە برسییەك دەسوڕمێ کە نانی لە ماڵێدا نیەو بە شمشێری رووتەوە لە ماڵ نایەتە دەرێ‌و پڕ ناداتە خەڵکی*؟!
***[* عجبت لمن لا یجد قوتا فی بیته کیف لا یخرج علی الناس، شاهرا سیفه؟ سەرم لەو کەسە سوڕ دەمێنێ کە لە ماڵیا خواردنێ شك نابات، و بە شمشێری رووتەوە لە خەڵکی دەرناپەڕێ‌و ڕاناپەڕێ؟ ]. ناڵێ دەتوانێ لە ماڵ دەرپەڕێ، تەنانەت ناڵێ دەبێ دەرپەڕێ، دەڵێت سەرم سوڕدەمێنێ کە بۆ دەرناپەڕێ؟ لەمەش گرینگتر ناڵێت: لە دەسەڵاتی حوکمڕان، لە چینی چەوسێنەر.. بەڵکو لە خەڵکی! واتا کاتێ تۆ برسیت، هەموو کۆمەڵگە بەرپرسیارە}(١١).***
جوندوب، کوڕی جنادە، وەکو هەر پیاوێکی غیفاری، دەزانێت کە لە ڕژێم و سیستەمی زوڵم و ستەمدا، هەر یاساو ڕێساو قەرارو داب و ڕەوشت و نەزمو تەناهییەك، پاسەوانی ستەم و زوڵمە، و پەیڕەوکردن و شوێنکەوتنی، نەزانیە. بەڵام ئەو هەنگاوێك – دوا هەنگاوی– لە پێش هەمووانەوە نا، زانی کە لێرەدا، مەزەبی فەرمانڕەواش هەمان ڕۆڵ دەبینێ‌و ئیتاعەکردنی، کوفرە! وبتە! ئەمە چیە؟ شەوێك کە خێڵ بۆ زیارەتی مەنات –بتی غیفار– ڕۆیی بوو ولە جەرگەی خۆشی و شادی‌و جۆش‌و خرۆشی دوعاو پاڕانەوەو نەزرو نیازو داواکردنی باراندا، بۆ ڕزگار بوون لەو قاتی‌و وشکە ساڵییەی کە هەڕەشەی مەرگی لە غیفار دەکرد، ئەو لە کانگەی دڵییەوە هەستی بە تروسکەیەکی گومانی پیرۆز دەکردو، ئەم تروسکەی ئاوەزەی بە شنەبای هزرین‌و ڕامانی قوڵ و بەردەوام زیاتر دەگەشاندەوە، تا لە ناو ئەو بێدەنگییە نهێنی ئامێزەی، کە پاش نووستنی خێڵ لە دەوروبەری مەنات، باڵی بەسەر بیابان و شەووئاسماندا کێشا، بە ئەسپایی هەستا، بەردێکی هەڵگرت، بە دوو دڵیەوە، لە نێوان گومان‌و یەقیندا، چووە پێشێ، بۆ چەند ساتێك لە چاوانی مەعبودەکەی زەمانی خۆی ورد بووەوە، جگە لە دووچاوی بێ نیگا هیچی تری نەبینی، بە هەموو ڕق‌و نەفرەتێکەوە، بەردەکەی بەم مەعبودەدا کە جەهل‌و نەزانی‌و ستەم چێی کردبوو، کێشا، تەنیا دەنگی پێکادانی دوو بەرد هەستاو هیچی دی!
گەڕایەوە، لە گەرمەی نەجاتی بەرەو موتڵەق دا، لە ڕزگاریی نا گەهانی لەو کۆت‌و زنجیرو بەندانەی کە دەتگوت سەدان ساڵە گیانیان پێ بەستوەتەوە، لە پڕ هەستی کرد وەك بڵێی لە بیرێکی قوڵ‌و غارێکی تەنگ‌و تاریکەوە کە لە سەرەتای بوونەوە تیای زندانی بووە، هاتووەتە دەرێ، نواڕییە بیابان، پان‌و بەرین‌و بێ سنور، ڕوانیە ئاسۆیانی دوورو بەربڵاوو ئاسمان! پڕ شکۆ، جوان، قوڵ‌و نهێنی ئامێز.. دەتگوت یەکەم جارە ئەمانە دەبینێ‌و دەتوانێ بیاندینێ.
لە ئیمان‌و یەقینەوە گەیی بووە ڕەهایی‌و بۆشایی،‌و ئێستا بەرە بەرە لە مەرزی ئیمان‌و یەقینێکی تازە، بەڵام ڕۆشن، گەورە، قوڵ، هوشیارانە، ئەوەی خۆی هەڵیدەبژێرێ! نزیك دەبووەوە.
لە ژێر بارانی ئەندێشەدا کە سات بە سات توندو توندتر دەبوو، هەستی دەکرد کە لە بیابانی تاریك‌و وشك‌و تینووی دەرونیا، سەرچاوەگەلێك سەر هەڵدەدەن، ئەوەتا، "دەنگی پێی ئاو" دەم

به دەم توندو توندتر بەرزو بەرزتر دەبێتەوە، سەراپای دەرووني دەگرێتەوە، لەو ئاوە پڕ دەبێ، بەدەم ژانو ژارو تاسەی لە دایك بوونێكەوە، تەنیا بەسەر عەرزەوە، سێبەرو تارماییەكی تەنیا لە بیابانا، لە شەوا، لە ژێر ئاسماندا، پەیڤداری بیابان! هەموو بووني، روو لە "ئەوا" لە پڕ كەوتە سەر ئەرز، سەری بردە سوجدە، بەسەر عاردەكەوە دەنگی كرانەوەی كۆنە گرێكاني، گریان بەرز بووەوە.

و ئەمە یەكەمین نوێژی ئەبوزەڕ بوو:

" من سێ دانە ساڵ بەر لەوەی پێغەمبەری خودا بدینم، نوێژم كردووە."

– رووت دەكردە كوێ؟

– ئەو شوێنەی كە ئەو ئاراستەی دەكردم!

سێ ساڵ دواتر، بیستی كە لە مەككەدا پیاوێك پەیدا بووەو گاڵتە بە ئاینی خەڵكی دەكاتو موقەدەساتی قەوم بە باتیڵو چرووك دەزانێو هەموو بتە گەورەكاني كابە بە بەردو كەڤری كەڕو لاڵ ناو دەباتو "لەناو هەموو خواكاندا هەر یەك خوا بە هەق دەناسێت!"

رێوینگانو رێبوارانی رێی غیفار ئەم هەواڵەیان بە كارەساتێك بۆ ئاینو ئەخلاقی عەرەب دەزانیو بە تەوسو توانجەوە باسی ئەو هەواڵەیان دەكرد، بەڵام جوندوب، لە و بەینەدا تروسكەی ئاواتی لە مێژینەی خۆی بەدی دەكردو دەیزاني كە ئەوەی ئەم بت پەرستانە –كە پڕوپوچو خورافاتی جاهیلی شیرك ئامێزی خۆیان دەدایە پاڵ ئیبراهیمی بت شكێن– مەحكومی دەكەنو بە كوفری ناو دەبەنو بە هۆكاری دووبەرەكی كۆمەڵگەو لاوازكردني باوەڕو شێواندني هەرزی لاوانو بێ پەروایی خەڵكی نزمی كۆمەڵگەو لەقبووني بناغەكاني رەوشتو ئیمانو ئەنگێزەی رەشبینیو جودایی نێوان كیژوكوڕ لەگەڵ داكو بابانـدا دەزاننو گوایە مایەی سوكایەتییە بە گەورە پیاوانو شانازییو كەسایەتیاني مەزەبیو حورمەت چووني پێشینانو ئەفسانانی كۆنو دابو نەریتی بابو باپیران... جوندوب دەیزاني هەر هەموو نیشانەی روونو ئاشكرای شۆڕشێكی رزگاری بەخشو داهێنەرانەی ئینسانیەو قەرینەی بتەوی حەقیقەتی خواییە، و جوندوب –كە لە و روحە پڕ جۆشو شۆڕشگێڕانە بوو كە لە قاڵبی تەنگی دابو نەریتی كۆمەڵایەتیو بۆماوەییدا ناهێورێنو لە جوڵەو داهێنانو بەهرەی گۆڕانو گۆڕینو پەرەسەندنو توانای هەڵبژاردندا دوا ناكەون– هەستی كرد كە "شتێك بووە"و ئەمە هەمان شتە كە روحی ئومیو ئەندێشەی ئازادی ئەو، لە تەنیایی دەروونو خەڵوەتی بیاباندا بۆی دەگەڕا.

هەڵبەتە لە هەنبەر ئەم "هەواڵەدا" بێ لایەن نەبوو، مەسئولیەت واداری كرد كە بكەوێتە تاقیبو گەڕانو باوەڕو داوەری خۆی لەو "دەمگۆ"و (بانگەشە)و (درۆو دەلەسەو بوختانانەوە) هەڵنەهێنجێ و وەرنەگرێت كە خەواسی غەرەزدارو عەوامی بودەڵە بڵاوی دەكەنەوە، بەخۆی بكەوێتە تاقیب، چونكە داوەری هەر كەسێك دیارترین نیشانەی كەسایەتی ئەوەو ئەوانەی كە دژی كەسێك، هزرێك، بەرهەمێك، راپەڕینێكو هەر رووداوێك، لە رووی (وتیان)ەوە داوەری دەكەنو سەرچاوەی هەموو بیرو بۆچوونو حوكمەكانیان كەسێكە بە ناوی ئاغای "دەڵێن!" بەر لەوەی نەزانانەو بێ ئینسافانە حەقیقەتێك مەحكوم بكەن، خەڵكانێكی داماون كە (خود)ی خۆیان

بە کۆیلەیەتی فیکری هێزێن زەمانەو خواجە خورافە سازو دەزگا بانگەشەییە دیارو پەنهانەکان، مەحکوم کردووەو سەلماندوویانە کە کاوێژکەرەوەی بێ دەسەلاتی ئەو بانگەشەو دەمگۆو تۆمەتو درۆو دەلەسانەن کە (دژمن) ڕایان دەسپێرێو بە کردیان دەداتو (مونافق) دروستیان دەکاتو "عەوام خەڵەتێن" بڵاویان دەکاتەوەو (عەوام) وەریان دەگرێو قەبوڵیان دەکات! بەڵام کوڕەکەی جنادە، ئەنیسی برای بۆ مەککە دەنێرێ تا ئەم پیاوە تۆمەتبارە بە درۆو شێتیو ئەفسونو شیعرو کوفر کە دەڵێن هاتووە تا حورمەتی (ماڵی خوا) بەرێو یەکێتی کۆمەڵگە بە هەڤدژیو دووبەرەکیو، تەبایی و سازگاری خانەوادە بە دژایەتیو دڕدۆنگی بگۆڕێ، لە نزیکەوە بدێنێ، گوێی لە قسەو پەیڤی بێت و لە پەیامەکەی تێ بگاتو بۆ ئەوی بەرێتەوەو بیگێڕێتەوە.

ئەنیس هاتە مەککە، ئەو پیاوەی نەبینی، هیچ کەسێك ناونیشانی بەم غەوارە بێ ناوونیشانە نەدا، نائومێدانە لە شارا دەگەڕاو جگە لە جنێوو گاڵتەو کینەو نەفرەت سەبارەت بەم پیاوە چیتری نەدەبیستو لە هەموو شوێنێك، لە مزگەوتو بازاڕ،و هەموو کەسێك، بە تایبەتی (خەڵکانی ماقول)، (کەسایەتیانی بە ئیحتوبار)، (گەورە پیاوانی دین و دنیا)و هەروەها عیبادەتکارانی باوەڕدارو پابەندی مەزەبی – باوەڕداران بە سونەتی ئیبراهیم و خانەی ئیبراهیم!– هەمان قسانیان دووبارە دەکردەوەو ئەو بانگەشەو دەمگۆیانەی بڵاوبووبوونەوەو کەوتبوونە سەرزاران بریتی بوون لە "شێتە، جادووگەرە، جەزبەو جازیبەی قسەکانی هی سروش وسەرۆ نیە، جادووە، جوانی حەقیقەت نیە، شیعرە، قسەکانی لە جبرائیلەوە وەرناگرێ، قسەکانیشی هی خۆی نیە، بێگانەیەکی زانا فێری دەکات، لە ڕەبەنێکی مەسیحی، زانایەکی ئێرانییەوە وەری دەگرێ، ئەمە بەڵایەکەو بەسەر ئومەتی ئیبراهیم دا نازڵ بووە، حورمەتی مزگەوتو پیرۆزی ماڵی خواو سونەتو حەج و پەرستنی خواوەندانو ڕەسەنایەتی ئەخلاقو ئابڕوی خانەوادەکانو هەموو شانازیو بەهاکانی پێشینانی ئێمە بەبادا دەدات..."

لە ناکاودا، لە کۆڵانێکی تەنگەبەری مەککەدا، قەرەباڵغیەکی بینی کە لە سوچێکا کەڵەکە بوون، خۆی گەیاندە ئەوێندەر، پیاوێکی تەنیا، سیمایەکی گەش، نیگایەك کە قوڵایی ڕوحی بێدار دەکردەوە، نێوچەوان کراوەو ئارام و دەستەباڵا، هەیئەتێکی دلێرو بەسامو لە هەمان کاتدا ئلهامبەخشی سازگارییودلۆڤانیودەنگێکی گری پیاوانە، بنجڕ ودڵنیاو لە هەمان کاتدا شیرین و سەرڕێژ لە لوتفو ناسکی، بە قسانی قوڵ، خۆش ئاهەنگو جوانتر لە شیعر، پڕ لە ترس و ئومێد، ئەو خەڵکەی دەدوان.

ئەنیس، لە بەرانبەریا وەستا، نەیدەزانی گوێ لە قسەکانی بگرێ؟ دڵ بە جازیبەکەی بدات؟ یان تەنیا تەمەشای ئەو هەموو جوانیو ناسکیو ڕێکی ئەندامو نیگاو ڕەفتارو گوفتاری بکات؟

هێشتا هەر حەپەساوو واق وڕماوی دیداری ئەو پیاوە بوو کە دەستەیەك هاتن و کردیانە هەراو هوریاو بی ئەوەی گوێ لە قسەکانی بگرنو وەڵامی بدەنەوە، سێڵاوی جوێنو بوختانو تۆمەتی دووبارە دروستکراویان بە سەرو روویا کرد، و جەماوەری ڕەش و ڕووت، ئەو خەڵکە بێ بەشەش کە هیچیان نەبوو تا لە (ڕۆشنگەری پەیام)و (شۆڕشی پەیام)دا لە دەستی بدەن،و (جەهلو نەزانی) ئەم بێ غەرەزانەی، کە خۆیان لە خۆیاندا مەحکومی سیستەمی دەسەڵاتدارو قوربانی

ئەو وەزعە بوون کە لە ئارادا بوو، کردبوو بە گەمەی دەستی (زوڵم)و پاسەوانی زیندانی خۆیان، ئەوەی (غەرەزداران) خستبوویانە سەردەمیان، بە جۆش و خرۆشێکی هۆڤیانەو ناشیرینەوە، بە دەنگی بەرز دەیانگوتەوەو (پەیامبەری تەنیا) یان بە تورەیی و زبری دەرەڤاندو یان بە جنێوو تەوس و توانجەوە بە تەنێ جێیان دەهێشت و (ئەو)یش کە هێمن و مەنگیەیەکی چوون هێمنی و مەنگی ئاسمان و، ویقارو سەبرێکی چوون سەبرو ویقاری کێوی هەبوو (کە لە حەراوە هاتبووە خوارێ و لە ئاسمانەوە پەیامی هێنا بوو)، بێ ئەوەی جەزرەبەی دژمنایەتی و رەشی جەهالەت شوێنەوارێك بەسەر سیمای گەش و میهرەبانیەوە بە جێ بێڵێ، بە پەلە بۆ گۆشەیەکی دی دەرۆیی و خۆی بە نێو دەستەیەکی دیدا دەکردو هەمدیس دەستی بە قسان دەکردەوە، دیسان گوێ نەگرتن و تێ نەگەییشتن و جارێکی دی جنێوو بوختان و سوکایەتی و تەوس و توانج، ئەویش دیسان دەچووە گۆشەیەکی دی و دەستی بە قسان دەکردەوە! هەموو شوێنێکی شار دەگەڕا، لە کۆچەو بازاڕو مەجلیس و مزگەوتا، لە هەموو شوێنێکا "دەچووە سۆراغی خەڵکی" لە هەموو شوێنێکا (لەسەر رێگای خەڵکی) دەوێستاو بێ ئەوەی بیر لە وەڵامیان بکاتەوە، ترسی دەنانەبەر، مژدەی دەدانێ، خەتەری رادەگەیاند، رێگەی رزگاری نیشان دەدا، کە پەیامی پێ بوو، کە خوای "دۆستداری سەربەرزان و دژمنی سەرکێشان" هاواری بەسەرا کردبوو کە: "ئەی ئەو کەسەی خزیویتە پەلاسی ژیانی فەردی خۆتەوە! ئەی ئەو کەسەی خۆت لە جل و بەرگی خۆتەوە پێچاوە، ئەی گیرۆدەی چوارچێوەی "بوون"و "ژیان"! شۆڕش بکە، راپەڕە، خەڵقی، کە لە سایەی جەهل و تەناهی زۆردا پاڵیان داوەتەوەو بە شوانی گورگ، هەژاری و زیللەت دەخۆن بترسێنە! ئەی شوانی نێدارو! پەزانی بیابانی قەراریت رەها بکە، کە لە شاری خودادا، مرۆڤیان وەکو پەزان لێکردووە! بەنی ئادەمێك کە خوای ئیبراهیم هەموو فریشتەکانی لە بەردەم ئەودا هێنایە سوجدە، ئەمێستا لەماڵەکەی ئیبراهیم دا، لە پای بتەکانی ئیبلیس دا — کە پارێزەرانی تایفەو چینان— هێناوەتە سوجدە.....!"

لە ناو لافاوێك لە تۆمەت و پیلان و هەڕەشەو تەوس و توانج دا کە ئەشرافی چەپەڵ، بە هاو دەستی بێ شەرەف و بێ شعوران بەرپایان کردبوو تا ئەو بێدەنگ بکەن، ناچاری بکەن تا (نەڵێت)، (دەیگوت) کە (خودای هەژاران) گوتبووی (بڵێ!) بڵێ کە: "لێبڕاوین کە هەژارانی زەوی بکەین بەرابەرانی زەمان و میراتگرانی زەمین"! ئەنیس تەمەشای کابرای دەکردو بۆی دەگەڕاو گوێی بۆ قسەکانی شل دەکردو بیری لە بوونی، بوونی مەتەڵ ئاساو سەیری، دەکردەوە. بەڵام عەجیبی بوونی کابراو سەنگینی ئامادە بوونی و جازیبەی رەفتاری و جوانیەکەی خۆی، بە جۆرێ واقیان وڕکرد کە زیاتر بوو بە تەمەشاڤانی کابرا تا گوێگری و ئەو هەموو ناسکیە، لە ناو ئەو هەموو سەختیەدا، ئەو هەموو جوانیە، لە و هەموو توندو تۆڵی و زاکونیەدا، ئەو هەموو هێمنییە، لە و هەموو ناڕەحەتیەدا، ئەو هەموو سادەییە، لە و هەموو ئاڵۆزیەدا، ئەو هەموو بەندایەتیە، لە و هەموو یاخیەتیەدا، ئەو هەموو توانایە، لە و هەموو لاوازیەدا، ئە و هەموو شەرمە، لە و هەموو گۆساخیەدا، ئەو هەموو مەنگییە، لە و هەموو خوڕییەدا، ئە و هەموو حەوسەڵەیە، لەو هەموو بێ قەرارییەدا، ئەو هەموو گوێڕایەڵیە، لە و هەموو توندیەدا، ئە و هەموو

مەحەبەت، ئیلهام، سۆز، ناسکیو غەزەلی هەست و دڵە، لە و هەموو ئەقڵمەندیو لۆژیكو هۆشیاریو جدیەتو حەماسەو عەقڵەدا، و لە ئەنجامدا ئە و هەموو ئاسمانی بوون و ئەم هەموو زەمینی نیشاندانەو ئە و هەموو خوا پەرستیو سەراپا قاڵبووی خودا، و ئەم هەموو بیرکردنەوەیە لە خەڵکیو مشورخواردنەی خەڵکییەو چوزانم؟ ئەوەندە هێرشبەرو دڵنیاو ئەم هەمووە... و بە تاقی تەنیا! کابرا، ئەم پەڕجووەی کە دیتنی هەراو هەنگامەیەکی ئەوتۆی خستە دڵو دەروونی ئەنیس، کە گوێی لە قسەکانی نەبوو، ویا گوێی لێ بوو بەڵام پەیڤەکانیو پەڕجووی ریتمی پەیڤەکانی فامی ئەوی – کە بۆ یەکەمجار قسەی خودای دەژنەوت– بە جۆرێ حەیران کرد کە توانای تێگەیشتنی لە دەست داو ئەنیس– برای جوندوب– لاوێکی بیابان نشین، (نەیزانی) کە کابرا چ دەڵێت؟ بەڵام بە غەریزەی بە قوەتو سروشتی زوڵاڵی (روحێکی بە دەوی)، (مرۆڤێکی فیتری) – کە (لوژیك) لە لای ئەو هێشتا جێی (ویژدان)ی نەگرتووەتەوە– "زانی" کە کابرا بۆ خۆی "رووداوێکە"، بە "بۆن" زانی کە ئەم پەیڤانە، لەسەر زەمینێکی دیکەوە هاتوون، حەقیقەتەکەی فام نەکرد، مانای پەیڤەکانی دەرك نەکردو کابرای نە ناسی، بەڵام بۆنی عەتری سروش و وەحی کرد، تامی حەقیقەتی چەشت و هەستی بە گەرمی وەسف ناپەزێری ئیمان کرد.

و ئەبوزەڕ بێ تاقەتو لە ساراو بیاباندا، چاوی لە رێی مەککە بوو.

– ئەنیس! برام! ئەوت بینی؟ قسەکانیت ژنەوت؟ چی دەگوت؟ ئەم پیاوە کێ بوو؟

– پیاوێکی تەنیا بوو، و قەومەکەی لێی هەستا بوونو دەیان بوغزاند، ئەویش بە حەوسەڵەو خوێنساردو میهرەبان، هەر جارێ کۆمەڵێك دەریان دەکرد، یان بە جنێوو تەوس و توانجەوە بەجێیان دەهێشت، دەچووە تاقیبی کۆمەڵێکی دیو هەمدیس دەستی بە قسان دەکردەوە.

– بێژە ئەنیس! بێژە کە چی دەوت؟ خەڵکی بۆچی بانگ دەکرد؟

– بە خودای چەندم بیرکردەوە، قسەکانیم فام نەکرد، بەڵام قسەکانیم لەگیان شیرین بوو، دەتگوت هەنگوینەو بە دەمارەکانما دەڕوات!

ئەبوزەڕ، لە تاقیبی پەیامدا، کەڵکەڵەی زانایانەو هونەرکاری رۆشنبیرانەی نەبوو، پەرۆشو تینوو بوو، وئەنیس تاقە دڵۆپێکی لەم سەرچاوەیە بۆ نەهێنا بوو، بە پەلە هەستاو بێ ئەوەی دانیشێتو بیر لە چەندوچوونی رێی سەفەرو توێشووی سەفەر بکاتەوە، رێگەی درێژی نێوان غیفارومەککەی گرتەبەر، بە درێژایی رێگەکە، رێوێنگو سەفەرو رێگەی سەفەرو دوا مەنزڵ، هەر هەمووی (ئەو) بوو.

ئەو دەڕۆییو ئێمان دەهات! بەڵێ، ئیمان بەمجۆرە دێ، تا گەییە مەککە، پیاوێك لە خێڵی (غیفار) لە ناو قافڵەچیانو سەرمایەدارانی (قوڕەیش!)دا تاقیبی کابرایەك بکات کە ناوبردنیشی لەم شارەدا تاوانە! بە درێژایی ئەو رۆژە لە دۆڵەکانی مەککەو بازاڕو مزگەوتی حەرامدا گەڕا، نەیدۆزییەوە، شەوێ لە مزگەوتی حەرامدا نووست، تەنیاوبرسی، عەلی کە هەموو شەوێ بەر لەوەی بۆ ماڵ بڕواتەوە دەهاتە مزگەوتو توافێکی دەکردو بۆ ماڵ دەڕۆییشتەوە، ئەبوزەڕی بینی کە بە تەنیا لە عاردی خەوتووە.

– دەڵێی غەوارەیە؟!

لەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵی بردەوە، وبیٚ هیچ گفتوگۆیەك، لەوێندەر نووست!
چارەنووس چ رۆڵێك چێدەکات! ئەم ماڵە، ماڵی پێغەمبەرە. عەلی، لەم سەردەمەدا کوڕیژگەیەکەو لە ماڵی پێغەمبەرا دەژی. هەوەڵین ریٚکەوتێك لەم سەفەرەدا کە چارەنوسوی ئەبوزەڕ دیاری دەکات و ئەو یەکەمجار لە بیابانەوە ئیسلام دەبیٚ، ئەمەیە، یەکەمین کەسێك کە لە مەککەدا قسە دەگەڵ ئەودا دەکات عەلییەو یەکەم ماڵێك کە تیای دەخەویٚ ماڵی محەمەدەو یەکەم کەسێك کە لە غوربەت و تەنیایی شارا بۆ ماڵی پێغەمبەری دەباتەوە عەلییە. ئەم یەکەمین ریٚکەوت و مامەڵەو رووداوانە، سەر لەبەری ژیانی ئەبوزەڕ گەڵاڵە دەکەن و تا مردن لەگەڵیا دەمێنێتەوە.
سبەی بەیانی بۆ سۆراخی محەمەد، لە ماڵی محەمەد وەدەردەکەویٚ و بێهودە رۆژ دەگەیەنێتە شەو، شەویٚ دیسان عەلی کە بۆ تواف دیٚ، بۆ ماڵی دەباتەوەو هەمدیس سبەی بەیانی و سبەی شەو ئەمجارەیان – لە شەوی سێیەمدا– عەلی وشەیەکی دی دەخاتە سەر پرسیارە کورت و دووبارەکەی شەوانی پێشووی کە: "ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە ئەم پیاوە ناوی خۆی بلیٚ و بلیٚ بۆچی بۆ ئەم شارە هاتووە؟" ئەبوزەڕ بە پارێزەوە، رازی خۆی بە عەلی دەڵێت کە: "بیستوومە لەم شارەدا پیاوێك پەیدا بووەو..." تروسکەی زەردەخەنەیەکی خۆشی و شادی سیمای عەلی لاو روناك دەکاتەوەو بە دەنگێکی تەژیو سەرریٚژی میهرو ئاشنایی باسی محەمەدی دەگەڵ دەکات و قەراری دەگەڵ دەکات کە "ئەمشەو بۆ نهێنگەکەی ئەوت دەبەم، من لە پێشەوە دەڕۆم و تۆ بە ماوەیەك لە دوای منەوە وەرەو ئەگەر جاسوس و خەفێیەکم بینی، من دەچمە پاڵ دیوارێك و بەسەر پێڵاوەکەما دادەنەمەوە، گوایە دەمەویٚ قەیتانی پێڵاوەکەم ببەستم و تۆ ئەمە بزانەو بیٚ ئەوەی خۆت لە من بگەیەنی، درێژە بە ریٚی خۆت بدەو لە من تیٚ بپەرە، تا کە خەتەرەکە تێپەڕی ئیدی خۆم بە تۆ دەگەیەنمەوە".
رۆژانی سەختی ژیانی پێغەمبەرەو شار یەکپارچە ترس و خەتەرەو دژمنان یەك بەرەو دۆستان تەنیا سیٚ نەفەرن! وئەمشەو ئیسلام چوارەمین موسوڵمان بە خۆوە دەبینیٚ.
محەمەد،لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەڕقەمە، لە سەر تەپەی سەفای چەند هەنگاوی مەسعا. لە تاریکی ترسناکی شەوا، کوڕە لاوەکەی ئەبی تالیب، لە پێشەوەو کوڕەکەی جنادەی غیفاری لە دواوە، بە سەفادا هەڵدەگەڕێن، بەرەو لای محەمەد! ئەم دیمەنە لە تۆ وایە شانۆی جوانی بەرجەستەکردنی چارەنووسی وانە، چارەنووسێك کە بەو زووانە دەست پێدەکات.
ئەبوزەڕ هەنگاو بە هەنگاو نزیکتر دەبێتەوەو جۆش و خوڕپە دەم بە دەم توندتر، ئیمان و یەقین سەراپای فەتح کردووە، ئەو بۆ ئەوە ناچێت تا ئەو پیاوەی خۆی بە پێغەمبەر دەزانیٚ، ببینیٚ و بناسێت و تاقی بکاتەوە، ئە و ژووانی دیداری دەگەڵ خۆشەویستەکەی دڵی و مورادی ئیمانیدا هەیە، ئێستا لە دووری چەند هەنگاوی ماڵی ئەرقەمدایە. چ دەمانێکی دژوارە! تەحەمولی یەکەمین سات ودەمی دیدار قورسە، ئەشق و مەحەبەت جوندوبی راوکردووە. کوڕەکەی جنادە لە (ئەو) تەژی بووە، لەودا محەمەد زیاتر هەیە تا خۆی، دەربارەی کوڕەکەی جنادە جگە لە یادگارو بیرەوەرییەکی دوورو کاڵ چ شتێکی دی لە زەینی جوندوب دا نیە، دڵی کەوتووەتە بازنەی موگناتیسێکی بەهێزەوە، بۆنی ئاشنایەتی سات بە سات زیاترو چڕتر دەگاتە کەپوو، ئێستا

هەست بە قورسی بوونی محەمەد لەسەر سەراپای بووین خۆیەوە دەکات، ئامادەگیو حوزوری ئەو هاماجی دەوروبەری سەفای پڕکردووە، جوندوب دەزانێت محەمەد کێیە، دەزانێت چ دەڵێ، بەڵام... چۆنە؟ سیمای؟ ئەندامی؟ قسەکردنی؟ بوونی؟ چۆن لێی بڕوانێ؟ چۆن دەکارێت قسەی دەگەڵ بکات؟ چی پێ بڵێ؟ چ دەبێ؟

– سلاوت لێ بێ!

– سلاو ورەحمەتی خوات لێ بێ.

و ئەمە یەکەمین سلاو بوو کە لە ئیسلام دا کرا.

نازانین کە ئەم دیدارە چەندی خایاند، ئەگەر مێژووش باسی کردبا، هەر نەمان دەزانی، لەم کاتە شپرزانەدا زەمان کار ناکات، ئەوەی دەیزانین ئەمەیە کە کوڕەکەی جنادە چووە ماڵی ئەرقەمەوەو لەوێدا گوم بوو، لەوە بەدواوە، هەرگیز کەسێك سۆراخی نازانێ، ئیدی لە ماڵەکەی ئەرقەم نەهاتە دەرێ، جوندوبی کوڕی جنادە رۆییو لە پڕ لە لای کابەوە، لەسەر ترۆپکی سەفا، لە نهێنگەی سروش و وەحییەوە، ئاسۆی ئیسلامی بەرەبەیانی، رووبەکی سور هەڵگەڕاوی گەش هەڵهات و دەرکەوت، دەمێك وەستا، هەردووك چاوی کە لە گڕی ئاگری بیابانی گواستبووەوە، بە پەلە بەسەر دیواری کۆسارەکانی دۆڵی مەککەدا گێڕاو لەسەر بتەکانی کابە رایگرت. یەکەمجارە کە ئەبوزەڕ ئەم بتانە، ئەم رەمزی گەوجێتیانەی، کە هەموو خۆویستییەکی ئیبلیسانەی بۆ "خاوەنو پەرستدارەکان"ی دابین کردووە! بە مجۆرە دەبینێو بەسەر سامیو تورەیی لە خۆی دەپرسێت کە ئەم سێ سەدو چەند بتەی کوفرو شیرکە، لە ماڵی یەکتاپەرستی ئیبراهیم دا چ دەکەن؟

بە هەشتاو لە سەفاوە داگەڕا، تەنیا، هەڵچوو، مکوڕو موهاجیر، لە تۆ وایە محەمەدە کە لەو شەوەدا، یەکەم بڵێسەی سروش ووەحی هەڵیگرتووە، لە غار دەردەپەڕێو لە حەڕاوە نشێو دەبێتەوە، ئێژی تاوێرە کە بە زەبری بوومەلەرزەیەك لە کێو جیا بووەتەوەو بەرەو قولایی دۆڵی مەککە بۆ سەر سەری کوفرو شیرك و ڕیاو زیللەت و خەو دێتە خوارێ.

ئیسلام هێشتا لە ماڵەکەی ئەرقەمدا پەنهانە، ئەم ماڵە هەر هەموو جیهانی ئیسلامیە،و ئومەتی ئیسلام بە هاتنی ئەبوزەڕەوە گەییوەتە چوار کەس، هەلومەرجی نهێنیکاریو تەقییە بەسەر خەباتدا زاڵە، ئامۆژگاری کراوە کە بەلەز مەککە بەجێ بێڵێو بۆ غیفار بگەڕێتەوەو چاوەڕوانی فەرمان بێ. بەڵام سینەی رەق و تەقی ئەم "کوڕی بیابان"ـە لەوە بێ توانا ترە کە بتوانێ ئاگرێکی وەها لە خۆیدا وەشێرێو ئەبوزەڕ – کە بەژنی باریك و بنێسی منارەیەکە بەسەر پەرستگەی ئیمانیەوە، کە جگە لە ئەوکی هاوارێك چیتر نیە، و هەیئەتی دەڵێی هەڵچوونی شۆڕشێك بووە لە دلا هەلایساوەو تەسلیم بە بیابان بووەو لەپڕا سارد بووتەوەو بووە بە ئەبوزەڕ– ئەهلی تەقییەو نهێنیکاری نیە، ئەهلی هەڵچوونو شۆڕشە، ئەم وەزعە توانای دەوێو ئەو ناتوانێو داواو تەکلیفی خواش لە هەر نەفسێك بە گوێرەی توانای ئەو کەسەیە. لەبەردەم کابەدا، بەرانبەر بتانی ترسناكو بە سام، ولە نزیکی (دارالندوە) –ئەنجوومەنی پیرانی قورەیش– دەوەستێو جاڕی یەکتاپەرستی دەداتو باوەڕهێنانی خۆی بە پەیامی محەمەد رادەگەیەنێو رایدەگەیەنێ کە ئەم بتانە، بەردی بێ دەسەلاتنو خۆیان تاشیویانن!

ئەمە یەکەم بانگ وهاوارو بانگەوازی ئیسلام بوو، و یەکەم جار بوو کە موسوڵمانێك هێرشی کردە سەر کوفرو شیرك! پەرسڤی شیرك خۆیا بوو، مەرگ! مەرگێك کە بۆ خەڵکی دی ببێ بە پەندو عیبرەت. دەبێ ئەم یەکەمین ئەوکی هاوارە بێتە بڕین، بەلەز بەسەریا ڕژان و ئەوەندە بە ڕق و کێنەوە بەسەروچاوو سینگ و بەرۆك و لا تەنگەیاندا کێشا تا هاوارە کوفر ئامێزەکەیان بڕی، عەباس هات، مامی پێغەمبەر کە پیاوێکی سووتخۆر بوو و دەگەڵ ئەشرافی قورەیش و سەرمایەدارانی کوفرو شیرك دا هاوسنف و چین بوو، بەوە ترساندنی کە ئەم پیاوە لە خێڵی غیفارە! ئەگەر بیکوژن، شمشێرانی غیفار تۆڵە لە کاروانەکانتان دەستێنن! دەبوایە لە نێوان دین و دنیایاندا یەکیان هەڵبژێرن، مەعبود یان کالاّ؟ قیبلەی ڤیان و مەحەبەت یان قافڵەو کاروانی پولّ؟ کامیان؟

بە پەلە لێی دوور کەوتنەوە، ئەبوزەڕ وەکو پەیکەرێکی خوێناوی شکاو، لە ناوەندی بازنەی کۆمەڵێکا کە هەراسان دەیانڕوانیە دیلە تەنیاکەی خۆیان، بە زەحمەت هەوڵیدا تا هەستێت، چێوەی بازنەکە بەرینتر بوو، هەستا، خۆی پێوە گرت، ئاپۆڕاکەی چڕتر بوو، دەتگوت خۆ دەدەنە پەنای یەکتر. لەبەر ئەمەیە کە زۆروئیمان دەترسێت، ئەو کەسایەتییەکە، ئەمانە بێ شەخسیەت و کەسایەتی، هەموو بەیەك ڕەنگ، ڕەش، هەموو، تەنیا، بەلاّم هەموو بێ "هەویەت و ناسنامە"، کۆمەڵێك (سەر) و لە بەرانبەریاندا یەك ئینسان، یەك (شەخس)، کەسێك کە ئیمان ماناو جەوهەرو ماهیەتی داوەتێ و ئارمانج و ئاراستەو هێرش، و توانایەکی سەیر، پەڕجو ئاساو لە شکان نەهاتوو ئامادەی "شەهادەت" کە باوەڕ بە پیاو دەبەخشێت.

وەڕێ کەوت، خۆی گەیاندە سەر زەمزەم، و برینەکانی شت، خوێنەکانی سڕی و پاك کردەوەو سبەینێش گەڕایەوە سەر هەمان شانۆو دیسان گەیاندیانەوە شەرای مەرگ و عەباس فریا کەوت و پێی ناساندنەوە کە لە خێڵی غیفارەو جارێکی دیکە سبەی...

تا پێغەمبەر، ئەمجارە نەك لەبەر گیانی ئەبوزەڕ، بەڵکو بە فەرمان ئەم شۆڕشڤانە بێ ئارامەی لەم شارو تەنگانەومەترسییە دوور خستەوەو ڕای سپارد بچێ لە غیفار بانگەواز بکات.

ئەبوزەڕ خانەوادەکەی و بەرە بەرە هەموو خێڵی غیفاری هێنایە سەر ئاینی ئیسلام. ئە و لە غیفار بوو کە موسوڵمانان قۆناغی دژواری خەباتیان لە مەککەدا دەبردە سەرو کەوتنە هیجرەت و لە مەدینەدا لە قۆناغی تاك سازیەوە گەییشتنە قۆناغی بونیادنانی سیستەمی کۆمەلاّیەتی و دەسەجەمی و لە ئەنجامدا شەڕ دەست پێدەکات.

لەبەر ئەمە ئەبوزەڕ هەست دەکات پێویستە لە مەیداندا بێ، بۆ مەدینە دێت و لەوێ، چونکە نەشوێن و نە کاری هەبوو، لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا – کە لەو ڕۆژگارەدا ماڵی خەڵکی بووە– بارگە دەخات و لە ریزی "یارانی دالاّن"دا دەبێ بە دالاّن نشین و ژیان و بژێوی دەکات بە فیدای باوەڕوخزمەتی ڕاپەڕین، لە ئاشتیا بە هزرین و زانست و خواپەرستی و لە جەنگدا بە جەنگ! ڕای دەبوێرێ.

ئیسلام، بەرابەرایەتی پەیامبەر هەر هەموو پێداویستیە مرۆڤانی و ئاوات وئارەزووە کۆمەلاّیەتیەکانی ئەبوزەڕ دابین دەکات. ئیسلام لەسەر بنەمای "یەکتایی"، خەباتێکی دەست

داوەتیٚ کە لە سەریٚکەوە: خواو یەکسانییە، دین و نان، مەحەبەت و هیٚز، و لە بەرامبەریا: تاغوت و جیاوازی، کوفرو برسیٚتی، دینی زیللەت و لاوازیە. ئیسلام بۆ یەکەمجار کۆتایی بە ئەفسانەی ستەمکارانی تالاٚنچی هیٚنا کە دروشمی "یا خودا یا خورما"یان کردبوو بە ئیمانی خەلٚکی تا خودا بەسەر خەلٚکی داو خورماکە بەسەر خۆیاندا دابەش بکەن و پیرۆزییەکی خوایی بە هەژاریی ببەخشن، ئیسلام شۆرشیٚکی راستەقینەی دژی ئەم دیدوبۆچوونە دژە ئینسانیە، بەرپا کردو گوتی: هەژاری کوفرە، هەر کەسیٚ بژیٚوی و ئەم دنیای نەبیٚ، ئەو دنیای نیە، فەزلٚی خودا، دەسکەوتی زۆر، خیٚرو چاکەی ژیانی مادییەو "نان ژیٚرخانی خواپەرستیە"و هەژاریی و زیللەت و زەبوونی، لە هەر کۆمەلٚگەیەکدا بوو،دین و مەعنەویەت و تەقوا لەو کۆمەلٚگەیەدا درۆیە! لەبەر ئەمەیە کە پەیامبەری ئەبوزەر "پەیامبەریٚکی چەکدارە" چونکە یەکتایی و تەوحیدی ئەو فەلسەفەیەکی زەینی و رۆحی و فەردی نیە، پشتیوانەی بتەوو لە هەلٚوەشانەوە نەهاتووی یەکیٚتی نەژادی و یەکیٚتیی چینایەتیەو یەکسانی (بۆ هەر کەسە بە گویٚرەی بەشداری و مافی خۆی) — کە سەرخانی جەبری تەوحیدو یەکتاییە— تەنیا بە "قسە" نایەتەدی، "پەیام" دەبیٚ لەگەلٚ "شمشیر"دا یەك بخریٚ.

ولەبەر ئەمەیە کە ئەبوزەریش ژیانی ماددی فەردی وەلاوە دەنیٚ و "پارسایی شۆرشگیٚرانە" کە دەکاتە "زوهدی ئیسلامی"و "زوهدی عەلی" — نەك زوهدی سۆفیانەی مەسیح و بودا— دەکات بە پیشە تا بۆ خەلٚکی ژیانی ماددی و یەکسانی و بەرانبەری ئابووری فەراهەم بکات، هەر کەسیٚك دژی برسیەتی خەلٚکانی تر بوەستیٚ دەبیٚ برسیٚتی خۆی قەبولٚ بکات و کەسیٚك دەتوانیٚ ئازادی بە کۆمەلٚگەی خۆی ببەخشیٚت کە چاوپۆشی لە ئازادی خۆی بکات. لەبەر ئەمە بوو کە ئەم ئاینە شۆرشگیٚرییە، ئەم ئاینی "هەم خودا، هەم نان"ـە،ئاینی "نە زەبوونی و رەهبانیەت و کلٚۆلی وبیٚگانەگی لە تەبیعەت و ئاخیرەتی ژیانی ئینسان لە تەبیعەتدا"، کە ئاینی "بە خودایی کردنی ئینسان لە تەبیعەتدا"، "خەلیفایەتی خوایی ئادەمیزاد لە جیهانی مادی دا!"و رابەرەکانی و لەپیٚشی هەموویانەوە، پەیامبەرەکەی، هەموو لە مزگەوتا، مالٚی خوا —خەلٚکی—دا دەژیان! محەمەد، عەلی و یارانی دالاٚن: سەلمانەکان و ئەبو زەرەکان...!

ئەبوزەر، هیٚندە بە سەکۆی دالاٚنی گۆشەی مزگەوتەکە رازی بوو شای بە سەپان رانەدەگرت. بوو بوو بە یەکیٚك لە دۆستە هەرە گیانی بە گیانیەکانی پیٚغەمبەر. "هەر کاتیٚ لە کۆمەلٚیٚکا دیار نەبا لیٚی دەپرسی، هەر کاتیٚ لەویٚبا لە قسەکردنا رووی تیٚدەکرد". لە غەزوەی تەبوك دا کە "سوپای تەنگانە" بە رابەرایەتی پەیامبەر دەبوایە بە بیابانی گەرمی باکورا تیٚ بپەریٚ و بگاتە سنووری رۆم، ئەبوزەر دواکەوت، وشترە لەرە مردەلٚەکەی ماندوو بوو، پەکی کەوت، لە ژیٚر بارانی ئاگردا بەرەلٚلاٚی کردو بە تەنیا وبە پای پیادە وەریٚ کەوت! لە گۆشەیەکا ئاوی دۆزییەوە هەندیٚکی لیٚ هەلٚگرت تا بیگەیەنیٚتە دۆستەکەی "کە بیٚگومان ئەویش لەم بیابانەدا تینووی بوو".

پەیامبەرو موجاهیدەکان سەیریان کرد لە قولاٚیی بیابانی ئاگرەوە، تارماییەك دیٚتە پیٚشیٚ، بەرە بەرە هەستیان کرد کە ئەم تارماییە، ئینسانە! کیٚیە؟ بە پای پیادەو لەم چۆلٚی قولٚفەیەدا بە تاقی

تەنیا؟ پەیامبەر بەوپەڕی شادیو تاسەوە هاواری کرد: "خۆزیا ئەبوزەڕ بێ!" سەعاتێ بوری، ئەبوزەڕ بوو، کە گەییە موجاهیدەکان لە تینویەتی و شەکەتیدا کەوت:

– ئاوت پێیەو تینووتە ئەبوزەڕ؟"

– گوتم لەم بیابانەداو لەم هەتاوەدا، تۆ....

– رەحمەتی خوا لە ئەبوزەڕ، بە تەنێ رێ دەکات، بە تەنێ دەمرێو بە تەنێ زندوودەبێتەوە"! ئەم رۆژانە بورین و پەیامبەر رۆیی! لە ناکاودا "ئەو بایانەی کە بەند کرا بوون، لە هەموو لایەکەوە بەربوون"و عەلی، ئاوێنەی روحی ئەم شۆڕشە، خانەنشین کرا. نیشانەی ئەوە بوو کە هەمدیس عەدالەت لە دین جیا دەکرێتەوەو نیشانەی ئەمە بوو دەبێ هەمدیس جەماوەر لە مەیدان دوور بخرێتەوەو مەزەب جارێکی دی بکەوێتەوە دەستی خەواس و بژاردەی روحانیەتو ئەشرافیەتو حاکمیەت، بۆیە عەلیو ئەوانەی دەوروبەری، ئەبوزەڕ، بابایەکی سارانشین، بیلال، بێگانەیەکی بێ کەسوکار کە کۆیلەیەکی حەبەشی بوو، و سەلمان، کە کابرایەکی عەجەمیو کۆیلەیەکی ئازادکراو بوو، سوهەیب، غەوارەیەکی لە یۆنانەوە هاتوو، و عەمار، بابایەکی دوورەگەی دایك قولەڕەشو باوك عەرەبی باشوور، مەیسەمی دەسکورتی خورمافرۆش.. کە لە نزیکانی ئازیزی رابەری شۆڕشی ئیسلامی بوون، لە مەیدان دوورکەوتنەوەو "گەورە سەحابان": عەبدورەحمانی کوڕی عوف، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس، خالیدی کوڕی وەلید، تەڵحە، زوبێرو ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان کە هەر هەموویان لە ئەشرافیەتی جاهیلی لە رژێمو سیستەمی جاهیلیەتدا بەرخوردار بوون، رابەرایەتی بزووتنەوەکەیان گرتە دەست و خۆیان بەسەر کۆمەڵگەدا سەپاندوو تاقمێکی یەکگرتووی سیاسیان هێنایە ئاراوە.

ئەم بادانەوەو وەرچەرخانە تونـدو کوتوپڕەی ئیسلام، بەلای "راست"دا –کە بە "نیمچە کودەتایەکی ریفراندۆمی" لە سەقیفەدا دەستی پێکرد– لە سەردەمی ئەبوبەکردا تەنیا لایەنی سیاسی"١٢" هەبوو، و لە زەمانی عومەردا لایەنی ئابووریشی پەیدا کردوو موسوڵمانان لە رووی وەرگرتنی موچەی دەوڵەتیەوە بەسەر چینی جیاوازدا دابەش کرانو ئەمە تەنانەت ژنانی پێغەمبەریشی گرتەوەو دابەش کران بەسەر ئازادو کەنیزەدا! کە ژنانی ئازادی پێغەمبەر ئیعترازیان گرتو ئەم ئیمتازەیان قەبوڵ نەکرد، بەڵام لە رژێمی عوسماندا ئەم رەوتە گەییە لوتکەو کۆمەڵگە بوو بە کۆمەڵگەیەکی چینایەتیو ئەشرافیەت، دەسەڵاتی رەهای گرتە دەست و فتوحاتی ئیسلام لە رۆژهەڵاتو رۆژئاوادا، کە سەرچاوەێن ئابووری، دەسکەوتی جەنگیو هەروەها پۆستێن رامیاریو کارگێڕی بێ شوماری لە ماورا ء النهری ئێرانەوە تا باکوری ئەفریقا، خستە ژێر دەسەڵاتی رژێمی مەدینەوە، یارانی پێغەمبەرو موجاهیدانو موهاجیرانو ئەنساری لە شێوەی پارتیزانانی شۆڕشگێڕی ئایدولۆژییەوە، گۆڕی بۆ سیاسەتوانانو دەسەڵاتدارانو سەرمایەداران، و(چینێکی دەسەڵاتدار)ی لەوانە دروست کرد کە بە زۆری پارسایانی هەژارو پابەندو خەباتکار بوون (١٣)و لێشاوی ئەو دەسکەوتانەی کە بە شێوەی دەسکەوتی جەنگ، زەکات، وجزیە لە ملیونان موسوڵمانو کافر وەردەگیراو دەڕژایە مەدینەی هەژارەوە، "چینێکی بورژوازی تازە"ی پێك هێنا کە نەك هەر مەدینەی ئیسلامو ئومەتی موسوڵمانو موجاهیدانی

غەزاکانی بەدرو ئوحد، بەڵکو ناوەڕۆکی ئیسلامو ئاراستەو لایەنی کۆمەڵایەتی و لە ئەنجامدا دیدو جیهانبینی ئاینی گۆڕیو ئیسلامی لە شێوەی (ئایدیۆلۆژیایەکی) شۆڕشگێڕەوە بۆ (ئاینێکی دەوڵەتی) گۆڕیو ئەم وەرچەرخانە کە لە سەقیفەوە بە دەستە راستدا داشکا لە ماوەی کەمتر لە چارەکە سەدەیەکدا (هەمان چارەکە سەدەی کە عەلی تیایا خانەنشین بوو. جەبری سیاسەت ناچاری کرد بوو کە لەم سالآنەدا کە مێژووی ئیسلام گەلآلە دەبوو، لە یە نبوع دا کشتکاری بکات یان لە ماڵی خۆی دانیشێتو خەریکی نووسینەوەو تۆمارکردنی قورئان بێ — چونکە ترسی ئەوەشی لادروست بوو بوو) گەییە ئاستێك کە ئەمانە سیمای دیارو نمایندەی سیاسەت و فیکری ئیسلام بوون، معاویە، کە سەربەخۆیی خۆی هەبوو، مەروانی کوڕی حەکەم کە لە دوورخراوەکانی پێغەمبەر بوو، کەعبول ئەحبار، کە کۆنە روحانیەکی جولەکە بوو و تازە بوو بوو بە ئیسلامو بوو بوو بە رۆحانی ئیسلامو خەلیفەی پێغەمبەر —عوسمان— تەفسیرو شرۆڤەی قورئانی لە و دەپرسیو تەفسیری عەلی و ئەبوزەڕی بە نا دروست دەزانی!.

عوسمان،بۆ پینەکردنو پاکانەی سیستەمە سیاسیو ئابوورییە تازەکەی خۆی، کە کۆپییەکەی ساختەی سیستەمی حکومەتی خوسرەوی ئێرانو قەیسەری رۆم بوو، هەوڵێکی ریاکارانەشی نەدەدا، رەنگە لەبەر ئەمە بووبێ کە لەو رۆژگارەدا ئەم جۆرە کارە کاریگەر نەبووبێو بێهودە بوو بێ، چونکە هەم خەڵکی بەچاوی خۆیان دیتبوویان کە رژێمی حکومەتی ئیسلامی چۆنەو هەم کارەکەی عوسمان لەوە ریسواتر بوو کە بتوانن پینەیەکی نیمچە ئیسلامی بکەن.

عوسمان، داهێنەری لیستێکە لەو بیدعەتانەی کە "بۆ یەکەمجار" لە ئیسلامدا روو دەدەن، بۆ یەکەمجار وەکو رابەر دەبێ بە کۆشك نشین، بۆ یەکەمجار گاردی فەرمی زێرەڤانی دادەنێ، بۆ یەکەمجار دەستوپێوەندی تایبەتی پەیدا دەکاتو بۆ یەکەمجار، پەردەدار دادەنێو بۆ یەکەمجار پەیوەندی جەماوەری رەمەکی مەردم دەگەڵ خەلیفەدا بە شێوەیەکی نا راستەوخۆ دەبێت، بۆ یەکەمجار بەیتول مال دەخرێتە ژێر دەسەڵاتی خەلیفەو کلیلداری بەیتول مال بۆ مزگەوت دێت و بە خەڵکەکە، کە خاوەن بەیتول مالن دەڵێت چونکە خەلیفە دەست لە کاروبارم وەر دەدا، من کلیلەکەتان وێدەدەمەوەو واز دێنم، ئیدی خۆتان دەزانن، بۆ یەکەمجار زیندانیی سیاسی پەیدا دەبێ،و بۆ یەکەمجار موسوڵمانانێك لەسەر رەخنە لە رێبازی خەلیفە یان کاربە دەستەکانی دەخرێتە ژێر چاودێری، بۆ یەکەمجار دوروخستنەوەی سیاسی روو دەدا، بۆ یەکەمجار ئینسانێك لەلایەن حکومەتو دەسەلآتەوە ئەشکەنجە دەدرێ (عەبدوڵلای کوڕی مەسعود)، بۆ یەکەمجار، قورئان دەکرێ بە دەستاوێزی عەوام خەڵەتێنی سیاسی، بۆ یەکەمجار دەسەلآتداران دەست دەخەنە چارەنووسی خەڵکی و لە مەسئولیەتی یاساییو ئیسلامی تەبرێ دەبن، بۆ یەکەمجار پەیوەندی خزمایەتی دەبێ بە پەیژەی تەرەقیو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو بۆ یەکەمجار، پۆستە گەورەکان دەکرێن بە پۆستی تایبەتیو بۆ ئەندامانی باندی سیاسی سەر بە خەلیفە تەرخان دەکرێنو بۆ وەرگرتنی پۆست وپایە، پێوەری ئیسلام و تەقوا پاشەکشە دەکاتو خزم خزمێنەو سیاسەت جێی دەگرێتەوە، بۆ یەکەمجار چەوسانەوەی چینایەتی، ناکۆکیو جیاوازی نەژادی، سەرمایەداری (کەنز)و ئەشرافیەتو بەهاێن جاهیلیو روحی خێڵایەتیو

پێوەری تەمەن و پیری و سەروەت ونەژادو ڕەچەڵەك و شەخسیەت پەرستی و تایفەگەرایی، بەسەر برایەتی ئیسلامی و بەهاێن مەعنەوی و یەکسانی کۆمەڵایەتی، ئیمتیازێن ئابوری و حقوقی بەسەر تەقواو پارسایی و پێشینەی جیهادو نزیکی لە پێغەمبەرو عیلمی قورئان و لیاقەت و لێهاتوویی فەردی دا زاڵ دەبێت و روحی "حکومەت" (سەرۆکایەتی)، بەسەر "ئیمامەت" (رابەرایەتی) و سیستەمی "محافەزەکاری" بەسەر "بزاڤی شۆڕشگێڕی"داو "ئەنانیەتخوازی ئاینی و ئینسانی و ئابووری و سیاسی" بەسەر "مەمردومگەرایی بەرابەرانە و ئازادی ئیسلامی"دا -کە تیایدا تاکێکی ناو بزر، تەنانەت لە دیاری کردنی چارەنووسی سیاسی کۆمەڵگەدا، بە هەمان ئەندازەی شەخسی خەلیفە مەسئولیەت و هەقی تەدەخولی هەبوو، و هەر بە هەمان پێودانگ بوو کە گەورە سەحابان، و بە شێوەیەکی گشتی، بەرژەوەندبازی بەسەر حەقیقەت پەرستی و سیاسەت بەسەر خەبات و دروشمێن ئیسلامی بەسەر حەقیقەتێن ئیسلامی داو "سەحابانی گەورە" بەسەر "باوەڕداران"و "چین" بەسەر "ئومەت"و "دارول خەلافە" بەسەر "مزگەوت"و "ئەشرافیەتی خێڵەکی" بەسەر "شەرافیەتی ئینسانی"و "جاهیلیەتی کۆن" بەسەر "شۆڕشی تازە" و "بیدعەت" بەسەر "سوننەت" و خۆلاسەی کەلام "ئەهلی بەیتی ئەبوسوفیان" بەسەر "ئەهلی بەیتی محەمەدا" سەرکەوت و لە ئەنجامدا عەلی چەك کرا! و ئەبوزەڕ! کە بە خەمبارییەوە شکستی عەلی لە هەڵبژاردنی ئەبوبەکرو دانانی عومەردا تەحەمول کرد، ئەمێستا کە هەموو شتێك گۆڕاوەو زۆروزێڕو ساختەکاری لە ژێر پەردەی سپی خەلافەتی پێغەمبەراو لە پشت پەردەی جوانی یەکتایی و تەوحیدەوە- بەسەر خەڵکیدا- کە هەمیشە قوربانی و گۆری ئەم سێینە شوومە بوونە- سەپێنراوە، ناتوانێ چیتر بێدەنگ بێ. بایەخی کاری ئەبوزەڕ تەنیا ئەمە نیە کە لە هەنبەر نەهەق و چرووکدا، بەرگری لە هەق کردووەو لە هەنبەر کوفردا لە دین و لە بەرانبەر داگیرکەردا، لە هەق و لە خاوەن هەق و لە دوا ئەنجاما لە هەنبەر کەچڕەوی و لادانا، بەرگری لە راستی کردووە، بەڵکو ئەوەی ئەو لە هەموو شۆڕشگێڕو موجاهیدەکانی دی جیا دەکاتەوەو بەرجەستەیی تایبەتی پێدەبەخشێت، ئەو رەوت وئاراستە وردودروستە بوو کە لە خەباتا هەڵی بژارد. ئەوە بوو کە بە زەبری هەڵسەنگاندنی دروست، هۆی سەرەکی هەموو لادان و کەچڕەوییەکانی دۆزییەوەو نیشانی دا ئەم کوفرە، ئەم حەقەو ئەم لادانە چییە؟ و لە چییەوە هاتووە؟ لە خەباتیا پشتی بە پرەنسیپانی گشتی و زاراوەێن تەمومژاوی و دروشمێن لاوەکی و پرسێن زەینی و پێویستی و دەردو ئامانجێن ئایدیالیستی خەیاڵپەرستانە، فەیلەسوفانە، عولەماییانە، ئەخلاقی، کەلامی، جەدەلی، سەرڤە سەرڤە، کەچڕەوانە،و حەساسیەتێن رۆشنبیرانەی زەینی وهەستیاریی فەیلەسوفان وعارفان و شارەزایان وئەهلی کەلام - کە پاشان هەموو کێشماکێش و خەباتەکانی ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی بۆ ئەم ئاقارانە راکێشرا، تا هەردوو دروشمی سەرەکی "ئیمامەت" و "عەدالەت" لەبیر چوونەوە- نەبەست، ئەنجامی لە جێی هۆ دا نەنا، ئەوەی نیشان دا کە "پێویستە لە کوێوە دەست پێ بکرێ" و دیاری کرد کە پێویستە دەمە تیژەکەی خەبات بکرێتە کوێ و ئەوەی دەرخست و فێر کرد کە ململانێی کەچڕەوانەو لاوەکی و لنگەو قوچ و هەڵە تا کوێ خەبات دژی دژمن رێك بەرەو ئەو هەمان ئەو مەیدانانە دەبات کە دژمن

دەیـەویٚو دەکاتـە کارێك کـە ئەگـەر سـەرکەوتنیش بـە دەسـت بیٚ، هـیچ دەردێك دەرمـان ناکـاتو دژمن هیچ زەرەرو زیانێك نابینیٚ.

هێڵـی سـەرەکی خـەباتی خـۆی، بـۆ دژایـەتی جیـاوازی چینـایەتی، لـە ڕای چەسـپاندنی عەدالـەتدا تەرخان کرد. چونکە ئەم دوو دروشمەش ئەوەندە بەربڵاوە کە خەلیفـەش دەتـوانیٚ ڕای بگەیـەنیٚو لــە ڕێگــەی دامو دەزگــا بانگەشــەییەکانی خەلافەتــەوە، واتــە لــە ڕێگــەی مینبــەرو محــرابو کاربەدەسـتانی ڕاگەیانـدنی ئیسـلامی فـەرمی حوکمڕانـەوە، فەرموودەبێـژانو بانگەشـەکارانو واعیزانو شرۆڤەکارانو زانایـانو فەیلەسوفانەوە... بـە جـۆریٚ ئاراستەو ڕاڤـە بکـریٚ کـە لـە کـارو کەڵك بکەویٚ (وەکو چۆن لە شیعەگەرایی سەفەوی دا، ئیمامـەت و عەدالـەتو عاشـوراو شـەهادەت و غەسپ و ولایەتو باوەڕ بـە ڕزگارکـەری چاوەڕوان کـراو.. وای لێهاتوهـەر قاوغەکـەی مایـەوەو زۆریـش ڕتـوش کـرا، و ناوەڕۆکەکـەی پـوچ بـووەوەو پـڕ بـوو لـە ژەهـرو بـوو بـە دەرمـانی خـەوو خورافـە). ئـەوە بـوو کـە ئـەبوزەڕ –وەکـو دەرسـێکیش بـۆ ئەوانـەی کـە مینـاکی ئـەو هەوڵـدەدەن ئیسلامیان "ئیسلامێکی عەلی ئاسای محەمەد" بیٚ– گەڕایەوە سـەر قورئـان و دروشمـی خـۆی لـە قورئانـەوە وەرگـرت: *(... والذين يكنـزون الـذهب والفضـة ولا ينفقونهـا فـي سـبيل اللـة فبشـرهم بعذاب اليم، يوم يحمي عليها فـي نـار جهنم فتكوى بهاجباههم و جنـوبهم و ظهورهم هذا مـا كنزتم لا فنسكم فذوقوا ما كنتم تكنزون. سورة التوبة، الايات ٣٤- ٣٥) [... ئەو کەسانەی زێڕو زیو کۆدەکەنەوەو لە ڕای خودا بەختی ناکەن، تۆ لەو ئازارە بەژانەی تووشی دێن ئاگاداریان کە. ڕۆژیٚ کە ئەم زێڕو زیوە بە ئاگری جەهەندەم سوور دەکرێنەوە، تویٚڵو کەلەکەو پشتیانی پیٚ داغ دەکریٚ: دەردی ئەو شتە بچێژن کە بۆ خۆتان سەر یەکوونان. سورەتی تەوبە، بەشێك لـە ئایـەتی ٣٤ و ئایەتی٣٥ ].*

کەنز، هەر "گەنج"ـە فارسییەکەیە، کراوە بە عەرەبیو بووە بـە چـاوگ، واتـە سـەرمایەداری، زێڕو زیو، ڕەمزو نیشانەی سەرمایەدارییە. انفاق لـە (نفق)ـەوە هـاتووە و بـە مانـای "قۆرتـە" کـە وەکـو فرمـان بـەکار بـراوە، پێچـەوانەی مانـا هەوەڵێنەکـەی خـۆی دەگەیـەنیٚ، واتـە لابـردنو سـڕینەوەی قۆرت و بۆشاییو ئاشکرایە کە لێرەدا مەبەست لەو قۆرتەیە کە لە ئەنجامی سەرمایەداری (کنز)و چەوساندنەوەی ئابورییەوە لە کۆمەڵگەدا پەیدا دەبیٚو مەبەست قۆرتی چینایەتیو نا هەمواریو نا یەکسانی سروشتی ئاستی ژیانی کۆمەڵایەتیە (جیاوازی چینایەتی)، و سبیل اللـه، لـە زمـانی ئیسلامدا –نەك موسوڵماناندا– مەبەست سبیل الناس...ـە، واتـە ڕای خـوا، دەکاتـە ڕای خـەڵکی، چونکە لە هەموو ئەو ئایەتانەدا کە باسی مەسەلە کۆمەڵایەتیەکانو باسـی ڕیزبەنـدی کۆمەڵایـەتی (نەك ئایدولۆژی) اللەو الناس، خواو خەڵك جێـی یـەك دەگرنـەوە، خـوای ئیسـلام نـەزرو قوربـانیو دوکـەڵو داری عـودو بخـور سـوتاندنو.. تایبـەتی خـۆی نیـە، ئـەوەی تایبـەت بـە خەڵکییـەو بـۆ کۆمەڵگەیە (لـە هەنبـەر تـاك) دەبێتـە تایبـەت بـە خـواو بـۆ خـوا، (ان تقرضـوا اللـة قرضـا حسـنا... سورة التغابن، الاية ١٧) واتە ئەگەر ئێوە وامیٚ ڕەوا بە خەڵکی بدەن. سبيل اللـه، مـال اللـه، بيـت اللـه، حكم اللـه، يـد اللـه، للـه، الى اللـه... هـەمووی لـە کۆمەڵگـەداو لـە بـاری پراتیکییـەوە دەکاتـە،

**ڕێگەی خەڵکی، سامانی خەڵکی، ماڵی خەڵکیو** (ان اول بيت وضع للناس للذي ببكة مباركا= كعبة... سورة ال عمران)

***[یەکەمین ماڵ کە بۆ مەردم سازکراوە، هەر ئەوەیە وا لە مەککە، کە زۆر بە پیت و پیرۆزەو نیشانگەی خودا ناسینە بۆ هەموو خەڵکی دنیایە. سورەتی ئالی عیمران، ئایەتی ٩٦ ].***
**دەسەڵاتو حکومەت خەڵکەو لە دەستی خەڵکدایەو بۆ خەڵکەو روو لە خەڵکە... چونکە، مەردم خانەوادەی خوانو ئەوانەی کە واهی تیَ ناگەنو بەلایانەوە زەحمەتە کە باوەڕ بەمجۆرە دیدو بۆچوونە بکەن، لە ژێر کاریگەریی جیهانبینییەکی ئیلاهیو شێوە وەسفێکدان کە ئاینانی دی دەربارەی خودای خۆیان نیشانیان داوەو خستوویانەتە روو.**
**ئەبوزەڕ، وەکو یاوەرێکی نزیك ودڵسۆزی پەیامبەرو بەو مۆڵەتەوە کە خودی پێغەمبەر پێی دابوو، بەوحیسابەی "کەسێکە هێندەی زانست کۆکردەوە کە لێی دەرژا" و "نە ئاسمانی کەوە سایەی خستووەتە سەر پیاوێکی راستگۆتر لە ئەبوزەڕو نە زەوی لێڵ و تاریك وێنەی ئەوی لە خۆ گرتووە" و "شەرم و پارسایی ئەبوزەڕ، وەکو عیسای کوڕی مەریەمە" و "ئەبوزەڕ لە ئاسمانانندا ناسراوترە تا لە زەوی!" "ئەبوزەڕ لەسەر رووی ئەم زەمینەو لەم کۆمەڵگەیەدا، بە تەنێ رێدەکات، بە تەنێ دەڕواتو لە بیابانی قیامەتدا، کە گۆڕستانەکان دەکرێنەوەو قالۆرو ئێسکەپەیکەران دەستە دەستە دەژێنەوەو زندوو دەبنەوە، ئەبوزەڕ، بە تەنێ لە گۆشەیەکی ئەو بیابانەدا زندوو دەبێتەوەو دێتە مەیدان!".**
**لە مزگەوتدا دادەنیشت و لێکدا لێکدا ئەو ئایەتانەی کە بە پراکتیکی تەرك کرا بوون و ئەو پرسو مەسەلانەی کە لە قورئانو لە ژینی پێغەمبەردا هەبوونو نەدەخرانە روو و باسکردنیان سەریەشەو گرفتانی چێدەکرد! بۆ خەڵکی دەخوێندەوەو باس دەکرد. باسی رۆژ – لە سەردەمی عوسماندا– باسی تۆمارکردنی قورئانو رێکخستنی قورئانو راستکردنەوەی دەستنووسەکانی قورئان و ئامادەکردنی نوسخەیەکی راستکراوەی ئەسڵی قورئانو باسێن بێ بڕانەوەی خوێندنەوەو تەجویدو تەقتیعو ئیعرابو خاڵبەندیو خوێندنەوەو بە دەنگەوە خوێندنەوە بوو، و کێشماکێش و گەنگەشەو حەساسیەتو دژایەتیو تەبایی.. و ئەبوزەڕ باسی (کەنز-کۆکردنەوە)ی لە قورئانەوە دەرهێنا بوو هەر سا نا ساتێ ئایەتی کەنزو ئایەتەکەی پێشی دەخوێندنەوە کە دەڵێت:**
***(.... مەلا چاك ورەبەنەکانی ئەوانە، بەشی زۆریان – لە هەوانتە– ماڵی ئەو خەڵکە دەخۆنو رێی خوداشیان نیشان نادەن... سورەتی تەوبە، بەشێك لە ئایەتی ٣٤).*** **واتە "زۆربەی روحانیانو رابەرانی مەزەبی جولەکەو مەسیحیەت، بە ناهەق ماڵی ئەو خەڵکە دەخۆنو رێی خوداشیان نیشان نادەن: واتە فاکتەرو سەبەبکاری کەسادو کەچڕەویو گومڕایین".**
**و ئەم سەنگەرگیرییە دەبووە مایەی ئاژاوەو فەرتەنە، خەلیفە بە خۆی مژولی کۆکردنەوەو نوسینەوەی قورئان بوو و باوەڕداران بە قورئان، سوپاسگوزاری ئەو بوونو یادی قورئان دەبووە مایەی یادی خێری خەلیفەو قورئانەکەی ئەبوزەڕ بە رەشبینی و توڕەییو رەخنەو دژایەتیو مەحکومیەتی خەلیفە لێك دەدرایەوە، بە رادەیەك کە دام ودەزگای خەلافەت هاواری لیَ بەرز**

بـووەوە کـە: ئـەبوزەڕ! مەگـەر قورئـان تـەنیا ئـەم ئایەتـەی "مـاڵ خـواردنی خـەڵکی لەلایـەن روحانیانەوە"و هەر ئایەتی "کەنز"ی تیایە؟

و ئەبوزەڕ دەیزانی کە هەر سەردەمێك دەردێکی هەیەو هەر نەسلێك دروشمێك ،و ئـەوەی قورئـان، نـەك بـە (بەشـتێکی موفـەڕك) بـەڵکو بـە (نـورو هیدایـەت) دەزانـێ، دەبـێ پشـت بـە "ئایـاتی ڕۆژ" ببەسـتێ، و ئـەبوزەڕ وەڵامـی دایـەوە:، سـەیرە! خەلیفـە خوێنـدنی قورئـانم لـێ قەدەغـە دەکـات؟و پاشماوەی ئەم ئایەتە کە ئایـەتی ڕۆژ بوو –چونکە ئێسـتا ئیدی سروش، یـەکتایی ئایـدولۆجی، بت پەرستی، قیامەت، بەقای روح و پێغەمبەرایەتی محەمەد، "پرسیار" نیـە، پرسیار، هەڤدژی و جیاوازی چینایەتیە– دەیکردە باسی رەفتاری پێغەمبەرو گێڕانەوەی گوتاری پێغەمبـەر، ئـەویش بە گوێرەی ئەوەی کە لە کۆمەڵگەدا جێی پرسیارە:

"بە مانگان لە ماڵی پەیامبەری خودادا دووکەڵ بەرز نـەدەبووەوە"، "خـواردنی هـەرە بـاو لـە مـاڵی پێغەمبـەری خـودادا ئـاوو خورمـا بـوو". "نیـوەی ماڵەکـەی پێغەمبـەر بـە لم و قـومی نـەرم فـەرش کرابوو" "ئەو خـۆی لـە برسییەتیدا تـاقی دەکردەوە،و زۆرجـار بـەردی لەسـەر سکی دەبەسـت تـا بەرگـەی ئـازاری برسـیەتی بگـرێ"، "جـل و بـەرگ و خـواردن و خانـەی، دڵخۆشـی ئێمـەی دالآن نشینانی مزگەوتی دەدایـەوە، بـێ مـاڵ و حـاڵ بووینو زۆربـەی کـات برسـی بووین، هـەر شـەوەی تاقمێکمـان نانمـان لەگـەڵی دەخـواردو ئـەویش هـەر جـارێ خـواردنێکی کولاوی دەماڵیـدا هەبوایـە میوانداری دەکردینو ئەم خواردنە، کـە یـەك و سـۆس بـوو، سـەپکەی ئاردی جـۆو خورمـا!" "هـەر ماڵێ کۆبکرێتەوە دەبێتە ئاگرو دەچێتە گیـانی خاوەنەکـەی". "هاوسـەرانی پێغەمبـەر زۆر جـاران لە برسێتیو نەبوونیا دەیان ناڵاندو سکالایان دەکردو ئەویش شەرتی دەگەڵا دەکردن یـان دنیـاو تەڵاق بخوازن یان منو هەژاری"." پێغەمبەری خوا، تاقـە کیـژە خۆشەویسـتەکەی، کـاری دەکـردو برسێتی دەچەشتو داوای عەلی کیژەکەی –کە خۆشەویست ترین خەڵقی خوا بوون لـەلای ئـەو– کە خزمەتکارێکیان بداتێ، رەت کردەوەو بۆ هەژاری زەهرا گریا، بەڵام تاقە دینارێکی نەدایێ"...

ئاشکرایە کە ئەم پرسیارە دەکراو دەکرا: ئەی بۆچی خەلیفە عوسمان خـەز لەبـەر دەکـات؟ لـە دارول خەلافـەدا بـە خۆشـترینو ناسـکترین خۆراکـان سـفرە دەڕازێنێتـەوە؟ ئـەدی بۆچـی عەبدورەحمانی کوڕی عوف کە سەرۆکی ئەنجوومـەنی هەڵبـژاردنی خەلیفـە بـوو و عوسمـانی کـرد بە خەلیفە، کاتێ میراتی وکەلەپورەکەیان لەسەر یەك کەڵەکە کـردووە ئەوەنـدە بـەرز بووەتـەوە کـە خەلیفەو خەڵکەکە چاویان لە یەکدی نـەماوە، لـە کاتێکـا خەلیفـە لەسـەر مینبـەر بووەو خەڵکەکـە دانیشتوون، قاڵبە زێڕەکانیان بە مەبەسـتی دابەشـکردنی میـرات بـە تـەور دەشـکاند؟ ئەدی بۆچـی زوبێـر کـە ئەنـدامی ئەنجوومـەنی خەلافـەت بـوو، هـەزار کۆیلـەی هەیـەو کـاری بـۆ دەکـەنو ڕۆژانـە کرێکانیان دەدەن بەو؟ ئـەدی بۆچی معاویـە، خـزم و سـتانداری خەلیفـە لـە شـام، کۆشـکی کەسـك دروست دەکات؟ دەوروبەرەکەیو ئـەو ریابێـژو شـاعیرو زانـاو هاوەڵانـەی کـە پشـتیوانی لێدەکـەن، خەڵاتی ئەفسانەیی دەکاتو ئەدی بۆچی عوسمان کە شەرتی کرد بەپێی کتێبی خـواو سـوننەتی پەیامبـەرو ڕێبـازی دوو خەلیفەکـەی پێشـوو بـڕوات، تـەنیا لەسـەر سـونەتی قەیسـەرو خوسـرۆ دەڕوات؟ ئەدی بۆچی؟ ئەدی بۆچی؟

ڕۆژ بە ڕۆژ ئەشرافیەت و چەوسانەوەو تەخشان و پەخشانکاریو هەژاریو مەودای بۆشاییو جیاوازی کۆمەڵایەتیو چینایەتی زیادی دەکردو بانگەشەو بانگەوازەکانی ئەبوزەڕیش زیاتر گەشەی دەکردو دەنگی دەدایەوەو هەژارانو چەوساوانی پتر دەهاڕوژاندو برسییان لە ئەبو زەڕەوە فێردەبوون کە هەژاری ئەوان خواستی خواییو چارەنووسو حوکمی قەزاو قەدەری ئاسمان نیە، بەڵکو ئەنجامی(کەنز)وسەروەتداریو سەرمایەدارییە و بەس!

چ بکرێ باشە؟

دەگەڵ ئەبوزەڕی پارسادا هیچ کارێ ناکرێ!

نە "هەیەتی" تا هەڕەشەی لێ بکەن کە: "لێت دەسەنین!" نە "دەیەوێ" تا تەماحی بخەنە بەر کە: "وێت دەدەین!"و هاوسەرەکەشی، داکی زەڕ، ئەویش لە سەحابانی پێغەمبەرەو هاوکاری مێردەکەی لە تەحەمولی دژواریو پارسایيو هەژاریدا کە بەشی مرۆڤی خەباتکارە، دەکات. چونکە، لەو زەمانەدا کە ئیسلام هەبوو، ژن هێشتا نەبوو بوو بە زەعیفە!.

خەتەر لە جەرگەی مەدینەوە کەڵبەی نیشان دەدا، ئەو هەژارانەی کە لە بەرانبەر سیماێن موقەدەسی موهاجیرانو گەورە سەحابانی پێغەمبەرا، کە ئێستا دەسەڵاتدارو حوکمڕان بوونو دەوڵەمەند بوو بوون، ڕەنجی خۆیانو لادانی ئەوانیان تەحەمول دەکرد، دلێرو گوساخ بوو بوون. عوسمان هەستی بە خەتەرەکە کرد، چ بکات؟ مەدینە هێشتا پێغەمبەری لە یادەو خەڵکەکە ئەبو زەڕ دەناسن.. بۆ شامی دوورخستەوە، بۆ لای معاویە، خەڵکی شام لە سەرەتاوە ئیسلامیان بەهۆی بەنی ئومیەوە ناسیوە، دەستی معاویە بەسەر ئەبوزەڕا کراوەترە. لە شامدا معاویە بە چاولێکەری ڕۆمیان ژیانێکی ئەشرافی تری لە عوسمان دروست کردبوو و جیاوازیو دژایەتیو ناپاکیو زوڵم و سەرپێچی کردن لە سیستەمی ئیسلام ئاشکراترو بێ شەرمانەتر بوو. لەم ڕۆژانەدا بوو کە معاویە بەکۆمەکی تەلارکارانی ڕۆمیو ئێرانی "کۆشکی کەسک"ی دروست دەکردو ئەمە یەکەمین کۆشکی جوان و ڕازاوەی پاشایەتی بوو، و معاویە هێندە دڵی بە تەواو کردنیەوە بوو کە زۆرجار بە خۆی دەچووە دیار کرێکارو تەلارکارەکانو ئەبوزەڕیش هەموو ڕۆژێ بەوێدا دەهات وهاواری دەکرد:

"ئەی معاویە: ئەگەر ئەم کۆشکە لە پارەی خۆت دروست دەکەی زێدەمەسرەفە، ئەگەر لەپارەی خەڵکیشە خیانەتە"!

معاویە کە سیاسەتوانێکی پوختەو بەردەبار بوو، قسەی نەدەکردو بیری لەوە دەکردەوە چارەسەرێك بدۆزێتەوە.

ڕۆژێك ئەوی بۆ ماڵەوە دەعوەت کرد. زیاد لە پێویست ڕێزو حورمەتی گرت و وێڵی نواند، ئەبو زەڕ کەمو زۆر تورەییو دڕدۆنگی خۆی خاونەکردەوە، تا کار گەییە هەڕەشە کە:

"ئەبوزەڕ، ئەگەر بکرابا یەکێك لە سەحابەکانی پێغەمبەر بە بێ مۆڵەتی عوسمان بکوژم، ئەوا تۆ دەبووی، بەڵام بۆ مردنی تۆ دەبێ مۆڵەت لە عوسمان وەربگرم. ئەبوزەڕ ئەم کارە منو تۆ لێکدی دادەبڕێ، تۆ هەژارانو گەجەرو گوجەرانمان لێ دەهاڕوژێنی".

ئەبوزەڕ لە بەرسڤیا:

"بە گوێرەی سونەتی پەیامبەری خودا کار بکە، تا هەقم بەسەرتەوە نەبێ، دەنا ئەگەر تاقە هەناسەیەکم لە ژیاندا مابێ، ئەو هەناسەیە بە گێڕانەوەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر بەسەر دەبەم"!

بانگەشەو بانگەوازەکانی ئەبوزەڕ تەشەنەی کرد، خەڵکی شام کە وایان وێنا دەکرد کە ئیسلامیش وەکو ئەو رژێمە رۆمییەیە کە حوکمی دەکردن، بەرە بەرە رووی راستەقینەی ئیسلامیان بۆ دەردەکەوت. هەنگامەو هەرای عەدالەت و ئازادی لە پاڵ ئیمانی ئاینی دا، لە دڵاندا دەژیایەوەو ئەو هەژارانەی کە هەژاری و نەبوونیان بە ئاین پینە دەکرد، بۆ یەکەمجار لە ئەبو زەڕەوە فێربوون کە: "هەرکاتێ هەژاری لە دەرگایەکەوە وەژوور بکەوێ، ئاین لە دەرکەیەکی ترەوە وەدەردەکەوێ"!

مزگەوت هێشتا خانەی خوداو خەڵکیو ئەبوزەڕەکانو بنکەی خەبات بوو، معاویە دەسەڵاتی بەسەریدا نەبوو، لە دوای مەرگی عەلی بوو کە مزگەوتەکان لە خوداو خانەوادەی خودا – خەڵکی– چۆڵ بوو و بوو بە پایەگای خەلیفەو داوگەی ئاشکرای خەلیفە! هەژاران و نەبووان بە تاسەوەو ئومێدەوە ئەڵقەیان لە دەوری دەبەستو ئەویش حەقیقەتێکی هاوتای هەق و ئیسلامێکی هاوتای عەدالەتو خوادیەکی کە نانیشی لە بیر بوو فێری خەڵکی دەکردو دەناساندو لە بری بەنج کردن، هانی دەدانو هەڕەشەی وێران کردنی کۆشکی سەوزی، کە هێشتا تەواو نەبوو بوو، دەکرد. معاویە بۆ جیهادی قوبرسی نارد، ئەگەر گیرا ئەوا شانازیو سەرکەوتنێکە بۆ معاویەو ئیحتوبارێکە کە "سەربەرزی و عیزەتی ئیسلامە!"و ئەگەر ئەبو زەڕیش کوژرا ئەوا لە ئاسیوی خەلەسیوە بێ ئەوەی دەستی بە خوێنی ئەو سوور بێ* لێ ئەبو زەرش بە ساغ و سەلامەتی گەڕایەوەو بە پەلە لە شەڕگەوە بۆ مزگەوت رۆییو دەستی بە کارەکەی خۆی کردەوە!

*[* لەبەر ئەمەیەو لە سایەی ئەم جۆرە رژێمە دایە کە شیعە فتوای داوە: جیهاد، بەبێ رابەرایەتی ئیمامی راستیوبە هەق، نابێ].*

معاویە ئەبوزەڕی دەناسیو دەیزانی چەند لە بیری ئازادی کۆیلان و برسێتی برسییاندایە، خوڵامێکی راسپارد کە "ئەم کیسە زێڕە بدە بە ئەبوزەڕو ئەگەر توانیت بیدەتێ، ئیدی ئازادیت؟! خوڵامەکە بۆ لای ئەبوزەڕ رۆیی، ئەبوزەڕ وەری نەگرت، خوڵامەکە پێی داگرتو گریاو پاڕایەوە، وەڵامی ئەبوزەڕ تەنیا: نە! بوو. لە ئەنجامدا گوتی: "ئەی ئەبوزەڕ خودا بت بەخشێت، ئەم پارەیە وەربگرە،چونکە ئازادی من لەوەدایە کە ئەم پارەیە بە تۆ بدەم"، ئەبوزەڕ یەکڕاست: "بەڵێ، بەڵام ئەسارەتی منیش لەوەدایە کە ئەم پارەیە لە تۆ وەربگرم"!*

*[* هەمان سەربور لە دەفتەری یەکەمدا بە جۆرێکی تر هاتووە ].*

هیچ حیلەو حەواڵەیەك کاری لەم پیاوە سەر سەخت و بێباك و گوساخ و پارساو هوشیارە نەکرد، تەنیا زۆر ما، بۆ عوسمانی نووسی: ئەگەر پێویستت بە شامە، ئەبوزەڕ لێرە لابە، چونکە گرێکان ئاوساونو بڕینان خەریکە دەردەبن و تەقینەوە نزیکە.

عوسمان دەستووری دا، بۆ مەدینەی بنێرە.

پالانێکی ڕەق وتەق و داریان لە وشترێك کردو ئەبوزەڕیان سوار کردو دوو کۆیلەی هوڤیان بەگەڵ خست تا بۆ مەدینەی بێنن، معاویە فەرمانی دا بوو کە لە ڕێگەدا — لە شامەوە تا مەدینە— لە هیچ شوێنێ لا نەدەن.

سوار، لە مەدینە نزیك دەبووەوە، ماندوو شەکەت و بریندار، لە قەراخی شاردا، لەسەر کێوی سەلع، عەلی و عوسمان و چەند کەسێکی دیکەی بینی، لە دوورەوە هاواری کرد:

"مژدە لە مەدینە بێ کە شۆڕشێکی مەزن و بێ پایان بەڕێوەیە!"

خەلیفە فەرمانی دا هیچ کەسێك فتوا لە ئەبوزەڕ وەرنەگرێ، بەڵام فتواکانی ئەبوزەڕ لێکدا لێکدا دەردەچوون. ئەوەی لە شام دیتبووی رژدترولەخەباتا سوورترو دلێر تری کردبوو. عەبدورەحمانی کوڕی عوف، سەرۆکی ئەنجوومەنی خەلافەتی عومەر مردو میرات وکەلەپورەکەی کە دنیایەك زێڕو زیو بوو، لە بەردەم عوسماندا کەڵەکە کرا، ئەبو زەڕ بیستییەوە کە عوسمان گوتوویەتی: "خوا لە ئەرەحمان خۆش بووە چونکە بە باشی ژیاو کە مرد ئەم هەموو سەروەتەی لە دوای خۆی بە جێهێشت"!.

ئەبوزەڕ، نیگەران و گڕگرتوو، بە تاقی تەنێ بەرەو ماڵی عوسمان پێی پێوەنا، لە ڕێگەدا لولاقە وشترێکی دۆزییەوەو هەڵیگرت و هێرشی برد، هاواری بەسەر عوسماندا کرد: تۆ بە پیاوێك کە مردووەو ئەم هەموو زێڕو زیوەی لە پاش خۆی بەجێهێشتووە دەڵێیت خوا لێی خۆش بووە؟

عوسمان بە نەرمی گوتی: ئەبوزەڕ، یەکێك کە زەکاتی خۆی دابێ، ئیدی هەقی کەسی لەسەر دەمێنێ؟ ئەبوزەڕ ئایەتی کەنزی خوێندەوەو گوتی لێرەدا قسە لەسەر زەکات نیە، قسە لەسەر ئەو کەسانەیە کە زێڕوزیو کۆدەکەنەوەو لەڕێی خودادا بەختی ناکەن.

کەعبول ئەحبار — کەونە رۆحانی جولەکە— لای عوسمانەوە دانیشتبوو، گوتی: مەبەستی ئەم ئایەتە ئەهلی کتێبە (جولەکەو مەسیحی) موسوڵمانان ناگرێتەوە.

ئەبوزەڕ هاواری بەسەرا کرد: هەی جولەکە زادە! تۆ دەتەوێ ئاینی خۆمان فێر بکەی؟ هەی کۆستی دایکت بکەوێ! عوسمان گوتی: ئەگەر پیاوێك زەکاتی خۆی دابێ، کۆشکێك دروست بکات خشتێکی لە زێڕو خشتێکی لە زیو بێ، هیچ قەیدێ ناکات. ئەوسا رووی کردە کەعب و لە ڕای ئەویشی پرسی، کەعب گوتی: بەڵێ قوربان وایە! ئەبوزەڕ شالاوی بۆ برد، کەعب لە ترسا خۆی دایە پشت عوسمان و لەپەنای خەلیفەدا مت بوو، ئێستا دیمەنەکە تەواوە! شانۆی نواندنی هەموو مێژووە! لەلایەکەوە زێڕوزۆرو مەزەبی حوکمدار لە عەبدورەحمان و عوسمان و کەعبول ئەحباردا بەرجەستەیە، چەند دروستە! حەڵاڵی زێڕ! زۆر دەی پارێزێ و مەزەب لە پەنای زۆرا پینەی دەکات. و لە بەرانبەردا ئەبوزەڕ، قوربانی و گوری چەوسانەوەو ستەم و گەوجاندن، رەمزی مەزەبی مەحکومی مێژووو چینی مەزڵومی مێژوو، خواو خەڵکە!

ئەبوزەڕ تەنیا، چەك کراو، مەزڵوم، وێڕای ئەمەش مولتەزیم و شۆڕشگێڕو هێرشبەر، کەعبی لە پەنای زۆرا گرت و لولاقە وشترەکەی بەسەریا کێشاو خڵتانی خوێنی کرد. عوسمان گوتی: چەندمان ئازار دەدەی ئەبوزەڕ، کە موزیری، هەیدێ لەبەر چاوم گوم بە.

ئەبوزەڕ پرسی: من لە دیداری تۆ بێزارم، بۆ کوێ بڕۆم؟

- بۆ ڕەبەزە!

مەروانی کوڕی حەکەم، دوورخراوەکەی پێغەمبەر، بوو بە ماموری دوورخستنەوەی ئەبوزەڕ. عەلی بە ڕووداوەکەی زانی، زۆری لە دڵ گران بوو، حەسەن و حسەین عەقیلی هەڵگرت و هات بۆ بەڕێکردنی. مەروان پێشی لە عەلی گرت و گوتی: "خەلیفە بەڕێکردنی ئەبوزەڕی قەدەغە کردووە." عەلی بە شەلاق دایە دواوەو تا ڕەبەزە دەگەڵ ئەبو زەڕدا ڕۆیی. ڕەبەزە، بیابانێکی گەرم، وشك و برینگ، بێ ئاوو ئاوەدانی، کەوتبووە سەر ڕێگای حەج و جگە لە وەرزی حەج ئیدی چۆڵ و خامۆش دەبوو. لەو شوێنەدا خێوەتە شڕەکەی هەڵداو بەوچەند سەربزنەی کەی هەبوو ژیانی دابین دەکرد.

هەیڤان بورین. هەژاری زیاترو برسێتی گوساختر دەبوو. بزنەکان یەك یەك مرداربوونەوەو ئەوو خێزانەکەی لە تەنیایی بیابان دا، ڕووبەڕووی مەرگ بوونەوە.

کیژەکەی مرد، سەبری گرت، "لە ڕای خوای حیساب کرد" دوای ماوەیەك گورگی برسیەتی پەلاماری کوڕەکەی دا هەستی بە مەسئولیەت کرد. بۆ مەدینە هات و داوای مووچەکەی کە بڕی بوویان، لە عوسمان کرد. عوسمان وەڵامی نەدایەوە. بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە. جەنازەی کوڕەکەی سارد بوو بووەوە. بە دەستی خۆی ناشتی.

ئەبوزەڕ و داکی زەڕ، پیر قەل وبرادەر، مانەوە!

هەژاری و برسێتی و پیری ئەبوزەڕیان بە جەستە زۆر لاواز کردبوو. ڕۆژێ هەستی کرد ئیدی دوا تینی لە دەست داوە. برسێتی ئازاری دەدا، بە داکی زەڕی گوت ڕابە با لەم بیابانەدا بگەڕێین بەری گیایە شتێك بدۆزینەوە تا تۆزێك برسێتی خۆمانی پێ بشکێنین. ژن و مێرد هەموو دەوروبەری خێوەتەکەو دوورتریش گەڕان و هیچیان نەدۆزییەوە. لە گەڕانەوەدا ئەبوزەڕ ئیدی توانای نەما. شوێنەواری مەرگ بە دەمو چاوییەوە دەرکەوتبوو. داکی زەڕ هەستی کردو بە سەرسامی پرسی:

- ئەوە چیتە ئەبوزەڕ؟

- مەرگ وجیا بوونەوە نزیك بووەتەوە! جەنازەکەم لە سەر ڕێگە دابنەو داوا لە ڕێوینگان بکە تا لە ناشتنی مندا یارمەتیت بدەن.

- حاجیان ڕۆییشتوون هیچ ڕێبوارێك نیە.

- با! ڕابە هەڕە سەر ئەم گردە، خەڵکانێك بە مەرگی منا ڕادەگەن.

داکی زەڕ، لە سەر گردەکەوە، سێ سواری دوور دووری بینی، ئیشارەتی بۆ کردن، نزیك بوونەوە.

- بەر ڕەحمەتی خوا کەون، پیاوێك لێرەدا وا دەمرێ، بەڵکو یارمەتیم دەدەن بینێژین و خێرو مزی خۆتان لەخوا بوێ و وەربگرن!

- ئەو پیاوە کێیە؟

- ئەبوزەڕ.

- یاری پێغەمبەر؟

- ئەرێ.

- داك و بابمان بە فیدات ئەبوزەڕ!

گەییشــتنە ســەری، هێشــتا زنــدوو بــوو. داوای لێکــردن: "کێتــان قاســیدی دەوڵــەت، شــۆفارو جاسوس‌و یان سوپاییە نەم نێژێ. ئەگەر خۆم یان ژنەکەم پارچە قوماشێکمان هەبایە پێویستم بە کفن نەدەبوو".

تــەنیا لاوێکــی ئەنســار، کــاری ئــازادی هــەبوو گــوتی: مــن ئــەم قوماشــەم پێیــە کــە دەستچــن و دەسڕێسی دایکمە، ئەبوزەڕ دوعای خێری بۆ کردو گوتی بەوە کفنم بکەن.

خــەیاڵی حەســایەوە، هــەموو شــتێك کۆتــایی هــاتبوو، چاوەکانی لێــك نــان‌و ئیــدی نەیکردنــەوە. ڕێبوارەکان لە ژێر قومی گەرمی ڕەبەزەدا بە خاکیان سپارد، لاوە ئەنسارییەکە لەسەر گۆڕەکەی وەستا، لە ژێر لێوانەوەو بە ئەسپایی گوتی:

ڕاستی گوتووە پێغەمبەری خودا:

"بە تەنێ ڕێ دەکات، بە تەنێ دەمرێ، و بە تەنێ زیندوو دەبێتەوە".

# جارێکی دی ئەبوزەڕ

دوو ساڵ لەوە پێش،رەزای دانیشوەر، داریوشی ئەرجمەندو ئیرەجی سەغیری -خوێندکارانی کۆلێژی ئەدەبیاتی مەشهەد- لە هۆڵی زانستگەدا "جارێکی دی، ئەبوزەڕ" یان لەسەر شانۆ نمایش کرد.

فۆرمی هونەری، نێوەڕۆکی هزری و پەزێرایی "رۆشنبیران"لە رادەبەدەر باش بوو.

و ئەمساڵ، هەمان شانۆنامە،لە دەرهێنانو جێبەجێبەکردنی ئیرەجی سەغیریو بە هاوکاری "گروپی هونەریی حوسەینیەی ئیرشاد" لە هۆڵی حوسەینیە، بۆ رەمەکی خەڵکی نمایش کرایەوە.پەزێرایی "خەڵکەکە" یەجگار گەرم وگوڕ خرۆش ئەنگێز بوو.

ئەم "رووداوە" لە دەقی مەزەب، هونەر، کۆمەڵگە، ولە پەیوەندی پچڕاوی رۆشنبیروخەڵکی دا، عینوانی "فەسڵ"ێك بوو. فەسڵێك کە سەد ساڵ درەنگ دەستی پێکرد:

ئاینی ئێمە،دوای ئەوەی بەرگی کۆن"تازەیەو ئەو شتانە" فڕێ دەدا، رووەدەکاتە هونەری مەزنی "شانۆنامە" - وەکو چۆن روحی مەزەبی باو ئەم دووە لێکدی بە جیا دەزانێ- لە "جارێکی دی، ئەبو زەڕ "دا، جارێکی دی ئەم جلە، جوان و نوێیە، لەبەر دەکاتو دێتە سەر "شانۆ".

هونەر لە شێوەیەکی تازەدا وبە تواناو ئیمکانیاتێکی تازەو لە ئاستی بەها جیهانیەکانی هونەردا، دێتە سۆراغی مەزەبو دەگەڵ ئەم هاوتا دێرینەی خۆیدا - وێڕای هەوڵ و تەقەللای ریشەدارو بەردەوامی کۆنە پەرستیو کۆنەپەرستان کە ئەم دووانەی لەیەك بێزارودڕدۆنگ کردبوو- دووبارە ئاشناوئاشت دەبێتەوە.

دروشمی ئیمپریالیستی "مەزەب بۆ عەوام"و "بێ مەزەبی بۆ بژاردە!"و دیواری بەینی (بازاڕی)و "زانستگایی" دەڕوخێنێو "رۆشنبیر"و "خەڵکی" بە بانگەوازی ئەبوزەڕ،دەبن بە یەكو لە راستەرێی "ئیسلامی دژە کەنز"دا یەك دروشم کەشف دەکەنو یەك ئاراستە دەگرنە بەرو مەزەبییەکان لە ئەبوزەڕەوە هۆشمەندیی چینایەتی فێردەبن و رۆشنبیران لە ئەبوزەڕەوە هۆشمەندیی ئایدولۆژیو ئیعتقادی فێردەبنو، لە ئەنجاما حوسەینیەی ئیرشاد، هەنگاوێکی گەورە بە رێگەی ئارمانجی مەزنی خۆیدا، دەنێ، واتە پیشاندانو ڕانانی تازەو نوێی مەزەب لەم سەردەمەدا،وبەکاربرنو وەگەڕخستنی هەموو تواناو ئیمکاناتەکانی ئەم سەردەمە لە ڕای زندوو کردنەوەو ژیاندنەوەی روح و رێبازی مەزهەبیو، لەسەری سەرەوە: ئیسلام، و لە کاکڵەی ئیسلامدا: شیعەگەرایی عەلی، بەڵێ حوسەینیەی ئیرشاد هەنگاوێکی گەورە لەم بوارەدا دەنێو ئەبوزەڕ- کە سیماو رەمزی ئیسلامی زندوو و تەشەیوعی عەدالەتخوازو مولتەزیمە- جارێکی دی، لەسەر پەردەی هزرو هەستی ئەم وەچەیە، وەچەی هوشیارو تینوو ومولتەزیمی ئەم سەردەمە وێنە دەکات.

ئەم "بەرهەمە"، لە سەرەتاوە تا کۆتایی - هەم وەکو هزروهەم وەکو هونەر- لە داهێنانی خوێندکارانە، بێ پشت بەستن بە خەڵکانی دی و بێ ئیملای ئەمو ئەو! بێ هیچ "دەست"ێك!

و ئەمــەش بـۆ خـۆی ســەرکەوتنێکی مەزنــە، نیشــانەی خۆیبــوون‌و بــەرەو پێگەیشــتن چــوونی وەچـەیەکە کـە تێدەکۆشـێت تـا بـە روحـی ئیمـانی خـۆی‌و لەسـەر بناغـەکانی کـەلتورو مێـژوو و بەهاکانی خۆی، لەسەر پێی خۆی "بوەستێت" و بەپێی خۆی "بڕوات".

و چ ڕێکــەوتێکی خــرۆش ئــەنگێزە، ڕێکــەوتێك کــە لــە نەخشــەو رامــان و بڕیارێــك مانــادارترو سەرکەوتووترەو ئەوەیش بە دەست هێنانی ئەم هەموو سەرکەوتنەیە، لە "تاراوگـەی رەبـەزە"، لـە پـەیامی "ئـەبوزەڕ"،سیمایەك کـە هـەم باوەڕی دێـرینی ئێمـە دەگێڕێتـەوەو هـەم ئامـانجی زەمـان‌و رۆژگاری ئێمە، هەم شارستانیەت‌و کەلتووری ئێمەیە، هـەم مێـژووی ئێمـە، هـەم عەشـقی ئێمەیـەو هەم دەردوئازار.

پەیامبەری ئیسلام گوتوویەتی:

"رەحمـەتی خـوای لـێ بـێ ئـەبوزەڕ، بـە تـەنیا ڕێـدەکات‌و بـە تـەنیا دەمرێـت‌و بـە تـەنیا زنـدوو دەبێتەوە"!

– کەی؟

– لە "رابوونی قیامەت"

وهەروەها لە "رابوونی هەر سەردەمێك و لە نێو هەر نەسڵ و وەچەیەك!"

و ئێســتا،جارێکی دی ئــەبوزەڕە، کــە لــە نێــو هــەموو ئــەو ســیمایانەدا کــە لــەم گوڕســتانە بــێ کەوشـەنەی مێـژوودا، نێژراون،لـە زەمـان ورۆژگـاری ئێمـەداو لـە نێـو ئێمـەدا "بـە تـەنیا دەژێتـەوە، زندوو دەبێتەوە!".

**دکتۆر عەلی شەریعەتی**

## جارێکی دی ئەبو زەڕ

### دیمەن

دیمەن، دیمەنی مەرگی ئەبوزەڕە، تەنیایی ڕەبەزە، خۆری ئاگرڕێژی بیابان.

ئەبوزەڕ، پرۆمیتەی ئێمەیە، پرۆمیتەیەکە نە لە ئاسمانە و نە لە نێو ئەفسانە، لە زەویا، لە مێژوودا، یەکێك نیە لە خوداوەندان،بەندەی راستەقینەی خودایە.

لیَ پەیامەکەی پەیامی پرۆمیتەیە، رفاندنی "ئاگری خودایی" لە دەستی خوداوەندانی تاریکیو زوڵم لەسەر زەوی، وبەخشینی بە مرۆڤ، جەماوەری ڕەش و ڕووت، قوربانیانی زوڵمی خەلافەتی ستەم، وزوڵمەتوتاریکی روحانیەتی جەهل، عوسمانوکەعب.

دەڵێن هەموو کەسێك، لە دەمی مەرگدا، هەموو ژیانی وەبیر خۆی دێنێتەوەو، هەموو شانۆنامەکە ئەمەیە، ڕەبەزەیەو ئەبوزەڕو مەرگ. جگە لەمەی کە داکی زەڕ دەچێت ڕێبوارانێ پەیدا بکات، تا لە مەرگی ئەبوزەڕدا ئامادەبنو لە کفن و دفنەکەیدا یارمەتی بدەن، ئەوەی دەی بینن، لە ڕەبەزەدا روو نادات، بەڵکو لە یادگەو بیرەوەری ئەبوزەڕدا روو دەدات، لە ویژدانی ئەودا لە دەمی مەرگا کێشماکێشی نێوان "جوندوب" و " ئەبوزەڕ": لە نێوان بوونی کۆنی تینوو و گەنگەشەکاری– کە لە "پرسیار کردنەوە خۆراك وەردەگرێت"– و بوونی پاراوو "گەییوو"ی– کە لە "دایکبوونی تازەدا" دۆزیویەتەوە.

و نەبەردی نێوان مەزەب ومەزەب: مەزەبی کۆیلاندنۆ مەزەبی ئازادیبەخش، مەزەبی "بەند"و مەزەبی "نور"

و ئەشکەنجە: جەزرەبەێن سێینە، برسێتیو جەهلو ستەم: هەر سێکیان بە یەك دار.

جەنگی شیرك و تەوحید.(کوفرویەکتایی)

و هەوڵی شیرك: رەشان، بیَ سیمایان، بۆ تەسلیم بوونی ئینسان– ئەبوزەڕ بە هەڕەشەو بە زنجیر، عیبادەتی بت: بتی تەسلیس (سێینە).

و هەوڵی ئینسان – ئەبوزەڕ بۆ قەبوڵ نەکردن، مل نەدان، یاخی بوونو شۆڕش، ئازادی، سەرکەوتن!.

و ئەبوزەڕ، قوربانی شیرکی ئاشکرا، شەڕی پەنهان، "نا" گوتن بە کوفری جاهلیەت، بە دینی خەلافەت، و ویژدانی ئاگاو ئازادی مرۆڤی مەزڵوم: خەڵکی!

و ئەبوزەڕ، شەهید، شەهادەت: ئامادەبوونو حوزورو لە هەموو سەردەمەکانا، لە هەموو نەسلەکانا، لە هەموو بەرەکانا،وئەنجام، "بەردەوامیو پەیوەندی" لە هابیلەوە تا ئەبوزەڕ، لە ئەبوزەڕەوە تا حسەین، لە حسەینەوە تا... ئاخر زەمان.

لە قابیلەوە تا عوسمان، لە عوسمانەوە تا یەزید، لە یەزیدەوە تا... ئاخر زەمان.

دیجلەو فوراتە، لە یەك سەرچاوەن، کە لە بەغدایا یەك دەگرن: شەتی عەرەب، ناوی: ئیسلامە! بەڵام... لە دوائەنجاما؟ دەریایە!

ئەمە مەبەستەکەیەو تەواو.

گروپی حسەینیەی ئیرشاد

## جارێکی دی ئەبو زەڕ

## "وتاربێژی"

***سوپاس و ستایش بۆ خوا کە هەرچیم لێ داواکردوە***

***بە بەوپەڕی ئاواتی خۆم کامەران بووم****

***[* چەپڵە لێدانی گەرم و گوڕی ئامادەبووان.(ن)].***

ئەمشەو بۆ میللەتی ئێمە،کە بە درێژایی هەزارو سێسەد ساڵی مێژووی ئیسلام، ڤیانو مەحەبەتی عەلیو ماڵباتی عەلیو ڕێگەو ڕێبازی عەلی هەڵبژاردووە، هەروەها ئەمشەو بۆ ڕۆشنبیرانی مەزەبی، کە هەوڵدەدەن تا لەم سەدەیەداو لەم سەردەمەدا سەرباری هەموو فاکتەرو هەلومەرجە ناهەموارو نا سازگارەکان،مەزەبو ئیمانی خۆیانو ئەم پاشەکەوتە سەرڕێژە ئینسانیو خوداییەو ئەم ئاراستەو هەڵبژاردنەی کە بە درێژایی مێژوو، بە قیمەتو بەهای شەهید بوونو عەزاب هەڵیان بژاردووە بپارێزن،وهەروەها بۆ ئەم دەزگایە، کە لە سەرەتاوە – لەسەر بنەمای ئەم ڕێگاو ئەم ڕێبازو ئەم ئامانجە– بە ئاواتەوە بووە مەسئولیەتو ئەرکی خۆی بۆ ئەم سەردەمو بۆ ئەم وەچەو نەسلە ئەنجام بدات، بۆ ئێوە، کە بە درێژایی ئەم چەند مانگ یا ئەم چەند ساڵە، وەکو خەڵکانی پابەندو مولتەزیم هەوڵتان داوە تا لە کاروانی ژیانی خۆتاندا پەیامی پاراستن وئاگاداری ئەم پزیسکە خوداییەتان هەبێو ئەم ئالای ئازادیو خۆیبوونە ئینسانیە بپارێزن،و هەروەها بۆ من، وەکو موعەلیمو فێرکارێکو وەکو تاکێک– کە هەم، پەیمانو پەیوەندییەکم بەم ئیمانەوە هەبووەو هەیە،و هەم پەیمان و پەیوەندییەکم بەم زەمانەو بە غرووری خۆم، وبە هەستی خۆمەوە لەم کۆمەڵگەیەدا هەیە–، شەوێکی گەورەیە.

ئەوەی لە بەرنامەی ئەمشەو مەزنترە، وەکو دەبینن، ئەبوزەڕە، پیاوێکە وەکو گەورەترین سیمای دیار لە ڕێگەی عەلیو ئیسلامی عەلیو هەروەها وەکو زندووترین سیمای پێویستی سەردەم– کە سەردەمی هەوڵ و کۆششی ویژدانی ئاگای بەشەریتە بۆ وەدیهاتنی دادوەریو عەدالەتو یەکسانی ئابووری لە جیهاندا، هەوڵو کۆشش بۆ دۆزینەوەو وەدەست هێنانی ئیمانێک کە بتوانێت هەم خودای هەبێ، هەم خورما*– ئەبوزەڕ. ئەو پیاوەی [* ***بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هەوڵیان داوە لێرەدا نانو خۆشەویستی، ئاین و ژیان لێکدی جیا بکەنەوە***]. کە بە تەنیا ژیا، بە تەنیا مردو بە تەنێ زندوو دەبێتەوە. پیاوێك کە سێ ساڵ بەر لە بانگەوازی پەیامبەری ئیسلام بۆ یەکتایی (تەوحید)،گەییە یەکتاییو لە قوڵایی بیابانی خامۆشی (ڕەبەزە)دا کە خێڵی "غیفار" لەوێندەر دەژیا،لە تەنیایی بێدەنگیو جاهیلیەتی کوفرو شیرکدا، بە تەبیعەتی خۆی، خۆ ڕسکانە، گەییە خواو سێ ساڵ پێش ئیسلام نوێژی بۆ خودای تاکوتەنیا کرد، پاش ڕاگەیاندنی پێغەمبەرایەتی پەیامبەری ئیسلام، ئەو کە لە تاقیب وکنوکۆی پەیامی ئیسلامدا بوو، وهەموو ژیانی لە چاوەڕوانی سروش و وەحی دا ڕابوارد، چوارەمین کەس بوو کە پەیوەندی بە ئیسلامەوە کرد.ئەو کەسەی کە لە مەککەدا، ڕێی ماڵی پەیامبەری ئیسلامی نیشاندا عەلی بوو: ئەم منداڵە دە ساڵانە دەلیلی ئەبوزەڕ بوو بۆ لای محەمەد.

که لەوێندەر،لە ماڵی پەیامبەر هاتە دەرێ، ئەویش وەکو چۆن محەمەد کە لە کێوی حەڕا دابەزی تا پەیامی یەکسانیو یەکتاییو ئیمان لە نێو کافراندا رابگەیەنێ، لە تەپەی سەفا– کە ماڵی پێغەمبەر لەوێ بوو– هاتە خوارێ. میناکی ئەو لە هەنبەر بت پەرستاندا، لە کەناری ئەو کابەیەی کە بوو بوو بە بتخانە،راوەستا: رووبەرووی ئەو بت پەرستانەی کە بت پەرستییان کردبوو بە پەردەی داپۆشینی کوفرو شیرکی کۆمەڵایەتیو ناکۆکی چینایەتیو جیاوازی نەژادیو پاکانەی ئەشرافیەتی بنەماڵەیی وەستا، تەنیا، بێکەس، بێ چەك. رووبەڕووی بتانو بتپەرستان هاواری کرد ئەی بتپەرستان، ئەی بەردپەرستان ئەو بەردانەی کە بە خۆتان دای دەتاشن بشکێنن.

و ئەو بوو بە ئیبراهیمی سەردەمی خۆیو، ئەو یەکەمین بانگەوازوگازی ئیسلامی لە ژێر ئاسمانی شیرك(کوفر)دا لە گەرووی تەنیایەوە رەها کرد.و بتپەرستەکان ویستیان ئەم یەکەمین هاواری شۆڕشو یاخی بوونە لەجیدا خەفە بکەن، بۆیە بە سەریا رژان. ئەزیەتیاندا، ئازاریان دا، بەقەستی کوشتنو خەفە کردن هێرشیان بۆ هێنا.

بەڵام دەتوانرێ ئیمان بە تۆبزی بتەمرێنرێ، ودیسان سبەیو سبەی و سبەیەکی ترو هەمان دیمەن، تا پێغەمبەر ترسی لێنیشت کە بیکوژن، بۆیە فەرمانی دا کە: بڕۆ بۆ "غیفار"و "پەیامی" هیدایەتو رێنوێنی خێڵەکەی خۆت لە ئەستۆ بگرەو بەکڕی چاوەڕوان بکە، تا قۆناغی خەباتی ئاشکرا دەست پێدەکات، هەنگێ وەرە.

قۆناغی ئەشکەنجەو ئازاری موسوڵمانان، قۆناغی تاکسازیو خەباتی فەردی لە مەککە تەواو بوو و موسوڵمانان بۆ مەدینە هاتنو قۆناغی رێکخستنی بەکۆمەڵ و کۆمەڵسازیو ئومەت سازی دەستی پێکرد.

لەم سەروبەندەدا دیسان ئەبوزەڕ رێی مەدینە دەگرێتە بەر، بێ زەواد، بێ توێشوو، بێ پشتیوانە، بێ موڵك ومال، بێ کەسوکار، بە تاقی تەنیا دێتە مەدینە. بەڵام مەدینە، ئێستا مەدینەی مەحەبەت،باوەڕو خەباتە، لێرەدا دەتوانێ بە مەحەبەتو ڤیان، بە باوەڕو بە پەیام بژی. هاتە ماڵی خودا،کە ماڵی خەڵکی بوو، ودالانی مزگەوتی، کە سەکۆیەك بوو– بەشی سەرگیراوی مزگەوتی پێغەمبەر–،لەگەڵ یارانی دیکەی دالان نشیندا کرد بە نشیمەنی خۆی. دالان نیشنەکان بریتی بوون لە: عەممارو عەممار ئاساکانو سەلمانو سەلمان ئاساکان (پیاوانێك بوون کە هیچ شتێکیان نەبوو تا لە هەنبەر جیهادا دوو دڵیان بکات،تەنانەت ماڵێك، مناڵێکیان نەبوو تا لە دەمی مالاوایی و بەجێ هێشتنیاندا لە رای ئامانجەکانیان، تۆزقاڵێك دوو دڵیان هەبێ. تەنیا بوون. بێ خزموکەسوکار، بێ خێزان، بێ کەس، هەر یەکەیان شمشێرێکی پێ بوو، هەر کە بیلال بانگەوازی جیهادی دەکرد، بەر لە هەموو کەس، بەر لەوەی سوپای موجاهیدان لە شار وەدەرکەون، پێش موجاهیدان دەکەوتن، ولە قۆناغی ئاشتیشدا سەرگەرمی ستایش، عیبادەتو زانست و فێربوون بوون، ژیانیان فیدای ئیمان وپەیام و جیهاد کردبوو. ئەبوزەڕ یەکێك بوو لەمانە).

قۆناغی دە ساڵەی مەدینە: ساڵانی جۆش وخرۆش، ساڵانی تێکۆشان لە پێناوی نابووتی زوڵمەتوتاریکی، لە ڕای نەهێشتنی جیاوازی، بۆ شکانی بتو بۆ لە ناو بردنی جاهلیەت. لەم

سالانەدا ئەبوزەڕ، ئەبوزەڕی تەنیای هەژاری دەسکورت، لە لوتکەی سەرکەوتندا بوو، تا پێغەمبەر ڕۆیی.
لە پڕ بایەکان لە هەموو لایەکەوە هەستان: جاهیلیەت وکوفروشیرك و ئەشرافیەتی فەرق و جیایی و ئاغایەتی و کۆیلایەتی، کە وەکو مارێك لەسەری درابوو بەلام هێشتا هەناسەی دەدا، لەو گەرماییەدا کە بە هۆی هەولْ و تەقەللای خۆ پەرستی و سیاسەتبازی و باندبازیەکانەوە هاتبووە ئاراوهەوای مەدینەی گەرم کردبوو، سەری بەرزکردەوە. دیسان نۆرەی درزو دابڕان،جیاوازی ئەشرافیەت، دەم سپێتی و تەمەن و گەورەیەتی، مردن و نابووتی هەموو ئەو بەهایانەی کە شۆڕشی پێغەمبەروشۆڕشی ئیسلام جێگیری کردبوو، دیسان نۆرە هاتەوە سەر ڕاپەڕین و یاخی بوونی جاهیلیەت لە بەرگی یەکتاییدا، لە بەرگی سوننەتی پێغەمبەردا.
لادان وکەچڕەوی دەستی پێکرد. بۆ یەکەمین جار عەلی گۆشەگیرو خانەنشین بوو. خانەنشینی و گۆشەگیری عەلی لەبەر ئەمە بوو کە: عەدالەت لە دین جیا بووەتەوە.دین بەبیْ عەدالەت ماوەتەوە، بەلام ڕەمزو نیشانەی عەدالەت گۆشەگیروخانەنشینە. وخۆیایە کە لەمە بە دواوە تەنیا زۆر دەبیْ، وەکو لە مێژوودا بووە، و ئیدی عەدالەت خانەنشینە، بەلام ڕوالەت، فۆرم، مەسلەحەتی دەرەکی، خەتەر، ساوایی بزووتنەوەکە، کە کردیانە کاریْ عەلی بێدەنگ بیْو تەحەمول وسەبر بکات، ئەبو زەڕیشی بێدەنگ کردوناچاری کرد تەحەمول بکات. دووەم هاتە سەر کار، دیسان بێدەنگی و تەحەمول، سێیەم، عوسمان: ئەم پیرەمێرە پارسا ڕوالەتە خزم دۆست وزێڕ پەرستە، کە ئیسلامی بە کۆمەلێك ڕێورەسم و داب و نەریت و کاری ڕوالەتی و سەرڤە سەرڤەو هۆیەك بۆ سەرلەنویْ ئەشرافیەت وسەر لەنویْ حوکمڕانی ئەشرافیەت دەزانی، هاتە سەر کار.
شکستی عەلی لە بەرانبەر عوسماندا، ئەبوزەڕی هێنایە هاوار. عوسمان خزمەکانی خۆی، کە بەنی ئومەیە بوون، لە پۆستەکاندا دانا. هەموو چارەنووسی خەلکی، کە لەبەر خاتری عەدالەت و ئازادی باوەڕیان بە ئیسلام هێنا بوو،دیسان کەوتە دەستی دژمنانی گەورەوریشەدارو ڕکونی ئیسلام و گەورەترین کاربە دەستانی ئەشرافیەتی کوفرو فەرق و جیاوازی، کە ئەمڕۆ بەرگی ئیسلامیان پۆشیوە.جا ئەبوزەڕ ئیدی لێرەوە بێدەنگی بە خیانەت دەزانیْ. بەلام سەبارەت بە بانگەوازو هاوارەکەی، وەکو چۆن لە مەککەدا، تەنیا بوو، لە مەدینەش دا لە نێو موهاجیران و ئەنساری گەورەی پێغەمبەریش دا هەر تەنیایە.کەوتە هێرش بۆ سەر عوسمان،بۆ سەر زێرپەرستی عوسمان.بۆ سەر چینی تازەو بۆ سەر ئەو مەدینە هەژارسازەی کە لە ڕێگەی تالانکردنی زەکات و دەستکەوتی جەنگەکانەوە کۆمەلێکی بە نێوی یاران یان خزمانی خەلیفەوە لە شێوەی چینێکی زێڕ پەرست و بورژوازی تازەدا هێنابووە ئاراوە. وموهاجیران و ئەنسار— ئەو کەسانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا تەنیا لەبەرخاتری ئیمان و باوەڕی خۆیان دەجەنگین و پارساییان کردبوو بەپیشە— هەنووکە بوژابوونەوەو خودانی هەزاران کۆیلەو پۆست وپایەی پڕ تەخشان وپەخشانی پارەداری وەکو حکومەتی ڕەی، حکومەتی ئێران، حکومەتی ڕۆم و میسرو یەمەنیان هەیە،وباشترین زەخیرەیان هەیە بۆ قاچ و قووچ و تالانکردن: بە ناوی جیهاد، بە ناوی زەکات. ئەبوزەڕ سەیری کرد ئەمجارەش خەلکی گیرۆدەی ئەسارەت دەبن، دیسان خەلکی تالان

دەکرێن.دیسان برسیەتی دەبینن بەڵام بە ناوی تەوحیدویەکتایی (و لەوە پێش بە ناوی شیرك و کوفر) ئەم فێڵە تازەیەی، کە لەوەیە موسوڵمانان ناچاربن سەدان ساڵی دی هەژاریو زەبوونیو کۆیلەتیو تەنگانەیی بە ناوی ئاینەوە تەحەمول بکەن، پیٚ قەبولٚ نەکراو، هاواری کرد.

عوسمان نەیتوانی تەحەمولی بکات. ناردی بۆ شام، بۆ لای خزمەکەی خۆی، بۆ لای معاویە، چونکە لەو دوورەو لە دەریٚی مەدینەدا، معاویە زیاتر دەستی بەسەر ئەبوزەڕدا دەڕۆیی، تا یان بیکڕیٚ یان هەڕەشەی لیٚ بکاتو یان بە هەرحالٚ بیکوژێت. ومعاویە لەم سەروبەندەدا، کە ئیدی عەلی شکستی هێنابوو وجێگەی هیچ مەترسییەك نەبوو، وخەلیفەش عوسمان بوو– ئەسیرو زەبوونی بنەماڵەی بەنی ئومەیە– ئیدی لە هیچ شتێك نەدەپرینگایەوەو مەرزوکەوشەنانی نەدەناسی. هەموو هۆشوگۆشی هاتبووە سەر دروستکردنی کۆشکی کەسك لەسەر شێوەی ئیمپراتۆرانی رۆم وئێران، سازڤانانو هونەرمەندانو تەلارکارانی مەزنی لە ئێرانو رۆمەوە هێنا بوو تا کۆشکی کەسك وەکو نیشانەی بوژاندنەوەو زندووکردنەوەی کۆشکنشینی و ئەشرافیەت، لە دوای پێغەمبەر،لە جەرگەی ئیسلامو بە ناوی یەکتاییو تەوحیدەوە، رۆبنێت وبەرز بکاتەوە، ئەوەندە خۆشحالٚ بوو کە هەموو رۆژیٚ بە خۆی دەهاتە سەر کرێکارو وەستاو ئەندازیارو هونەرمەندەکانوسەرپەرشتی کاروپێشڤەچوونی کارەکانی دەکردن. وبەیانیو بەیانی، هەموو رۆژێك، ئەبوزەڕ بە تەنیا دەچوو بۆ تاقیبوسۆراخی معاویەو لە دوورەوەو لە بەردەم خەڵکیدا هاواری دەکرد کە: "ئەی معاویە ئەگەر ئەم کۆشکە لە پارەی خۆت دروست دەکەی زیادە مەسرەفە،وئەگەر لە پارەی خەڵکی دروست دەکەیت خیانەتە"*

*[* چەپڵە لێدانی گەرمی ئامادەبووان– ن].*

معاویە، ئەم سیاسەتوانە بەردەباروزۆر کارامەیە–کە یەکێك لە چوار بلیمەتەکەی عەرەب بوو– دەیزانی ناتوانیٚ ئەبوزەڕ، ئەو ئەبوزەڕەی کە خۆشەویستی پێغەمبەرە، چاوی پێغەمبەرە، ئازیزی پێغەمبەرە، ئەو ئەبوزەڕەی کە پێغەمبەر دەربارەی دەیگوت: " ئەب زەڕ لە ئاسماندا ناسراوترو خۆشەویست ترە تا لەسەر زەوی". ئەبوزەڕیٚ کە "شەرمو پارسایی وەکو عیسای کوڕی مەریەمە"، ئەبوزەڕیٚ کە "هێندەی عیلم و زانست وکردە ئامانی بە تاڵی سینەیەوە تاسەر رێژ بوو"، بە ئاسانی بخاتە وازوازی، بەڵام لەوەیە بتوانیٚ بیکڕیٚ. چونکە گەلێك لەو سەحابە گەورەو نزیکانەی پێغەمبەر، کە ئەمڕۆ لە دەوروبەری کۆشکی کەسکدا سۆراخیان دەکات، یا لە قەحپەخانەکانی کوفەدان یا لە سەر کورسی پڕ تەخشانو پەخشانی حوکمرانی ئێرانو رۆمن. خۆ ئەمانە بە رواڵەت ئەو سەحابانە بوون کە لە ماوەی دە سالٚ، بیست و سیٚ سالٚ پەیامبەری پێغەمبەردا، بە بست لێی دوور نەدەکەوتنەوە. "مەگەر ئەبوزەڕ لە ئەبو هورەیرە گەورەترە – ئەبو هورەیرەیەك کە هاوریٚو هاونشینی پێغەمبەرو گەورەترین فەرموودەبێژی پێغەمبەر بوو و ئەمڕۆ دەبینین کە بۆ یەزید کە عاشقی ژنەکەی عەبدوڵڵا سەلام بووە،ئەوەتا مەسئولیەت ئەنجامدەدات – جا کاتیٚ کە یاوەرێکی گەورەی پێغەمبەر، پەیامە ئینسانیو ئیسلامیەکەی بووبیٚ بەوەی کە ژنی خەڵکی بۆ یەزید خوازبێنی بکات، و بە خۆیشی ئەم پەیامەی لە ئەستۆ گرتبیٚ. چۆن ناشێت ئەبوزەڕ بکڕدریٚ؟ خولامەکەی نارد. (دەیزانی کە ئەبوزەڕ پیاوێکی سۆزدارە، دەیزانی کە ئیمانی

ئەبوزەڕ ئازاد کردنی ئینسانە) خولامەکەی راسپاردو گوتی بۆ مزگەوت بڕۆ، بۆ ماڵی ئەبوزەڕ،و پێی بڵێ: ئەی ئەبوزەڕ ئەم کیسەیە خەلیفە ناردوویەتی و پارەی شەخسی خۆیەتی! ئەگەر توانیویت کیسەکەی بدەیتێ ئیتر بۆ خۆت ئازادی. خولامەکە هات، پاڕایەوە، ئەبوزەڕ قەبوڵی نەکرد.خولامەکە گوتی رەحمەتی خوات لێ بێ ئەبوزەڕ! ئەم کیسەیەم لێ وەربگرە چونکە ئازادی من لە وەرگرتنی ئەم کیسەیە دایە و، ئەبوزەڕ بەرسڤی دایەوە: کە کۆیلەیەتی منیش لە وەرگرتنی ئەم کیسەیەدایە.

لە مزگەوت دادەنیشت، ژیانی یاران، ژیانی پەیامبەر، ئەو سادەیی، ئەو هەموو هەوڵە، ئەو هەموو کۆشش و ئەو هەموو پارسایی و گەورەییەی کە رابەرانی ئیسلام وشەخسی پێغەمبەر هەیان بوو، بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە، فەرموودەی پێغەمبەری دەگوتەوە. ئایەتی قورئانی دەخوێند، بەلام ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە ئەبوزەڕ بۆ خەڵکی شرۆڤە دەکرد.چونکە مینبەرەکانی معاویەو عوسمانیش قورئان یان فەرموودەیان شرۆڤە دەکرد.خەڵکی هەستیان دەکرد کە هەژاری ئەوان خواستی خودا نیە،بەڵکو خواستی معاویەکانە، وزیللەت و زەبوونیان خواست و مەشیەتی خوایی نیە،چونکە خواستی خودا لەسەر عیزەت وسەرفرازی ئینسانە. ئەگەر زەلیل و زەبوونن لەبەر ئەمەیە کە بە خۆیان زیللەت وزەبوونیان قەبوڵ کردووە.

پەیتا پەیتا دووبارەی دەکردەوە، لێکدا لێکدا فەرموودەی دەگوتەوەو پەیتا پەیتا روحی بنەڕەتی ئیسلام و پرەنسیپی بنەڕەتی ئیسلامی، کە یەکسانی، عەدالەت، پارسایی، زوهدو یەکتایی بوو لە جیهان، و یەکێتی بوو لە کۆمەڵگەو لە مێژوودا،بۆ خەڵکی لێکدەدایەوە. خەڵکی شام لە سەرەتاوە ئیسلامیان لە زمانی ئەبوسوفیانیەکانەوە بیست بوو. بۆ یەکەمجار بوو کە گوێیان لە ئیسلامی ئەبوزەڕی دەبوو. ئیدی شوێنەواری یاخی بوون و ناڕەزایی هەموو شامی گرتەوەو معاویە جوابی بۆ عوسمان نارد کە: ئەگەر پێویستت بە شامە ئەبوزەڕ لێرە لابە کە بە راستی بە دەستیەوە ماندووم، عوسمان فەرمانی دا کە سەری ئەم برینە مەکەوە، دەگەڵ خەڵکیدا هێمن بە، کارت بە کاریانەوە نەبێ، ئەبوزەڕ بە تاقی تەنیا سواری وشترێکی پالان دارین بکەو بە دوو کۆیلەی بیانیدا، کە لە ئەبوزەڕ نەگەن و نەیناسن، بۆ مەدینەی بنێرە، ودەستوور بدە لە شامەوە تا مەدینە لە هیچ شوێنێ لانەدەن و پشوونەدەن.

ئەبو زەڕیان بەو شێوەیە هێنا، گەییە نزیکی مەدینە، لە نزیکی کێوی سەلع*دا، عەلی و عوسمان و چەند کەسێکی دی *[* لە مێژوودا سەلع-ی پێ دەڵێن و مەدینەییەکان خۆیان سولع-ی پێ دەڵێن].*

دانیشتبوون. ئەبوزەڕ لە دوورەوە، لە رێی شامەوە گەیی، شەکەت، خوێناوی، رانەکانی بریندارو گوراو،بەلام لە دوورەوە کە چاوی بە عوسمان کەوت هاواری کرد: مژدەی شۆڕشێکی گەورە لە مەدینە بێ. ئەم شۆڕشەی کە ئەبوزەڕ نوقلانەی لێدا ، لە ساڵی سی و پێنج دا رووی دا. مەدینە شۆڕشی کردو عوسمانی سێ ساڵ دوای مەرگی ئەبوزەڕ لە ناو جێگاکەیدا کوشت*

*[* ئەبو زەڕ لە ساڵی سی و دوودا لە رەبەزە مرد].*

ئەبو زەڕ هاتە مەدینە، عوسمان دەستووری دا بوو کە هیچ کەسێك قسە دەگەڵ ئەبوزەڕدا نەکات و کەس فتوا لەو نەپرسێت.بەڵام فتواکانی ئەبوزەڕ پەیتا پەیتا دەردەچوو، و ئەمجارەیان عوسمان پێی گوت: کەی دەست لەم هەموو شۆڕش و یاخی بوون و نەحەوانەوەیەت هەڵدەگری و واز لە دژمنایەتی ئێمە دەهێنی؟ ئەبوزەڕ ئاماژەی بۆ ئەوکی خۆی کردو گوتی: تا تۆ کێرد بخەیتە سەر ئەوکم و من هەست بکەم هێشتا هەناسەیەکم لە سینەدا هەیە، ئەم دوا هەناسەیە بە گوتنی هەق دەڵدەکێشم، چونکە "پێشەنگ"ی من، پێشەنگی تیرەی ئێمە، پێشەنگی تیرەی بەشەر یەکەمجار بە منی گوت، ئەبوزەڕ هەق بڵێ، چەندە رەق و تاڵیش بێ، ولە گلەیی هیچ لۆمەکارێك مەترسە. ئەبوزەڕ لەسەری رۆیی: کاتێ من دەست بەرداردەبم کە ئەو سەروەت وسامانەی کۆت کردووەتەوەو خوێنی خەڵکییە بەسەر خەڵکیدا دابەش بکەی،من لە پێشەنگی خۆم، لە پەیامبەری خوام ژنەوتووە کە هیچ سەرمایەیەك کۆ نەکراوەتەوەو شەوێکی بەسەرا چووبێ و نەبێ یان نەبووبێ بە ئافەتی گیانی خاوەنەکەی.

بەڵام چۆن دەتوانرێ بە فەرمووده، بە ئایەت، بە قسە، بە هاواری ئەبوزەڕ، عوسمان و معاویەکان و عەبدورەحمانانی کوڕی عۆفەکان بهێنرێنەوە سەر رێگا؟ کاتێ کە پێغەمبەری ئیسلام چەکی سروش و وەحی لەدەستا بوو نەیتوانی. وئەمانە خودی سروش و وەحی، خودی قورئانیان کردووە بە ئەداتی روتکردنەوەو تالانکردنی خەڵکی.

ئەبوزەڕ دەیزانی کە ئەگەر بێدەنگ بێ، فریو وخاپاندن، چەوساندنەوەو زیللەتیش تێ دەپەڕێنرێن، بەسەر خەڵکیدا تێ دەپەرێنرێ، با لایەنی کەم من هاوار بکەم تا خەڵکی بزانن کە دووچاری چ چارەنووسێکن، تا بە لای کەمەوە ئەشرافیەت و زیللەت و بتپەرستی لە بەرگی جوان و نوێی یەکتایی و تەوحیدا بناسن. ئەوە بوو کە پەیامی خۆی ئەنجام دا. رۆژێ بیستی کە عەبدورەحمانی کوڕی عۆف، سەرۆکی ئەنجومەنی شورا، کە بە فێڵ عەلی کەنارخست و لە خەلافەتی مەحروم کردوعوسمانی بە جێنشین و خەلیفەی پێغەمبەر دانا– ئەم سەرۆکی ئەنجومەنی شورایە، کە عومەر هەڵی بژارد بوو وهەقی ڤیتۆی لە هەڵبژاردندا بەو دابوو،و گەورەترین هەقی بەسەر عوسمانەوە هەبوو– مردووەو سەروەتەکەی عەبدورەحمانی کوڕی عۆفیان بۆ مزگەوت هێناوە،و لەسەر یەك کەڵەکیان کردووە، ئەوەندە زۆر بووە کە دیوارێکی لە بەینی عوسمان و ئەو خەڵکەدا کە بۆ مزگەوت هاتبوون دروست کردبوو.وعوسمان لەسەر مینبەرەکەوە گوتویەتی خوا لە عەبدورەحمانی کوڕی عۆف خۆش بووە، چاك و پاك ژیا، کە مردووە ئەم هەموو سەروەت سامانەشی لە پاش خۆی بە جێهیشتووە، و کەعبول ئەحبار– ئەو روحانیە زەبوونەی کە ئەمڕۆ یەکێکە لە باشترین و نزیکترین فتواچیانی عوسمان و لە پاڵ تەختی خەلافەتی پێغەمبەردایە– گوتویەتی راست دەفەرمووی ئەی میری باوەڕداران. ئەبوزەڕ ئەمە دەژنەوێ. تەنیا، هیچ یاوەرێکی نیە. بیلال لە گۆشەیەکی شامدا بێدەنگ بووەو هیچ جۆرە رێیەك نابینێ. عەلی لە وەزع و حاڵێکی هێندە هەستیاردا دەژی کە هاوار وشۆڕشیش بۆ ئەوو بۆ ئیسلام بە هیچ کوێ ناگات. یاوەرانی دیکەش تاقمێ خۆی بە زێر فرۆشتووە، گروپێ بێ دەنگ بوون، ئیدی بێدەنگی مەسڵەحەت بێ یان حەقیقەت، و گروپێك رێی هەڵاتنیان لە تەنیایی دا

(دۆزیوەتەوە).بێ گوێدان بە چارەنووسی خەڵکی و ئیسلام، ڕێگەی خەڵکانی تریان بۆ وەدەست هێنانی بە هەشت، لە ڕێگەی ڕیازەت وعیبادەت و گۆشەنشینییەوە هەڵبژاردووە.

ئەبوزەڕ بە تەنیایەو دەبێ هاوار بکات. بە هەشتاو بەرەو کۆشکەکەی عوسمان دەڕوات، هیچ چەکێکی پێ نیە –حەقیقەتیان چەك کردووە– بەڵام لە ڕێگەدا لولاقی وشترێك دەبینێ، توڕەو هاڕوژاوە (ئەبوزەڕ لە ئاستی نە هەقدا توڕەیی ڕەهایە، ئەگەرچی لە هەنبەر هەقدا پارساو نەرم و دلۆڤان و میهرەبانە) لولاقە وشتر هەڵدەگرێت، بەلەز خۆی بە کۆشکە گەورەکەی عوسماندا دەکات و عوسمان وەستاوەو کەعبول ئەحبار لە پاڵیا، بێ چەندوچوون و بێ دوو دڵی هاوار دەکات ئەی عوسمان بۆ بەم پیاوەی کە ئەم هەموو سەروەت وسامانەی خەڵکەی کۆکردووەتەوەو عەمار کردووە، لە حاڵێکا کە خەڵکی برسین، دەڵێیت خوا جەزای خێری داوەتەوە، بەخشیوەیەتی؟ تۆ تەکلیفی خودا دیاری دەکەی؟

عوسمان دەڵێت: ئەبوزەڕ مەگەر وانیە هەر کەس زەکاتی خۆی دا، ئەگەر کۆشکێ دروست بکات خشتێکی لە زێڕو خشتێکی لە زیو بێ هیچ ئیعترازو گلەییەکی لەسەر نیە؟

ئەبوزەڕ دەڵێت ئەم ئایەتە توندە: ( *.... ئەو کەسانەی زێڕو زیو کۆدەکەنەوەو لە ڕای خودا بەختی ناکەن، تۆ لەو ئازارە بە ژانەی تووشی دێن ئاگاداریان کە. سورەتی تەوبە. ئایەتی ٣٤)*. بۆ ئەو کەسانە نیە کە زەکات و لە زەکاتیش زیاتریان دابێ.ئەمە هێرشە بۆ سەر ئەوانە.

کەعبول ئەحبار دەڵێت ئەمە تایبەتە بە ڕوحانیان و ڕەبەنانەوە، تایبەتە بە پیاوانی ئاین و دەوڵەت لە ئاینەکانی ترداو ئیسلام ناگرێتەوە، ومیری باوەڕداران ڕاستی گوت کە ئەگەر کەسێك زەکاتی خۆی دابێ بۆی هەیە هەر جۆری بوێ بژی و سەروەت کۆبکاتەوە. ئەبوزەڕ کەللەیی دەبێ، لولاقە وشترەکە هەڵدەگرێ و بەرەو کەعب هێرش دەبا.

– ئەی جولەکە زادە تۆ دەتەوێ دینی خۆمان فێر بکەی؟ کەعبول ئەحبار خۆی دەداتە پەنای عوسمان (وەکو ئاماژەم کرد ئەم سێینەیە (تثليث) هەمیشە هەیە، لێرەدا عەبدوڕەحمان ڕەمزی زێڕو عوسمان ڕەمزی زۆرو کەعبول ئەحبار ڕەمزی مەزهەبی کەچڕەوی کوفر ئامێزی تەزویرە، هەرسێکیان دوا بە دوای یەك. ولە بەرانبەردا ئەبوزەڕ، تەنیا، هێرشبەرو شۆڕشگێر). بەڵام پیاوێك کە پێشەنگ پێی گوتبوو کە "لە هەق مەترسە، بیڵێ، با تاڵیش بێ" سێ ودوو ناکات، پەلاماری دەدات، لە پشت عوسمانەوە لولاقە وشترەکە بە تەپڵی سەری کەعب دا دەکێشێت و خوێن بە بالآیدا دێتە خوارێ.عوسمان تەحەمولی نامێنێ، دەڵێت: ئەبوزەڕ شولت لێ هەڵکێشاوە، زۆرمان ئازار دەدەی، هەیدێ لە بەر چاوم گوبە، بڕۆو .ئەبوزەڕ دەڵێت: کەس بە ئەندازەی من لە دیداری تۆ بێزارنیە. بۆ کوێ بڕۆم، بۆ شام، بۆ حیجاز، بۆ....؟ ئەبوزەڕ چەند جێیەکی جیاواز پێشنیازدەکات، عوسمان ڕازی نابێ ودەڵێت بڕۆ بۆ ڕەبەزە، یان گەرما، تەنیایی، چۆڵەوانی ومەرگ، ئەبوزەڕ مل دەدا، مەروانی کوڕی حەکەم، کە کاتی خۆی پێغەمبەر دووری خستبووەوەو ئەمێستا وەزیری عوسمانە،دەکرێ بە ماموری بردنی ئەبوزەڕ بۆ تاراوگەی مەرگ، عەلی کە هەواڵەکە دەزانێ، هێندە دەگرێ کە ڕدێنی تەڕی تەڕ دەبێت، حەسەن، حسەین و عەقیل هەڵدەگرێ و دەچنە بەڕێکردنی ئەبوزەڕ. مەروان پێشگیری لێدەکات.عەلی توڕە دەبێت و بە

شـەلاق بەردەبێتـە ئەسپەکەی مـەروان، مـەروان کـە دەبـینێ عـەلی تورەیـە دەرەڤـێ و پـەنا وەبـەر ئاغای دەبات،عەلی، دەگەڵ حەسەن وحسەین و عەقیل دا، ئەبوزەر تا خودی رەبەزە بەرێ دەکات. لێـرەدا دەخـوازن لێکـدی هـەڵبڕێن، دەمـی ماڵاواییـە، ئـەبوزەر دەبـێ بـە تـاقی تـەنیا لـە رەبـەزەدا وەمێنێوعەلی و حەسەن وحسەین، خۆشەویستانی ئەوو نموونـە و سەرمەشقی ئەو، ئیمامـانی ئـەوو رابـەرانی ئـەوو رەمزونیشـانەێن دادو عەدالـەتی ئیسـلام، دەبـێ بـەجێی بێڵن، بزڤڕنـەوە. بـە نیگای فرمێسکاوی تا ئەو جێیەی کە چاوی لە بیاباندا هەتەر دەکات عەلیو حەسـەنو حسـەین بەرێ دەکات.عەلی لە کاتی ماڵاوایی دا دەڵێت: ئەبوزەر ئەوانە لەسەر ئەو شتە لێت دەترسـان کـە تۆ پێویستیت پێی نەبوو، و تۆ لەسەر ئەو شتە لێیـان دەترسـایت کـە باوەڕیـان پێـی نـەبوو، ئـەبو زەر لە هە قبێـژی مەترسـەو چاك بزانـە لـە رێگەیەکـەوە دەسـتت پێکـردەوە کـە رێگـەی خودایـە، و مـاڵاوایی دەکـات. عـەلی بـە فرزەندەکانیشـی دەڵێـت خوداحـافیزی لـە مامتـان بکـەن، حەسـەن و حسەین و عەقیل خودا حافیزی دەکەن ودەگەڕێنەوەو ئەبوزەر بە تـەنێ دەمێنێتـەوە، لەگـەڵ داکـی زەری هاوسـەریا،داکی زەر، لـە یـارانی پێغەمبـەرە، وکەسـێکە کـە لـە هـەموو دەردو رەنجـەکان ولـە ئەنجامدا لە هەموو شانازییەکانو لە بە ئەبوزەر بوونی ئەبوزەردا شـەریکە. ئـەبوزەر وداکـی زەر، کوڕەکەیو کچەکەی دەمێننەوە.مووچەو ماڤ لـە بـەیتول مـال بـڕاوە. ئـەبوزەر چـەند سـەرێك بزنـی هەیە کە خێزانەکەی تەنیا بەوە دەژین.

برسـیەتی زۆریـان بـۆ دێـنێ، دوای ماوەیـەك کیژەکـەی لـە برسـانا دەمرێـت. برسـێتی پـەلاماری کوڕەکەشـی دەدا، لێـرەدا ئـەبوزەر تیـا دەمـێنێ، کـە ئایـا لەسـەری نیـە هـەوڵێك بـۆ رزگـارکردنی کوڕەکـەی لـە مـردن بدات. ئـەم تیامـان ودوودڵییـە جارێکـی دی بـەرەو مەدینـەی دەنێـرێ، دێـت و دەچێتە لای عوسمان. دەڵێت عوسمان موچەکەمم کە بە نەهەق بڕیوەتە،موچەیەك کە پێغەمبەر بۆ منی بڕیوەتەوە، بدەنەوە چونکە پێویستم پێیەتی. عوسمان وەڵامی ناداتەوە، یەکێك لـە دەسـت و پێوەندانی عوسمان دڵی بـەم پیرەمێـرە کـە خۆشەویسـتی پێغەمبـەر بـوو، وئەمرۆکـە گـەردو تـۆزی بیابـانو برسـێتی نیشـتووەتە سـەر سیمای، دەسـووتێ، دەڵێـت، تـۆ پێـنج سـەد سـەر مەڕوچـەند خولامێك لە من بزانە.

ئەبوزەر بێ ئەوەی تێ روی تێ بکات بە تورەییەوە دەڵێت مەڕو خولامەکانت بۆ خۆت، من پێویسـتم بە تۆو بە ئاغات نیە. لێرەدا هەست دەکات کە ئەرکی ویژدانی خۆی دەرهەق بە مـەرگی کوڕەکـەی بە هەر حاڵ ئەنجام داوە، ئەگەرچی هیچ ئـەنجامێکی بـە دەسـت نـەهێناوە. بـە دەسـتی بـە تـاڵ بـۆ رەبەزە دەگەڕێتەوە،دەبینێ کە داکی زەر بە دیار کوڕەکەیەوە دەگری، کوڕەکەی مـردووە، ئـەبوزەر لێـرەدا ئـەوەی بیردێتـەوە کـە پێشـەنگ گوتبـووی ئـەبوزەر هـەر کەسـێك کـە دوو منـداڵی لـە رای خودادا لە دەست بدات وبە مەرگیان سابیرو شوکرانە بژێر بێ هەرگیز ئاگر نابینێ، مژدە بە داکی زەر دەدات کە من شتێکی وام لە "پێشەنگ" ژنەوتووەو ئێمە دوو جگەر گۆشـەمان لێـرەدا لـە رای خوا لە دەست داوەو سابیریش بووینو مژدەکەی پێغەمبەر رێك بۆ ئێمە بووە.داکی زەر سوکنایی دێـت. بـە دەسـتەکانی خـۆی گۆڕێـك لـە بیابـانی رەبـەزەدا هەڵدەکـەنێو جەسـتەی ساردەوەبووی کوڕەکـەی تـێ دەنێوبە دەستانی میهرەبانی بابێك دایدەپۆشێتو پاشـان روو دەکاتـە خـودا کـە

ئەی خودا ئەمە کوڕی منە، ئەو هەقێکی هەیە، تۆش هەقێکت لە ئەستۆی ئەوە، منیش کە بابی ئەوم هەقێکم لە ئەستۆی هەیە. ئەی خودا من وا لە هەقەکەی خۆم گەردنم ئازاکرد، تۆش لەو هەقەی کە لە ئەستۆی ئەوتدا هەیە خۆش بە، تۆش گەردنی ئازا بکە، چونکە تۆ لە من بەخشندەتری. هەنگێ تەنیا ئەبوزەڕ وداکی زەڕ دەمێننەوە، برسێتی هەمدیس پەلاماری ئەبوزەڕ دەدات، ئەبوزەڕ بانگی داکی زەڕ دەکات کە ڕابە با بچینە ئەم بیابانە بەڵکو بە بەری گیایان برسێتی ترسناکی خۆمان دامرکێنینەوە.بە دوو قۆڵی بەڕێ دەکەون، دنیا تۆف و وەیشومەیەو ئێژی دنیا لەم کارەساتە توڕەیە، هیچ شتێك پەیدا ناکەن، ئەبوزەڕ شنگ وتاقەتی لێ بڕاوەو خۆی بە پێوە ناگرێ. لە گەڕانەوەدا وەکو بازێك هەردوو باڵی شکا بێ، خۆی بەسەر بازووانی دایکی زەڕدا، ئەم هاوسەرە میهرەبانەیدا دەدا.داکی زەڕ دەگری. ئەبوزەڕ وەهۆش دێتەوە، دڵخۆشی دەداتەوە، دەڵێت ئەی داکی زەڕ، پێغەمبەری خودا گوتوویەتی یەکێك لە نێو ئێوەدا هەیە کە لە بیاباندا دەمرێت.جا ئێمە سێ کەس بووین،کە ئەو فەرموودەیەی فەرموو، دووەکەی دی هەردووکیان لە شاردا مردن کەواتە مەبەستی پێغەمبەر من بووە کە لە بیاباندا دەمرم. لێرەم دابنە، بچۆ سەر ئەو گردانە، لەوێندەرەوە تەمەشا بکە لەوەیە خەڵکانێك تێ بپەڕن داوایان لێ بکە کە من بنێژن و لە کفن کردنی منا کۆمەکت بکەن.داکی زەڕ بە نائومێدی دەڵێت ئەی ئەبوزەڕ ئێرە ڕێی کاروانانی حەجە، ئێستا وەرزی حەج نیە، ئیدی کەس لێرەوە هاتوچۆ ناکات، بەڵام ئەبوزەڕ ئەرخایەن و دڵنیا لەوەی کە کەسێك لەم سارایەدا هەر پەیدا دەبێ و لە مردنەکەیا ئامادە دەبێت، هەمدیس بە داکی زەڕ دەڵێت کە بڕۆ لەسەر گردەکانەوە چاو بگێڕە بۆ کەسێك کە بێتە یارمەتی تۆو کفن کردنی من. داکی زەڕ بە نا ئومێدی، بەڵام لەسەر داوای ئەبوزەڕ، بەگردەکانا هەڵدەگەڕا، لە دوورەوە سێ کەس وەکو داڵاش لە ئاسۆوە دەرکەوتن وادەهاتن. داکی زەڕ بە دەسماڵەکەی خۆی ئیشارەتیان بۆ دەکا وبانگیان دەکات، ئەوانیش بە پەلە دێن.

– چی قەوماوە، ئەی کە نیزی خودا؟

– برایان پیاوێك لێرە مردووە، هاوسەری منە، وەرن لە کفن ودفنەکەیدا یارمەتیم بدەن و ئەجری خۆتان لە خودا وەربگرن.

دەڵێن کێیە، دەڵێت ئەبوزەڕی یاری پێغەمبەرە، ئەمانە سێ یا چوار کەسی ئەنسار بوون و لە کار بەدەستانی دامودەزگای عوسمان بوون. بەلەز دێنە دیار ئەبوزەڕ، خۆشەویستەکەی پێغەمبەر. ئەبو زەڕ هێشتا روحی تیاماوە، روویان تێدەکات: هەر کەسێکتان لە دام ودەزگای عوسمانندان، سوپایین، قاسیدوتەتەرن، ماموری عوسمانن کفن ودفنم مەکەن و کارتان بە مردنی منەوە نەبێ، کێتان پارچە قوماشێکتان هەیە بماندەنێ بۆ کفنەکەم، چونکە ئەگەر من یا ژنەکەم پارچەیەکمان هەبوایە پێویستمان بە ئێوە نەدەبوو، بەڵام نیمانە، لاوێك کە گوایە مالیکی ئەشتەرە دەڵێت هاپۆ من پارچەیەکی دەستڕێسی دایکم هەیە، و ئەبوزەڕ دەڵێت تۆ بمنێژەو لە هەمان پارچەدا کفنم بکە. ماڵاوایی دەکەن، ئەبوزەڕ چاوەکانی لێك دەنێ، ئەم سیانە لە بیابانی خامۆشی ڕەبەزەدا دەینێژن و بە ڕیزەوە لەسەر گۆڕەکەی دەوەستن، لاوە ئەنسارییەکە دەڵێت ئەی ئەبوزەڕ تۆ نا هەقیت بینی و بێدەنگ نەبوویت و ئەوەندەت هاوارکرد تا گیانی خۆت لە پێناوی حەقیقەت و لە

رای خـوا بـەخت کـرد، ئـەی ئـەبوزەڕ دڵنیابـە کـە تـۆ پـەیامی ئیلاهـی خـۆت ئـەنجام داوەو بـەس، راسـتی گوتـووە پێغەمبـەری خـوا، بـە تـەنیا دەژیو سـبەینێ بـە تـەنیا زندوودەبێتـەوە: هـەم لـە رابوونی قیامەتدا، هەم لە رابوونی هەر سەردەمێکدا.

والسلام

## سەرچاوە

**دەفتەری یەکەم: ئەبو زەڕی غیفاری**

**دەقی ئەم دەفتەرە لەبەر چاپی پێنجەمی کتێبی ئەبوزەڕی غیفاری کە برای شەهیدمان بە دەستی خۆی راستی کردووەتەوەو هەڵەچنی کردووە، چاپ کراوەتەوە،و ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین یەکەمین چاپی راستکراوەیە.**

**لە ساڵی رابردوودا (١٣٥٦) ئەم کتیبە لە ئێراندا بەم ناونیشانەی خوارەوە: "پیاوێك لە رەبەزەوە" نووسینی "جودە السحار" وەرگێڕانی "محەمەد عەلی ئەسناعەشری" بە چاپ گەیەنراوە. کتێبی نێوبراو وتەی چاپی سێیەم، و پێشەکی چاپی دووەمو نزیکەی هەموو پێشەکی چاپی یەکەمی (جگە لە چەند دێڕێکی کەم) هەمووی لابردووە. گەلێك لە ناونیشانی پڕ مانای فەسڵەکانی کتێبەکە لابراوەو هەندێکیانی گۆڕیوە، ئەو هەڵە چاپیە گەورەو بچووکانەی کە لە چاپەکانی پێشوودا هەبوونە، لەم چاپەشدا ماون،و تەنانەت وەشانکار بە ئەندازەی پێویست بایەخی بە لیستی هەڵەنامەی چاپەکانی پێشووش نەداوە.**

**دەفتەری دووەم: جارێکی دی ئەبوزەڕ. ئەم دەفتەرە بریتییە لە دوو بەش:**

**بەشی یەکەم پێشەکییەکە بۆ شانۆنامەی (جارێکی دی، ئەبوزەڕ) کە لەلایەن حوسەینیەی ئیرشادەوە بە چاپ گەیەنراوەو پاشان– بە ئۆفسێت– لە ئێران و لە هەندەران چەندین چاپی لەبەر گیراوەتەوە. دەقی نێوبراو بەپێی توانا لە هەڵەی چاپی بژارکراوە، بەشی دووەم وتارێکی برای شەهیدمانە کە لە مانگی مۆردادی ساڵی ١٣٥١دا لە حوسەینیەی ئیرشادو بەر لە پێشکەشکردنی شانۆنامەی (جارێکی دی ئەبوزەڕ) پێشکەشی کردووە. لە وتەی سەرەتای ئەم کتێبەدا ئاماژەمان بۆ ئەو وەزعو حاڵە کردووە کە وتارەکەی تیا پێشکەش کراوە. دەقی ئەم وتارەمان بەپێی رەچاوکردنی پێوەرێن تایبەتی لە کاسێتانەوە دەرهێناوەو رێك خستووە،و ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین بۆ یەکەمجار بڵاودەبێتەوە.**

## پەراوێزو روونکردنەوەی وەشانکار

١- **قسەکەی پێغەمبەر بەمجۆرەیە:** "ان الرائد لايكذب اهله والله الذي الا اله الا هو اني رسول الله اليكم خاصة والى الناس عامة والله لتموتن كما تنامون ولتبعثن كما تستيقيظون و لتحاسبن بما تعملون ولتجزون بالاحسان احسانا و بالسوء سوءً وانها الجنة ابدا والنار ابدا"

٢- **ئایەتی ٤٩– ٥١ سورەتی بەنی ئیسرائیل (ئیسراء).** وقالو اذا كنا عظاما ورفاتا انا لمبعوثون خلقا جديدا قل كونوا حجارة او حديدا. او خلقا مما يكبر في صدوركم فسيقولون من يعيدنا قل الذي فطركم اول مرة فسينغضون اليك رؤوسهم ويقولون متى هو قل عسى ان يكون قريبا.

٣- **گێڕانەوەو چۆنیەتی گفتوگۆی نێوان ئەبوسوفیان و عەلی لە (الكامل)ی ابن ئەسیردا، لەگەڵ دەقی ئەم کتێبەدا کەمێك جیاوازی هەیە، ئیبن ئەسیر وتنی شیعرەکان دەداتە پاڵ ئەبوسوفیان، ودەقی کتێبەکەش– بە تایبەتی درێژەی گفتوگۆکەو دوا وەڵامی عەلی– زیاتر پشتیوانی گێڕانەوەکەی ئیبن ئەسیر دەکات. وەڵامەکەی عەلی لە نهج البلاغەدا هاتووە.. وا لە خوارەوە لە پێشا بەشێك لە گێڕانەوەکەی – ئیبن ئەسیر– نەقڵ دەکەین(أ)و پاشان دەقەکەی ناو** نهج البلاغة **(ب) دێنینەوە:**

أ– **"گوتراوە... ئەبوسوفیان هاتوگوتی: من گەردو غوبارێ دەبینم کە هەرگیز نانیشێتەوە مەگەر بە خوێن... ئەی زادەکانی عەبدمەناف (باپیری قورەیش) ئەبوبەکر لە نێو ئێوەدا، لە چاو ئێوەدا چ شوێن (و قەدرێکی) هەیە؟.. ئەوجا بە عەلی گوت: دەستی خۆتم بدەیە با سۆزو بەیعەت بە تۆ بدەم، بە خوا ئەگەر بخوازی هەر هەموو سوارەو پیادەکانی دەکەمە سەر (سەر ئەبوبەکر).عەلی رازی نەبوو. هەنگێ ئەم دوو بەیتە شیعرەی متەلەمیسی خوێندەوە:**

ولن يقيم على خسف يراد به  الا الاذلان عيرالحي والوتد
هذا على خسف مربوط برمته  وذا بشج فلا يبكي له احد

**عەلی بە روویا چووەوەو فەرمووی: "بە زاتی خوا تۆ بەم قسەیەت تەنیا فیتنەو ئاژاوەت دەوێ.تۆ زۆرت شەڕوفیتنە بۆ ئیسلام نایەوە، ئێمە پێویستمان بە ئامۆژگاری تۆ نیە*"**

***[* بڕوانە كامل، ئیبن ئەسیر، وەرگێڕانی عەباس خەلیلی، بەرگی دووەم، ل١٣– ١٤ ].***

**ب– وتەی عەلی:** (لما قبض رسول الله "صلى الله عليه وآله" و خاطبه العباس و ابو سفيان ابن حرب في ان يبايعا له بالخلافة).

"ايها الناس شقوا امواج الفتن بسفن النجاة و عرجوا عن طريق المنافرة وضعوا تيجان المفاخرة.

افلح من نهض بجناح، او استسلم فاراح ،هذا ماء آجن، ولقمة يغص بها اكلها، و مجتنى الثمرة لغير وقت ايناعها كالزارع بغير ارضه فان اقل يقولوا: حرص على الملك، وان اسكت يقولوا: جزع من الموت. هيهات بعد اللتيا واللتي! والله لابن ابيطالب آنس بالموت من الطفل بثدى امه. بل اندمجت على مكنون لو بحت به لا ضطربتم اضطراب الارشيه في الطوى البعيدة"

كلام.

**به كوردی:**

**(كاتێ كه پهیامبهری گهوره محهمهدی كوڕی عهبدوڵلا -درودی خوا له خۆیو لهماڵباتهكهی بێ،گیانی سپارد- عهباس و ئهبوسوفیانی كوڕی حهرب هاتنه دهف عهلی كوڕی ئهبی تالیب و ویستیان سۆزو بهیعهتی بدهنێ. حهزرهتی عهلی له رووی پهندوئامۆژگارییهوه ئهم وتارهی دا: "جهماوهری خهڵك، شهپۆلێن فیتنهو ئاژاوه به كهشتیانی نهجات ببڕنو رێگهی شهڕ بهر بدهنو تاجی خۆپهسندی لهسهر داكهنن.**

**سهركهوتوو رزگار كهسێكه دهگهڵ یارو یاوهردا رابێو یا تهسلیم بێت و له كێشماكێشی بێهوده دووره پهرێزی بكات.ئهم خهلافهته كاڵو نارهسه وهكو ئاوێكی نا سازگاره كه خهم و ئازاری به دواوهیه، و پارویهكی گهروگیرهو خواردنی ماندوو بوونو مهرگی به دواوهیه. ههره كهسێك میوهی كاڵ ونهگهییوو بچنێ، وهكو كشتكارێكه كه له زهوی كهسێكی تردا تۆو داچێنێو سهرهنجام زیان بدورێتهوه. ئاه، ئهگهر قسان دهكهم، دهڵێن كهڵكهڵهی فهرمانڕهوایی لهسهردایه، وئهگهر بێدهنگی لێبكهم له ههموو شوێنێ بلاوی دهكهنهوه كه له مهرگ دهترسێت وله داخانا دان به جهرگی خۆیدا دهنێ، ههیهات، كه راستی وحهقیقهت نه ئهمهیهو نه ئهوه! قهسهم به خوا كوڕی ئهبو تالیب، چهند منالێك رمووده‌و هۆگری مهمكی دایكیهتی، زیاتر هۆگری مهرگه، من رازێكم لهدڵدا پهنهانه گهر بیلێم، ئێوه وهكو گورێسێكی قرچۆك و سستو لهرزان كه له بیرێكی قوڵدا ئاوێزان بێ، شپرزهو پهرێشان دهبن".**

٤- **بڕوانه پهراوێزی ژماره (١٢)**

٥- = = = =

٦- ما اظلت الخضراء ولا اقلت الغبراء على ذي لهجة اصدق من ابي ذر الغفاري،محمد(ص)

**٧-معاویه ههمان بیانووی سهبارهت به زهرورهتی شكۆو رواڵهتسازیو خۆنوێنی بۆ عومهریش هێناوهتهوهو عومهری پێ بێدهنگ كردووه. ئیبن خهلدون ئهم بابهته بهم شهرحهی خوارهوه دهگوازێتهوهو به گوێرهی میتۆدورێبازی خۆی -كه بهرگری له هێزو دهسهلاته- تهئیدی دهكاتوله ههمان كاتدا لادان له ئهسڵ، تهنانهت له رۆژگاری عومهریشدا، بهباشی نیشان دهدات:**

**"كاتێ معاویه له شامهوه به ههیبهتو سامو شكۆو جلو بهرگی پاشایانهو به سوپای گهورهو گرانو بهسیجی فراوانهوه، هاتهوهو دیداری عومهری كوری خهتابی، رهزای خوای لێ بێ، كرد، عومهر ئهم وهزعو حاڵهی به ناپهسند ژماردو گوتی: ئهی معاویه، ئهوه چیه، چوویته سهر رێبازی كیسرایان؟ معاویه گوتی: ئهی میری باوهڕداران، من له مهرزێكدام، رووبهڕووی دژمنانمو ناچارین له باری تفاقی شهڕو جیهادهوه خۆمان له ئاستیاندا بنوێنین. عومهر بێدهنگ بوو و به خهتاباری نهزانی، چونكه له رێگهی مهبهستێن ههقودینهوه بهڵگهی بۆ هێنایهوه* وئهگهر**

مەبەستی [* ***هەڵبەتە مەبەستە ئیسلامیە عومەریەکان بە سەڵتەنەتی معاویەو (ویلایەتی ئەبوسوفیانی) دەشکێتەوە!*** ]

**تەرك كردنی پاشایەتی لە بنج و بناوانەوە بوایە، بەوجۆرە وەلامە دەربارەی پەیڕەوی لە كیسرایان و لاسایی كردنەوەیان قەناعەتی نەدەكرد، بەڵكو بە تەواوەتی لێی قەدەغە دەكرد.***

***[* مقدمه ابن خلدون: ترجمه به فارسی از پروین گنابادی، ج۱، ص ٤٠٠-٤٠١ ]***

**٨- بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١٢) بەشی ((١١))**

**٩- ئەو شوێنانەی كە ئەبوزەڕ پێشنیازی دەكات و قەبوڵ نەكردنیان لەلایەن عوسمانەوە مانای خۆی هەیە- ئەبوزەڕ پێشنیازی ئەم جێگایانە دەكات كە مەڵبەندی خەباتن و عوسمان كە لە هەستیاریی ئەم دەڤەرانە ئاگادارە، قەبوڵ ناكات. لە شاما معاویە حاكمە. لە بەسرە (عەبدوڵلای كوڕی عامر)ی خاڵۆزای عوسمان و لە میسر برای شیری ئەو (عەبدوڵلای كوڕی سەعدی كوڕی ئەبی سەرح) حوكمڕانی دەكات. (بڕوانە پەراوێزی ژمارە "١٢")**

**١٠- وتاری ژمارە (١٣٠) لە نهج البلاغەدا بەم جۆرەیە:**

(ومن كلام له عليه السلام لابي ذر رحمه الله لما اخرج الى الربذه).

"يا اباذر، انك غضبت لله فارج من غضبت له. ان القوم خافوك على دنيا هم و خفتهم على دينك، فاترك في ايديهم ماخافوك عليه، واهرب منهم بما خفتهم عليه، فما احوجهم الى ما منتعهم، وما اغناك عما منعوك!

وستعلم من الرابح غداً، والاكثر حسداً، ولو ان السموات والارضين كانتا على عبد رتقا ثم اتقى الله لجعل الله له منهما مخرجاً.

لا يونسنك الا الحق ولا يوحشنك الا الباطل، فلوقبلت دنيا هم لاحبوك، ولو قرضت منها لا منوك".

**بە كوردی:**

**"ئەی ئەبوزەڕ تۆ لە رای رەزامەندی خودا توڕە بوویت، كەواتە بە هومێدی لوتفی ئەو بە، ئەم جەماعەتە (واتە عوسمان و معاویەو ئومەویەكانی دی) ماڵێكی زۆریان لەم دنیایە بە دەست هێناوە، بۆیە لێت ترسان نەبا لەوە زیاتریان ریسوا بكەی، تۆش لەبەر ئەوەی نەبادا فریویان بخۆی و دین و ئیمانت لە دەست بدەی، بە گیانی خۆت دووری لە دۆستان و خزمان و تەحەمولی خراپی ئاوو هەوای ئەم دەڤەرەی كە بۆی دەچیت، كڕی. ئەوان زۆریان پێویست بەو شتانەیە كە تۆ لێت قەدەغە كردن، وتۆش یەكجار بێ دەربەستی لەو خۆشی و لەزەتانەی ژیان كە ئەوان لێیان قەدەغە كردووی! ئەمڕۆ دنیایەو سبەی قیامەت بە چاوی خۆت دەبینی كە كێ براوەیە، و كێ دۆڕاوو خەسارەتمەند؟! ئەگەر هەموو دەرگاكانی زەوی و ئاسمانان لە بەندەیەك دابخرێ، بەلام ئەو بەندەیە پارساودڵپاك بێ و ناشوكری نەكات، لە ئان و ساتدایە كە خودا دەرووی نەجاتی لێ بكاتەوە. بەڵێ لەم غوربەتخانەیەدا هیچ شتێك جگە لە هەق تۆ كەوی ناكات و جگە لە نە هەق و باتیل هیچ شتێك ناوترسێنێ. ئەگەر بە دنیایەكەی ئەوان رازی بوای بێ گومان خۆشیان دەویستی، و بەحاڵ دڵت پێوەی با ئازاریان نەدەدایت و هەقیان بەسەرتەوە نەدەبوو".**

١١- "عجبت لمن لا يوجد قوتا في بيته ولا يخرج على الناس شاهرا سيفه!" (سەیرم لەوانە دێ کە نان لە ماڵیاندا نیەو بە شمشێری رووتەوە لە خەڵکی دەرناپەڕن‌و راناپەڕن). دوو خاڵی فرە بایەخدارو قولْ لەم گوتەیەدا هەیە: یەکێکیان ئەمەیە کە ئەبوزەڕ ناڵێت: "برسی بۆی هەیە یان پێویستە راپەڕینی چەکدارانە بەرپا بکات، دەڵێت پێم سەیرە کە بۆچی راپەڕینی چەکدارانە بەرپا ناکات؟ دووەمیان ئەمەیە، ناڵێت لە داوودەزگا یان چینی حوکمڕان، یا چەوسێنەران، وسەرمایەداران راپەڕن!بەڵکو لە هەموو خەڵکی راپەڕن! چونکە ئەگەر من لە ماڵەکەما نانم نەبێ، هەموو خەڵکی بەرپرسن، بەرپرس لەچی، لە مردن، مردنی مسۆگەر! دۆستوفسکی قسەیەکی هەیە دەڵێت هەر کاتێ کە تاوانێك دەکرێ، ئەوانەی کە بێدەنگیشن دەستیان بەو تاوانە لەوتاوە. بەڵام جیاوازیی بایەخی ئەم دوو وتەیە خۆیایە". (بڕوانە بازگشت بە کدم خویش، از برادری شەهید –ص ٣٠٨).

١٢- داکێشانی ئیسلام بەلای راستداو لادان لە بنەما سەرەکیەکانی –کە بە کودەتای سەقیفە دەستی پێکرد– یان بە ئاگایی هەڵسوڕێنەران‌و سوودمەندەکانی ریزی یەکەمی کودەتاکە دەستی پێکرد. ئیبن خەلدون بە وردی ئەوە نیشان دەدات کە مەبەستی عومەر "تەرکی پاشایەتی لە بناغەوە نەبوو (بڕوانە پەراوێزی ژمارە حەوت)و معاویەش لە وەڵامێکی (محەمەدی کوڕی ئەبو بەکرا) کوڕی ئەبوبەکری خەلیفەی یەکەم، سەراپای مەسەلەکە روون دەکاتەوە، دەقی نامەکەی محەمەدی کوڕی ئەبوبەکرو وەڵامەکەی معاویە لە "مروج الذهب"ی مەسعودیدا بەم جۆرەی خوارەوەیە:

"کاتێ عەلی رەزای خوای لێ بێ، قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عەبادەی لە حوکمڕانی میسر لابرد، محەمەدی کوڕی ئەبوبەکری لە جێی ئەو نارد. کە محەمەد گەییە میسر نامەیەکی بەم نێوەڕۆکە بۆ معاویە نووسی:

"لە محەمەدی کوڕی ئەبوبەکرەوە بۆ معاویەی کوڕی سەخری گومڕا، خودا بە گەورەیی‌و توانای خۆی مەخلوقاتی ئەفراندو هێزی ئەو کەمی نەکردو هیچ پێویستییەکی بە ئەفراندنی مەخلوق نەبوو،لێ بۆ وەی دروست کردن کە عەبدایەتی‌و بەندایەتی بکەن‌و کردنی بە گومڕاو رێ بین‌و بەدبەخت‌و خۆشبەخت، هەنگێ لە رووی زانستەوە، لە نێو ئەواندا محەمەدی (د.خ) هەڵبژارد، کردی بە هەڵگری زانست و پەیامی خۆی‌و ئەمینداری سروش و وەحی خۆی‌و نێردراو ومژدە ئاوەرو ترس گەیەنەری خۆی، یەکەم کەس کە قەبوڵی کردو گوێڕایەڵی کردو ئیمانی هێناو باوەڕی کردو تەسلیم بوو وباوەڕی بە ئیسلام هێنا براوکوڕە مامەکەی، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو، کە باوەڕی بە غەیب هێناو ئەوی بەسەر هەمووانداا فەزڵداو بەگیانبازی خۆی ئەوی لە هەر مەترسییەك پاراست وبەگژ دژمنەکانیا چوو ودۆستایەتی دۆستەکانی کردو شەوو رۆژو لە ترس‌و لە برسیەتیدا دەستبەرداری گیانبازی نەبوو، بەمەش ماڤ لە پێش بوونی ئەو سەلما. لە نێو شوێنکەوتووانداا وێنەو هاوسەنگی نەبوو، کەچی دەبینم تۆ خۆتی بەسەرا دەنوێنی، بەڵام تۆ هەر ئەوەیت کە هەیت وئەو لە هەموو خەڵکی پاك نیازترو رۆڵەکانی لە هەمووان باشترو هاوسەرەکەی لە هەمووان خاسترو پس مامەکەی لە هەمووان باڵاترە. برایەکەی ئەوەیە کە رۆژی

موته گیانبازی کردو مامی ئەوەیە کە لە رۆژی ئوحدا پێشەوای شەهیدان بوو. بابی پارێزەری پێغەمبەری خودا (د.خ) بوو. بەڵام تۆ ،مەلعونی کوڕی مەلعونی، تۆو بابت هەمیشە کۆسپتان خستووەتە بەردەم پێغەمبەری خودا، وهەموو هەوڵێکتان ئەوە بوو کە نوری خودا خەفە بکەن. لەم رێگەیەدا دەستەبەندیتان کردو پارەو پولتان خەرج کردو خێڵەکانتان دژی ئەو هانداو باوکت لەسەر ئەم رێبازە مردو تۆ لەم کارەدا بووی بە جێنشینی ئەوو پاشماوەی حیزب و سەرانی رووبینیو ریاونیفاق کە کاری گەنیان کردووە پەنایان وەبەر تۆ هێناوە، ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەی ئەم قسەیەنو، گەواهی عەلی، کە فەزیڵەتی کۆنی ئەو خۆیایە، یاوەرەکانیەتی، لە موهاجیران و ئەنسار کە خودا بە فەزڵی خۆی یادی کردوونو ستایشی کردوونو پۆل پۆل دەگەڵ ئەودانو هەق لە پەیڕەوی کردنی ئەوداو رۆژە رەشیش لە دژایەتی ئەودا دەبینن. وا وەیلا بە حاڵی تۆ! چۆن خۆت دەکەی بە هاوسەنگی عەلی کە میراتگرو سەروەسێتی پەیامبەری خودایەو یەکەمین پەیڕەوی ئەو بووەو لە هەموو کەس نزیکتر بووە لێوەیو پەیامبەر رازی خۆی بەو گوتووەو لە کاری خۆی ئاگاداری کردووە. بەڵام تۆ دژمن و کوڕی دژمنی ئەوی. تا دەتوانی لەم دنیایەدا سوود لە نا هەقی خۆت وەربگرەو کوڕی عاص توی لە گمراییتا نقوم کردووە، وا دیارە مدەتی تۆ بەسەر چووەو فەندەڵ فێڵانت داویەتە کزی. هەنگێ بۆت بە دیاردەکەوێ کە سەرەنجامو ئاکامی بەرزوبڵند بۆ کێیە... چاك بزانە کە تۆ لەگەڵ خوادا کە لە زیکرو فیکری کەوتوویو لە رەحمەتی نائومێد بوویت، فێڵو فەندان دەکەی، ئەو لە بۆسەدایە بۆتو تۆ دەربارەی ئەو کەوتوویتە غروور! والسلام علی من اتبع الهدی".

ومعاویە وەڵامی دەداتەوە:

"لە معاویەی کوڕی سەخرەوە بۆ لۆمەکاری بابی خۆ محەمەدی کوڕی ئەبوبەکر، ئەو نامەیەتم پێ گەیی کە تیایا باسی مەزنیوتواناو سەڵتەنەتی خودات کە شایستەی ئەوەیەو هەڵبژادنی پەیامبەری خودات درودی خودا لە خۆیوماڵباتی بێ، کردبوو، لە قسەکانی ترتا کە مایەی لاوازیو بودەڵەیی تۆو تەوهینو بچووککرنەوەی باوکی تۆیە. باسی فەزیڵەتی کوڕی ئەبو تالیبو پێشینەی کۆن و خزمایەتی دەگەڵ پێغەمبەرو (د.خ) ئەوەی کە لە کاتی ترسو تەنگانەو خەتەردا گیانبازی دەرهەق کردووە، کردبوو، وئەم دەمەقاڵێو ئیرادگیرییەی دژی منت کردووە ئازایەتیو فەزڵی خەڵکانی دییە نەك ئازایەتی تۆ، ومن سوپاسی ئەو خودایە دەکەم کە ئەم فەزیلەت و باشارەی لە تۆ سەندووەتەوەو داویەتی بە غەیری تۆ. من وباوکت فەزیڵەتو هەقی کوڕەکەی ئەبو تالیب-مان بە پێویست وسەلماو دەزانیو کە خوداوەند وەعدی خۆی دەگەڵ پێغەمبەردا (د.خ) تەواو کردو بەڵگەو حوجەتی خۆی ئاشکرا کردو ئەوی (د.خ) بۆ لای خۆی بردەوە، بابی تۆو فاروقەکەی یەکەم کەس بوون کە هەقی ئەویان خواردو دژایەتیان کردو لەم کارەدا قسەی دڵ و دەمیان کرد بە یەك و داوایان لێکرد بەیعەتیان بداتێ. ئەو هەوەڵجار نەهاتە رەداو خۆی دەدزییەوە، ئیدی گوشاریان خستە سەرو نیازیان خراپ بوو، هەنگێ ئەو بەیعەتی داو تەسلیم بوو،بەڵام ئەوان لە هیچ کارێکدا بەشداریان نەکردو رازی خۆیان نەخستە بەر دەستی،و سێیەمیان واتە عوسمانیش رێچکەو رێبازورەوشو رەفتاری ئەوانی گرتەبەرو تۆو هاوڕێکەت

هێندەت لێ خوێندوعەیبتان گوت تا گوناحکارانی ویلایەتەکان تەماحیان تێ کردو ئەنگو دژی هەستان‌و دژمنایەتی کردنی ئەوتان ئاشکرا کرد تا بە ئارەزوو ئاواتی خۆتان گەیشتن. ئەی کوڕی ئەبوبەکر، ئاگات لە کاری خۆت بێ‌و پێ لە بەڕەی خۆت زیاتر ڕامەکێشە، تۆ ناتوانی بەرانبەر بە کەسێك بوەستی کە میناکی کێو چەسپیوەو لە هەنبەر هیچ ڕووداوێکدا تەسلیم نابێت، وکەس ناتوانێ بگاتە قولأیی ئە و، چونکە باوکت ڕێگەی ئەوی هەموارو تەخت کردووەو بناغەی حکومەت ودەسەلأتی ئەوی داناوە، ئەگەر ئەوەی ئێمە دەیکەین دروست بێ، باوکت ئەم حکومەتەی دامەزراندووەو ئێمە شەریکی ئەوین. ئەگەر بابی تۆ ئەمەی نەکرد بایە، ئێمە بە پێچەوانەی کوڕی ئەبو تالیبەوە نە دەڕویشتن و تەسلیم بەو دەبووین. بەلأم کە دیتمان بابی تۆ لە پێش ئێمەدا وای رەفتار لەگەڵ کرد، ئێمەش چاومان لەو کردو ڕێی ئەومان گرت، کەواتە تا حەزدەکەی عەیب لە بابی خۆت بگرە یا دەست لەم کارە هەڵگرە والسلام علی من اناب."

١٣- ناوی هەندێ لەو کەسانەی کە لە زەمانی عوسماندا‌و بە هۆی ئەوەوە دەوڵەمەند بوون،و لایەنێکی سەروەت‌و سامانەکانیان بەمجۆرەیە کە لە خوارەوە ئاماژەیان دەکرێتێ. هەندێ لەم کەسانە لە کاری حکومەتایەتیشدا دەسەلأت‌ودەستی تەواویان هەبووە. جا پێش ئەوەی بێینە سەر ناوی کەسەکان، جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەم خاڵە بکرێ کە عەرەب، بەر لە ئیسلام‌و لە سەردەمی ئیسلامیشدا بە دینارودرهەم سەواو مامەڵەیان دەکرد. دینار لە زێڕودرهەم لە زیو بوو. کێشی دیناری زێڕ نزیکەی ٤,٥٥ گرام بوو (و پاش ماوەیەکی کەم بوو بە ٤,٢٥ گرام. و هەندێ جاریش بەهای دینارێك لە دە درهەم تێ دەپەڕی‌و دەگەییە سیازدەو پازدە درهەم.*

*[* جرجی زیدان، تاریخ تمدن اسلامی، ج١ ص١٠١].*

ئەگەر بەهای دراووپارە لە قۆناغی عوسماندا بە ئەندازەی بەهای پارەودراو لە سەرەتاکانی سەدەی سێیەمدا بگرین، بەپێی ئەو لیستی حیسابەی جەعفەری کوڕی قودامە کە تایبەتە بە باجی ساڵی ٢٢٥ کۆچی، نرخی هەر شەش تۆن گەنم‌و جۆی تێکەڵ(قارشوغ) سی دینار بووەو بەم پێیە نرخی هەر دوو سەد کیلۆ گەنم بەرانبەر بە یەك دینار بووە.*

*[* تاریخ تمدن اسلامی، ج٢، ص ٢٤٦ و ٢٨٢.]*

بە گوێرەی ئەم نرخەو بەو پێیەی کە هەر دینارێك دەبێ بەرانبەر بە پازدە درهەم دابنرێ، دەتوانرێ رادەی سەروەت‌وسامانی هەندێ لە ئەندامانی تاقمەکەی عوسمان‌و خودی عوسمان بدۆزرێتەوەودەربهێنرێ‌و لە هەمان کاتدا ئەو زانیاری‌و ژمارانە دەگەڵ ئەم دوو خاڵەشدا بەراورد بکرێ کە:

"پێغەمبەر بەر لە نەخۆشییەکەی پارەیەکی کەمی هەبوو وکە نەخۆش کەوت بۆ عەلی نارد تا بە هەژارانی بدات،و ئەم ماڵە لە قسان حەوت یان شەش دینار بووە."*

*[* زرین کوب، بامداد اسلام، ص٥١، لە السیرە الحلبیە، ٣/٣٩٠ وەرگیراوە.]*

"هەندێ جار ڕێك دەکەوت کە عەلی جگە لە شرە خاولییەك هیچی لە بەرا نەبوو،و زۆرجار لە زستانا لەسەرما هەڵدەلەرزی... جارێك شمشێرەکەی خۆی بۆ بازار بردو فرۆشتی ولەم بارەیەوە

گوتوویەتی کە ئەگەر چوار درهەمم هەبووایە کە پەشتەماڵێك(پۆشاکێك) بکڕم ئەم شمشێرەم نەدەفرۆشت."*

*[* بامداد اسلام، ص١١١ ].*

**ئەمەش هەندێ لە ئەندامانی گروپەکەی عوسمان:**

**یەك: مەروانی کوڕی حەکەم:**

مەروان شیرەتکارو هەمەکارەی عوسمان بوو. کاتی (ارمینه) فەتح کرا، عوسمان پێنج یەکەکەی وەرگرتو بە مەروانی بەخشی.جگە لەوەش (فدك)ی کە میراتی فاتیمە بوووئەبوبەکر وەری گرتبوو،دا بە مەروانو پاش ئەوەش سەد هەزار درهەمی پێدا. کاتێ کە پێنج یەکی ئەفریقا بۆ مەدینە نێردرا، مەروان بە پێنج سەد هەزار دینار کڕی. بەڵام عوسمان ئەم مەبلەغەشی پێ بەخشی.*

*[* جرادق، جرج، امام علی (ع) صوت عدالت انسانیت، ترجمەء فارسی، ج٥ "علیو حوادث عصر خود" ص ١٤٦-١٤٧و ج٤، ص٢٤٨ . قرشی، مهدی: خلفاء درپیشگاه عدالت، ترجمەء فارسی، ص٢٢١*

**دوو: حەکەمی کوڕی عاص:**

ئەم کابرایە لە دژمنانی ئیسلامو لەو کەسانە بوو کە پێغەمبەر لە خۆیی دوور خستبووەوە. عوسمان هێنایەوە بۆ مەدینە، کاتێ هاتە لای عوسمان جلێکی شڕو دڕاوی لەبەر بوو،وکە هاتە دەرەوە جبەی خەزوگرانبەهای لەبەر کرد بووعوسمان سەد هەزار درهەمیشی پێ بەخشی بوو.*

*[* خلفاء درپیشگاه عدالت (لە مێژوو یەعقوبی)یەوە ص٢٢٣-٢٢٤ وەرگیراوە ].*

**سێ: ( حارث )ی کوڕی حەکەم:**

عوسمان بازارەکەی مەدینەی،کە پێغەمبەر وەقفی دەستکورتو هەژارانی کردبوو، بە حارسی کوری حەکەم بەخشیو لەو وشترانەشی کە بەزەکات بۆ مەدینە نێردرا بوون پێدا. کاتێ کە کچەکەی عوسمانی خواست، خەزوری زێدەباری ئەوەی کە پێشتر پێی دابوو، سەد هەزار درهەمی دیکەشی پێ بەخشیو کۆکردنەوەی سەدەقە (قضاعة)شی بەو سپارد کە دەرامەتی لەم ڕێگەیەوە دەگەییە سێ ملیۆن درهەم.*

*[* جرداق: علی (ع)، ج٥، ص١٤٥، خلفا درپیشگاه عدالت، ص٢٢٣ و جرداق، ج٤ ص٢٤٧ . ].*

**چوارەم: ئەبو سوفیان:**

لە هەمان ڕۆژا کە عوسمان سەد هەزار درهەمی بە مەرواندا، سەد هەزار درهەمیشی بە ئەبو سوفیان بەخشی *

*[* جرداق. ج٥ ص١٤٧ ]*

**پێنجەم: بەنی ئومەیە:**

عوسمان پاوان و لەوەڕگەکانی دەوروبەری مەدینەی، کە پێغەمبەر بۆ لەوەڕی وڵساتی موسوڵمانانی تەرخان کردبوو، قۆرخ کردو وەقفی حەیواناتی بەنی ئومەیەی کردو هەروەها ئەو ماڵە فرەیەی، کە لە عێراقەوە بۆ مەدینە نێردرا بوو، بەسەر بەنی ئومەیەدا دابەش کرد.*)

*[* جرداق، ج٥، ص١٤٥ و ١٤٦.]*

**شەشەم: عەبدوڵڵای کوڕی خالید:**

عەبدوڵڵای کوڕی خالیدی کوڕی اسید ئەمەوی داوای یارمەتی لە عوسمان کردوعوسمان چوار سەد هەزار درهەمی وێدا.*

*[* خلیلی، محمد علی، زندگانی علی (ع)، ص١٥٨-کامل ابن اثیر، ترجمە فارسی، ج٣، ص١٤٨.}*

**حەوتەم: عەبدوڵڵای کوڕی سەرح:**

ئەمە برای شیری عوسمان و فەرمانداری میسر بوو. عوسمان دەستکەوتە جەنگییەکانی هەموو ئەفریقای، لە میسرەوە تا تەنجە کە موڵکی موسوڵمانان بوو، هەموو خستە بەردەستی عەبدوڵڵای کوڕی سەرح. ئەم پیاوە بەر لەوەی بێتە سەر دینی ئیسلام، یەکێك بوو لە سەرانی کافران و جارێکیش لە دوای ئیسلام بوون هەڵگەڕایەوەو...*

*[* کامل ابن اثیر، ج٢، ص١٤٣ و خلفاء، ص٢١٩.]*

**هەشتەم: سەعدی کوڕی ئەبیل عاس:**

عوسمان سەد هەزار درهەمی پێ بەخشی*.

*[* خلفاء درپیشگاه عدالت، ص٢٢٠.]*

**نۆیەم: تەڵحە:**

تەڵحە دوو هەزار دیناری زێڕو پەنجا هەزار درهەمی زیو قەرزدار بوو کە عوسمان لە بەتیول مال بۆی دایەوە! ئەم پیاوە لە کوفەدا کۆشکێکی دروست کرد کە دوای سێ سەد ساڵ بە گوتەی مەسعودی لە مروج الذهبدا بە ناوی (دار الطلحتین) بە ناوبانگ بووە.

دەرامەتی کشتکاری تەڵحە تەنیا لە دەڤەری (کناس)ی عێراق رۆژی هەزار دینار بووە.. بە گوتەی مەسعودی لە دەڤەری (سراە) بە زیاتر لەمە باس کراوە. لە مەدینەشدا خانوویەکی میناکی خانووەکەی عوسمانی هەبووە کە لە گەچ وخشت و داری ساج* دروستی کردبوو.**

*[* ساج درەختێکی گەورەیە کە لە هند دەڕوێت، دارەکەی ڕەش وقایمە، و لە ناو خاکدا ناڕزێ].*

*[** جرداق، ج ٥ ص١٤٦، ابن خلدون، مقدمە، ترجمە فارسی، ج١ ص٤٠٣، خلفاء... ص٢٢٩].*

**دەیەم: زوبیر:**

عوسمان شەش هەزار دیناری زێڕی دایە زوبێر، ئەویش بەو پارەیە خانووی دروستکردو بە کرێی دا پانزە خانوو لە مەدینە، دوو خانوو لە بەسرەو یەك خانوو لە کوفەو یەك خانووی لە میسر هەبوو. بە گوتەی مەسعودی، زوبێر لە سەردەمی عوسماندا هەزار کۆیلەو هەزار کەنیزو

قەرەواشی هەبوو و بە های میراتی ومەتروکاتەکەی پەنجا هەزار دینار بوو، و زێدەباری ئەمانەش پاش مردنی هەزار دانە ئەسپی لە پاش خۆی بە جیٚ هێشت*

*[* جرداق، ج ٥، ص١٤٧ – ابن خلدون، ترجمه فارسی، ج١، ص٤٠٣ – خلفاء.... ص ٢٢٩ ].*

**یازدەیەم: عەبدورەحمانی کوڕی عوف:**

عەبدورەحمانی کوڕی عۆف خانووانی گەورەی هەبوو، لە هەر تەویلەیەکدا سەد ئەسپی دابەستەی هەبوو. کۆی ئەسپی نێو تەویلەکانی هەزار ئەسپ و هەزار وشترو دەیان هەزار پەز بوو، سەروەت وسامانی نەختیشی سیٚ میلیۆن دینار دەبوو*

*[* جرداق، ج٥، ص ١٤٧ – ابن خلدون، ترجمه فارسی، ج ١، ص٤٠٣ ].*

**دوازدەیەم: زەیدی کوڕی سابت:**

زەید لە دوای مردنی ئەوەندەی قاڵبە زێڕو زیو لە پاش بەجیٚ مابوو کە بە گوتەی مەسعودی بە تەور دەیان شکان، هەروەها سامان وباخاتێکی فرەی هەبوو. بەهای موڵك وماڵەکانی دەگەییە سەد هەزار دیناروسەد هەزار دیناریش پوڵی نەختی لە پاش بە جێما*

*[* جرداق، ج٥، ص١٤٧ – ابن خلدون ، ج ١، ص٤٠٣ – خلفاء... ص ٢٢٩ ].*

**سێزدەیەم: یعلا بن منبه:**

کە مرد بایی پێنج سەد هەزار دینار سەروەتی هەبوو و پارەیەکی زۆریشی لەسەر هەژاران بوو، زەویوزارێکی فراوانی کشتوکاڵیشی لە دوای خۆی بە جێهێشت*

*[* ابن خلدون، ج١، ص٤٠٣ – جرداق، ج٥، ص ١٤٧ ].*

**چواردەیەم: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس:**

خانوویەکی لە عەقیق دروست کرد، میچێکی بەرزی هەبوو، فەزایەکی گەورەی بۆ تەرخانکردو لە سەریەوە کۆنگرەی دروست کرد*

*[* ابن خلدون، ج١ ص ٤٠٤ ].*

١٤- پاش کوشتنی عوسمان بەمجۆرە باسی دارایی ئەویان کردووە: سەدو پەنجا هەزار دیناری زێڕو یەك ملیۆن درهەمی زیوی لەلای عەمارداره تایبەتیەکەی بوو. بەهای موڵکەکانی لە "حنین" (نێوان مەککەو تایف)و "وادی القری" (نزیکی مەدینە)و شوێنانی دی دوو سەد هەزار دینار بوو، زێدەباری ئەوانەش هەزار وشترو ئەسپێکی زۆری بەجێهێشت، جەواهێرات و زێڕو زیوو خشڵی بەیتول مال بە سینگ وبەرۆکی کچەکانی عوسمانەوە بوو. وەختیٚ خەڵکی کەوتنە ئیعتراز

و رەخنە لەم رەفتارە، عوسمان تووڕە بوو ولەسەر مینبەر گوتی ئێمە پێویستییەکانی خۆمان لە بەیتول مال هەڵدەگرین، با خەڵکانێکیش ناڕەحەت بن ولوتیان بە عاردی بکەوێ.
عوسمان لە مەدینەدا خانوویەکی گەورەی دروستکرد کە دەرگاکانی لە داری عەرعەروساج بوو*
*[* ابن خلدون، ج١ – جرداق، ج٥، ص١٦٢ و١٦٣ – خلفاء... ص٢٣٠ ].*

لە ٢٠٠٩/٩/١٥ لە شاری سلێمانی لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بوومەوە.

حەمە کەریم عارف

## حەمە کەریم عارف

* کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) رۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٣/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

* جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و رێکخراوێکی سیاسی نەبووە، لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.

- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩
٢- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧
٣- بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێران چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ
٧- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥
٨- نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایە،سلێمانی
٩- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧
١٠-شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راە کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێران.
١١- هاوماڵەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گوڵان
١٢ – بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦
١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق
١٤- دوورە وڵات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گوڵان
١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨
١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥
١٨- ئەو رۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦
١٩- جێ پێ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك
٢٠- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی

٢١- چیرۆکستان ،کۆمەڵێك دەق ورەخنەی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك

٢٢-دیدارو دەق و رەخنە،چ٢٠٠٥،١

٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ٢٠٠٥،١

٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی کەرکوك

٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨١،١

٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤

٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦

٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی چوارەم ٢٠٠٧

٣١ -کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨

٣٢- چینی کۆن، چ١(       )دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی

٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر

٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)

٣٧- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.

٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ

٣٩- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.

٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)

٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بڵاوەخانەی سایە، سلێمانی

٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵڵائەلبوسێری..

---

٤٣- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.

٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای

٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان

٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)

٤٧- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

٤٨- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨

٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر

٥٠- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ١،دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

٥١- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی - کوردی) حەمە کەریم عارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی

٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

٥٣- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس

٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.

٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.

٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی

٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست

٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی

٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی

٦٠- خافروغ لە شیعر دەدویّ، ژیان و بەرهەمی

٦١- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان

٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٥- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٦- ریالیزمودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ٢٠٠٤،١،دەزگای سپیرێز

٦٧- قوتابخانــه ئەدەبییــەکان،رەزا ســەید حســەینی، چ٢٠٠٦،١دەزگــای موکریانی
٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی
٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦
٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی
٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦
٧٢- ڕێبازە هونەرییەکانی جیهان
٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦
٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ٢٠٠٧،١
٧٥- دەربارەی رۆمان‌و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨
٧٦- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدبی-رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك
٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩
٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()
٧٩- پەڵکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤
٨٠- خیانەتی حەڵاڵ، حەمە کەریم عارف
٨١-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی
٨٢-ئەبوزەر، سەربورنامە، د.عەلی شەریعەتی
* لـە راپەڕینــەوە تـا نهـوو چـالاکانە بەشـداری بزاڤـی ئـەدەبی و رۆشـنبیریی کـوردی دەکـات وبەرهـەمی هەمـە جـۆر (نووسـین و ئامـادە کـردن و وەرگێـڕان) بڵاودەکاتەوە..
* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هـەر کـەس و گـروپ و لایـەن و دەزگایـەك تـەماحی بـڵاو کردنـەوەی هـەبن، دەبـێ پـرس بـە نووسەر بکات...